# چیرۆکی

# ئادابە ئیسلامییەکان

نوسین و وەرگێرانی:

دەستەیەك لە مامۆستایان

پێداچونەوە و سەرپەرشتی:

ناصح محمد موبڕەیی

چاپی یەکەم

1432 2011

پرۆژەی هیوا بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
١٥

# چیرۆکی ئادابە ئیسلامییەکان

نوسینی:
دەستەیەک لە مامۆستایان

وەرگێڕانی:
دەستەیەک لە مامۆستایان

سەرپەرشتی و پێداچوونەوەی:
ناصح محمد شارباژێری

چاپی دووەم

١٤٣٢ ٢٠١١

بسم الله الرحمن الرحیم

ناوی كتێب: چیرۆكی ئادابە ئیسلامییەكان
نوسینی: دەستەیەك لە مامۆستایان
وەرگێڕانی: دەستەیەك لە مامۆستایان
سەرپەرشتی و پێداچونەوەی: م. ناصح محمد شارباژێری
تایپ: نەژاد و بورهان
شوێنی چاپ: چاپ و تەجلیدی ڕێ نوێ
دیزاین: أحمد عبدالله
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ١٤٧٣ ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە
نۆبەتی چاپ: دووەم

# پێشەکی:

الحمد لله رب العالمین و الصلاة و السلام علی حبیب رب العالمین محمد و علی آله و صحبه أجمعین.

سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەین، پرۆژەی (هیوا) بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە ئەمجارە لە هەنگاوێکی نوێدا بەرهەمێکی تر پێشکەش دۆستانی دەکات.

کە ئەم بەرهەمەی بەردەست تۆی خوێنەری بەڕێزە.

شێوازی تازەی ئەم پەڕاوە بە کوردی کراوە ئەوەیە کە لە بەرامبەردا دەقە عەرەبییەکەش هەیە و هەر لاپەڕەیەك سەربەخۆیە و پەیوەندی بە لاپەڕەکەی ترەوە نییە، مەبەست لە دانانەوەی دەقە عەرەبییەکە بۆ ئەوەیە کە خوێنەر بە تایبەت فێرخوازان زیاتر سوودمەند بن و بۆ فێربوونی زوبانی عەرەبی و خوێندنەوەی عەرەبی لێی بەهرەمەند بن.

کەواتە دەتوانین بڵێین کە ئەم کتێبەی بەردەستی تۆی خوێنەر لەگەڵ سوودمەند بوون لە کورتە چیرۆك و بەسەرهاتەکان و ئاشنابوون بە ئادابە ئیسلامی یەکان. لە هەمان کاتدا هەنگاوێکە بۆ فێربوونی زوبانی عەرەبی، بۆیە لە وەرگێڕانەکەدا هەوڵمان داوە دەقەکە زۆر تێك نەدەین تا خوێنەر بتوانێت بەراوردی عەرەبیەکەی بکات و لە وشە و رستە عەرەبییەکەش سوود وەربگرێت.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هەموو کارێکی مرۆڤ جێگەی سەرنج و تێبینییە و ئەوەش کار نەکات هەڵەش ناکات، ئێمەش مەبەستمان خزمەتکردنە بە تۆی بەڕێز. چاوەڕێی دوعای خێری ئێوەین.

زۆر سوپاس و پێزانینمان ئاراستەی ئەو مامۆستاو برا و خەمخۆر و دڵسۆزانە دەکەین کە هاوکارمان بوون و بەشدارییان لە وەرگێڕانی ئەم

زنجیرە ئادابەدا کرد، خوای گەورە بەرەکەت بخاتە خامە و تەمەنیان و ئەم کارەشیان توێشوی چاکەی دواڕۆژیان بێت.

سوپاسی هەموو ئەو برا بەڕێزانە دەکەین کە لە بەپایان گەیاندنی ئەم کتێبە بەشدارییان کردووە بەتایبەت کاک ئەحمەد و کاک نەژاد.

لە خوا دەخوازین گیانی کاکە هیوای لاویش ئاسودە بێت و لە بەهەشتی نەبڕاوەدا ئارام بێت و ئەم پڕۆژە جوانەی بەردەوام بێت.

والسلام عليكم

م. ناصح محمد شارباژێری

# ئاداب
# لەگەڵ خوای گەورەدا

نوسینی: عبد العزیز سید هاشم

وەرگێڕانی: زانا کریم

# مشيئة الله

جَاءَ رجلٌ إلى رسُولِ الله ﷺ يُكلِّمُهُ فِي بعضِ أُمورِهِ، ثُمَّ قَالَ الرَّجلُ لِلرَّسُولِ ﷺ: مَا شَاءَ اللهُ وَشئتَ.

فَغضبَ الرَّسُولُ ﷺ مِنْ كَلمةِ الرَّجُلِ، وَبيَّنَ لَهُ أنَّ المَشيْئةَ لاَ تَكُونُ إلاَّ لله وَحْدَهُ، فَقالَ لَهُ: «أَجَعَلْتَنِي للهِ عَدْلاً (مُسَاوِياً ومُعَادِلاً)؟! بَلْ شاءَ اللهُ وَحْدَهُ» [البيهقي].

فَالمُسْلِمُ يُقرُّ للهِ عزَّ وجلَّ بأَنَّهُ الإلَهُ الوَاحِدُ الأَحَدُ؛ لِذلَكَ فهُوَ يُنزِّهُهُ ـ سُبحانَهُ ـ عَنْ كُلِّ شَرِيْكٍ، وَيَتَحَرَّى التَّوحِيْدَ حتَّى فِي أَدقِّ كَلاَمِهِ؛ لأَنَّ الشِّرْكَ رُبمَّا تَسلَّلَ إِلَى الإِنسَانِ مِنْ حيثُ لاَ يَدْرِيْ، بِكَلِمَةٍ أَو عَمَلٍ صَغيرٍ.

---

عَلَى المسلمِ أَنْ يُوقِنَ بأَنَّهُ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، فَلاَ رَازِقَ وَلاَ مُحْيِيْ وَلاَ مُمِيْتَ وَلاَ مُعزَّ وَلاَ مُذلَّ وَلاَ قَادرِ إِلاَّ هُوَ سُبْحانَهُ وَتَعالَى.

# ویستی خوا

جارێک پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و دەربارەی هەندێ شت قسەی لەگەڵدا کرد، پاشان پیاوەکە (دەربارەی کارێک) بە پێغەمبەری ﷺ ووت: ئەگەر خواو تۆ بیانەوێت!!

پێغەمبەر ﷺ بە قسەکەی تورە بوو، پاشان بۆی ڕوون کردەوە کە خاوەنی ویستەکان تەنها خوایەو بەس (کە هەرکاتێک ویستی لەسەر شتێ هەبوو هەر دەبێتو ئەگەر ویستیشی لەسەر شتێ نەبوو ئەوە هەرگیز نابێت)، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا تۆ دەتەوێت من بکەیتە هاوەڵی خواو وەک ئەو دامبنێیت؟! (وامەڵێ) بەڵکو هەموو کات بڵێ ئەگەر خوا خۆی ویستی لەسەر بێ. ((البیهیقی)).

مرۆڤی موسوڵمان بە تەواوی دان ئەنێت بەوەدا کە پەرستراوی تاکو تەنها بەس خوایە، هەر لەبەر ئەم باوەڕەشیەتی کە هەموو کات خوداوەند بە پاکو بێگەرد دادەنێتو تەنانەت لە وتەکانیشیدا کەسێکی تر ناکاتە هاوەڵی، لە قسەکانیشدا یەکتاپەرستە، چونکە هەندێ جار (شیرک) لە شوێنێکەوە تووشی مرۆڤ دەبێت کە نازانێت، بەهۆی وشەیەک یان کارێکی بچوک.

---

پێویستە مرۆڤی موسوڵمان باوەڕێکی بتەوی هەبێت بەوەی کە پەرستراوی تاکو تەنها هەرخوایەو، ڕۆزیدەرو ژێنەرو مرێنەرو سەرخەرو بن خەرو دەسەڵاتداری بێسنور تەنها خودای پاکو بێگەردە.

# فَأَيْنَ اللهُ؟!

خَرَجَ عبدُ اللهِ بنُ عُمرَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ وَمعهُ بعضُ أصحابِهِ في ناحيةٍ منْ نَواحِي المدينةِ، فَاشتَدَّ عَليهِمُ الحرُّ؛ فَجلَسُوا يَأكُلُونَ، فمر بِهِم رَاعِي غَنَمٍ، فَألقَى عَليهِمُ السَّلامَ. فَناداهُ ابنُ عُمَرَ ليَأكُلَ، فَقالَ الرَّاعِي: إنِّي صَائِمٌ، فَتَعَجَّبَ ابنُ عُمَرَ وَسَألَهُ عَنْ سرِ صِيامه فِي هَذَا اليَومِ الحَارِّ، فَأخبرَهُ الغُلامُ أنَّهُ يَتَزَوَّدُ منَ الدُّنيَا بالعَمَلِ الصَّالحِ الَّذِي يَنفَعُهُ فِي الآخِرَةِ. فَعَرَضَ عليهِ ابنُ عُمَرَ أنْ يَشتَرِيَ منْهُ شاةً وَاحدةً.

فَقالَ الرَّاعِي: إنَّهَا غَنَمُ سيِّدِي. فَقالَ ابنُ عُمَرَ مُختَبِراً: إنْ سَألَكَ عَنْهَا فَقُلْ لَهُ: أكَلَهَا الذِّئبُ.

فَتَركَهُ الرَّاعِي وهُوَ يَقُولُ: فَأينَ اللهُ؟ تَأثَّرَ ابنُ عُمَرَ بِكَلامِ الرَّاعِي، فَأخذَ يَبكِي وَيقُولُ: فَأينَ اللهُ؟

ثُمَّ قَدِمَ ابنُ عُمَرَ المدِينةَ فَأرْسَلَ إلى سيِّدِ الرَّاعِي، وَاشتَرَى منْهُ الغَنَمَ والرَّاعِي، ثُمَّ أعتَقَ الرَّاعِي، وَوَهَبَ لهُ الغَنَمَ.[البيهقي].

---

المؤمنُ يُراقبُ اللهَ على الدَّوامِ، ويَتذكَّرُ قولَ اللهِ تَعالَى: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ [الحديد: ٤].

# ئەی خوا لە کوێیە؟!

ڕۆژێک عبداللە کوڕی عومەر ﷺ لەگەڵ هەندی لە دۆستانیدا دەرچون بۆ شوێنێک لەدەورو بەری مەدینە، (پاش ماوەیەک) ماندو بونو برسێتی یەخەی پێگرتنو لە شوێنێکدا دانیشتنو دەستییان کرد بەنان خواردن، لەم کاتەدا شوانێک دای بەلایانداو سڵاوی لێکردن، عەبداللە ش فەرموی لێکرد تا لەگەڵیاندا نان بخوات، بەڵام شوانەکە وتی: من بەڕۆژوم، عەبداللە ش زۆری پێ سەیربوو بۆیە لێی پرسی: نهێنی لە گرتنی ڕۆژو لەم ڕۆژە گەرمەدا چی یە؟

شوانەکەش وتی: من دەمەوێت لەم دونیایەدا توێشو زیاد بکەمو کۆبکەمەوە بۆ دوارۆژم. پاشان عبداللە ﷺ داوای لێکرد کە مەڕێکیان پێ بفرۆشێت، شوانەکەش ووتی: ئەم ئاژەڵانە موڵکی گەورەکەمە (وە هی من نیە)، پاشان عبداللە)ﷺ تاقیکردەوەو وتی: (پێمان بفرۆشە) ئەگەر خاوەنی دەربارەی پرسیاری لێکردی تۆ بڵێ: گورگ خواردی! (ئیتر ئەو لە کوێ ئاگای لێیە)، شوانەکەش پشتی تێکردو وتی: ئەی خوا لە کوێیە؟ عبداللە بە قسەی شوانەکە داچڵەکیو دەستی کرد بە گریانو (لەبەر خۆیەوە) دەیووت: ئەی خوا لەکوێیە؟.

کاتێکیش کە گەڕایەوە بۆ مەدینە چووە لای خاوەنی ئەو شوانەو شوانەکەشو مەڕەکانیشی لێکڕیو ئازادی کردو مەڕەکانیشی پێبەخشی.((البیهقی)).

---

مرۆڤی ئیماندار هەموو کات هەست بە چاودێری خوا دەکاتو بیری لەلای ئەو فەرمایشتە پیرۆزەی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿خوا لەگەڵتانە، لەهەر شوێنێکدا بنو دڵنیابن کە خوا بە هەموو ئەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە.﴾(الحدید ٤).

# تَنْزِيهُ اللهِ

بَعَثَ رسُولُ الله ﷺ سَرِيَّةً، وكـانَ إمَـامُهُمْ يَقـرأُ في الصَّـلاةِ بِسُـورةِ الإخـلاصِ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ في كُـلِّ رَكْعةٍ بعدَ أن يَقرأَ الفاتِحةَ والسُّورةَ التي بعدَهَا.

فلَمَّا رَجَعُـوا إلى المدينـةِ ذَكَـرُوا ذلـكَ لِرسـولِ الله ﷺ، فقالَ لَهُمْ: "سَلُوهُ لأَيِّ شَيءٍ يَصنَعُ هذَا؟"

فَسَأَلُوهُ عَنْ سببِ ذلكَ، فَقالَ الرَّجُـلُ: لأنَّهَـا صِـفَةُ الرَّحمَنِ، فَأنَا أُحِبُّ أَن أَقرأَهَا.

فَقَـالَ رسُـولُ اللهِ ﷺ: "أَخبِـرُوهُ أنَّ اللهَ عـزَّ وجـلَّ يُحِبُّهُ"[متفق عليه].

---

مِـنَ الأَدبِ مـعَ الله أنْ نَـدْعُوَهُ ونُنَاجِيـهُ بأسمائِـهِ الحُسْـنَى، وأَنْ نُنقِّـي قُلوبَنَا، ونُخْلِصَ فِي أعمالنَا للهِ سُبحانَهُ وتَعالَى.

# بەبێگەرد دانانی خوا

پێغەمبەر ﷺ هێزێکی ڕەوانەی شوێنێک کرد، پێش نوێژەکەیان هەموو کاتێ لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحەو سورەتەکەی پاشیەوە سورەتی (الاخلاص) دەخوێند﴿قل هوَ اللّهُ أحد.....﴾ کاتێ کە گەڕانەوە بۆ مەدینە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرموی: لێی بپرسن بۆچی وا دەکات؟ ئەوانیش لێیان پرسی: کە هۆی چیە؟ پیاوەکەش ووتی: لەبەر ئەوەی کە سیفەتو ناوەڵناوی خوداوەندی بەخشندەیە، منیش حەزدەکەم بیخوێنم. پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: هەواڵی پێبدەن کە خوای گەورەش ئەوی خۆش دەوێت ((متفق علیه)).

---

ئەدەب لەگەڵ خوادا ئەوەیە کە داوای لێبکەین‌و لەگەڵ ناوە جوانەکانیدا موناجات‌و خەڵوەت بگێڕین‌و دڵەکانمان (لەهەموو نەخۆشییەک) پاک‌و خاوێن بکەینەوەو کاروکردەوەکانیشمان تەنها لەبەر ئەو ئەنجام بدەین.

# عَهْدُ اللهِ

لَم يحضرِ الصحابيُّ الجَليلُ أَنَسُ بنُ النَّضْرِ رضي الله عنه غَزْوَةَ بَدرٍ، فَقالَ للرَّسول ﷺ يا رَسُولَ الله غِبْتُ مِنْ أوَّلِ قِتالٍ قَاتَلْتَ المُشرِكِينَ فيه، لَئنِ اللهُ أَشهَدَنِي قتالَ المُشركِينَ لَيَرَيَنَّ مَا أَصنَعُ.

فلَمَّا جَاءتْ غزوَةُ أُحُد، وَانكَشَفَ المُسلمُونَ فِي المعركَةِ، تَقدَّمَ نحو صُفُوفِ المُشركِينَ، وهُوَ يَقولُ: الجنَّةَ وَرَبِّ الكَعبةِ، إنِّي أَجِدُ رِيْحَهَا مِنْ دُون أُحُدٍ.

وَقاتَلَ أنسٌ قتالاً شَديداً حتَّى استُشهِدَ فِي سبيلِ الله.

وبَعدَ المعركة، بَحثُوا عَنْهُ فِي القَتْلَى فَوَجَدُوهُ شَهِيداً، بِهِ بِضْعٌ وَثمَانُونَ جُرْحًا؛ مِنْ ضَرْبَةٍ بالسَّيفِ وَطعْنَةٍ بِالرُّمحِ وَرميَةٍ بِالسَّهمِ، ولَمْ يَعرِفْهُ أَحَدٌ مِنْ كَثْرةِ جُروحِهِ؛ إلاَّ أختُهُ عرفَتْهُ بِعَلاَمةٍ في إصبَعِهِ [متفق عليه].

ونَزَلَ فيهِ وفِي أَصحابِهِ قَولُ الله تَعالَى: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ [الأحزاب:٢٣].

---

الأَدَبُ معَ الله أَنْ نُحِبَّهُ ونَبذُلَ أرواحَنَا في سبيلِ نُصْرةِ دِينِهِ. قَالَ تَعالَى: ﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾ [التوبة:١١١].

# پەیماندان بەخوا

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ئەنەسی کوڕی نەزیر ﷺ لەبەر ئەوەی ئامادە نەبوو لە بەشداری کردن لە جەنگی بەدردا بۆیە چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێردراوی خوا. من ئامادەی یەکەم جەنگ نەبووم کە تۆکردت لەگەڵ بێباوەڕاندا، بەڵام بەڵێن دەدەم ئەگەر هاتوو خوا جەنگێکی تری نیشاندام لەگەڵیاندا ئەوە دەبینن چی دەکەم!!.ئەوە بوو کە جەنگی ئوحود هەڵگیرساو موسڵمانان بەرەو ڕوویان بڵاو دەبنەوەو دەڕۆیشتن، ئەنەسیش بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەناو ڕووەو بێباوەڕان دەچووە پێش ودەیگوت: سوێند بەخوای کەعبە بەهەشتم دەوێ، من لەلای کێوی ئوحودەوە بۆنی بەهەشت دەکەم و دەمزرۆیم.بەڵێ ئەنەس چووە ناو جەنگەکەوەو زۆر بە جوامێرانە بەرامبەر بێباوەڕان وەستا هەتاوەکو شەهیدبوو لە پێناوی خوادا.

لە دوای جەنگەکە لە ناو کوژراوەکاندا بۆی دەگەڕان، ئەوەبوو بینیان کە شەهید بووەو هەشتاو ئەوەندە شوێنی شمشێرو ڕم‌و تیر بەسەر لاشەیەوە هەبوو، لە زۆری برین‌و زامی لاشەی تەنها خوشکەکەی بە نیشانەیەکدا کە لەپەنجەکانیدا هەبوو ناسییەوەو(زانی کە ئەنەسی برایەتی)(متفق علیه). لە حەقی ئەوو هاوەڵانیدا ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی:﴿مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بەخوا ڕاستیان کرد بەسەری ژیان‌و پابەند بوون پێوەی‌و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردو مرد لە سەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بە هیچ شێوەیەک گۆڕان ڕووی تێنەکردوون﴾ (الاحزاب ٢٣).

---

بە ئەدەب بوون لەگەڵ خوادا بەوە دەبێت کە زۆرمان خۆش بوێت‌و گیان‌و ڕۆحمان لە پێناو سەرخستنی ڕێگاکەیدا بەخت بکەین. پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿بەڕاستی خوا گیان‌و ماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە﴾(التوبە ١١١).

# كَلامُ اللهِ

ذَاتَ يَومٍ، قَالَ النَّبيُّ ﷺ لعبدِ الله بنِ مَسعودٍ رضي الله عنه «اقرَأْ عَليَّ القُرآنَ».

فَقالَ ابنُ مَسعودٍ: يَا رسُولَ اللهِ! أَقرأُ علَيكَ، وَعلَيكَ أُنزِلَ؟

فَقالَ النَّبيُّ ﷺ «إنِّي أُحِبُّ أَنْ أسمَعَهُ مِنْ غَيرِي».

فَقرأَ عبدُ اللهِ بنُ مَسعودٍ سُورةَ النِّساءِ، حتَّى وصَلَ إلى قَولِ الله تَعالَى: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ [النساء: ٤٠].

فَقالَ لَهُ النبيُّ ﷺ «حَسبُكَ الآنَ».

فَالتفَتَ إليهِ ابنُ مَسعودٍ، فوجَدَ النَّبيَّ ﷺ يَبكِي وَعينَاهُ تذْرِفَانِ الدُّموعَ. [متفق عليه].

---

المُسلمُ يُحبُّ أَنْ يَسمَعَ القُرآنَ، ويُداوِمُ على قِراءَتِه. قَالَ النَّبيُّ ﷺ: «اقرَءُوا القُرآنَ فإنَّهُ يأتِي يومَ القِيامةِ شَفيعاً لأَصحابِهِ»[مسلم].

# فەرمایشتی خوای گەورە

رۆژێکیان پێغەمبەرﷺ بە عبداللە کوڕی مەسعودی فەرمود: قورئانم بەسەردا بخوێنە. عبداللە ش ووتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من قورئان بۆ تۆ بخوێنم لە کاتێکدا قورئان بۆتۆ دابەزیوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: پێمخۆشە لە کەسێکی ترەوە گوێی لێبگرم، عبداللە کوڕی مەسعودیش دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی ﴿النساء﴾ هەتا گەیشتە ئەو فەرمایشتەی کە دەفەرموێت: ﴿فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا﴾(٤١) واتە: ئینجا دەبێت حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێت کاتێک لەهەر میلەتێک شایەتێکمان هێناو تۆشمان هێنا (ئەی محمد ﷺ بەشایەت بەسەر ئەو خەڵکەوە (کە پەیامی خوات پێراگەیاندوون). پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێت: بەسە لێرەدا بووەستە. عبداللە ش سەیری پێغەمبەرﷺ دەکات‌و دەبینێت کە دەگری‌و هۆن هۆن فرمێسک بە چاوەکانیدا دێتە خوارەوە. (متفق علیه).

---

مرۆڤی موسوڵمان پێی خۆشە گوێ بگرێت لە قورئان‌و هەموو کات بیخوێنێت. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت:. (قورئان بخوێنن چونکە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە تکاکار بۆ هاوەڵەکەی (خوێنەرەکەی).

# تَقوَى اللهِ

دَخَلَ ثَلاثَةُ رجَالٍ، فِي غَارٍ مِن أجلِ المبيتِ، فَانحدَرَتْ صَخرةٌ كَبيرةٌ مِنْ أعلَى الجبَلِ وسدَّتْ بَابَ الغَارِ. ولَمْ يَستَطِيعُوا دَفْع هذه الصَّخرة، فَتوجَّهُوا إلى الله سُبحانَهُ يَدْعونَهُ بِصَالحِ أعمالِهِمْ. ونَاجَى الثَّالثُ ربَّهُ بأنَّهُ كانَتْ لَهُ ابنةُ عَمٍّ يُحِبُّهَا حُبّاً شَديداً، وعِندَمَا أصابَهَا الفَقْرُ، واحتاجَتْ إلى المالِ، ذَهبَتْ إليه، لتَطلُبَ منْهُ مَالاً، فَوافَقَ مُقابِل فعْلِ الفَاحشَة، فَرفَضَتْ وانصرَفَتْ، لكنَّهَا لَمْ تجِدْ أحَدًا يُعطِيْهَا، فَعادَتْ إليهِ مُضطرَّةً، فلَمَّا أغلَقَ الأبوابَ ذكَّرَتْهُ باللهِ سُبحانَهُ، وقَالَتْ لَهُ: اتقِّ اللهَ. فَتذكَّرَ اللهَ سُبحانَهُ، وعادَ إلى صوَابِهِ وتَركَهَا وأعطَاهَا المالَ، خَوفاً منَ اللهِ سُبحانَهُ.

ثُمَّ قَالَ: اللَّهمَّ إنْ كُنتُ فَعَلْتُ ذلكَ ابتغاءَ وَجْهكَ فَأفرِجْ عنَّا مَا نحنُ فيهِ، فَاستَجَابَ اللهُ دُعَاءَهُ وتزَحْزَحَتِ الصَّخْرةُ، وخرَجَ الثَّلاثةُ منَ الغَارِ. [البخاري].

---

المسلِمُ يَلجأُ إلى اللهِ سُبحانَهُ، ويَطلُبُ منْهُ العَوْنَ، يقولُ تَعالَى: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ﴾. [النمل:٦٢].

# لە خواترسان

سی پیاو لەبەر ناچاریو پێویستی چوونە ناو ئەشكەوتێكەوە تاوەكو تیایدا بمێننەوە، بەردێكیش لە شاخەكەوە بەر دەبێتە وەو دەمی ئەشكەوتەكەیان لێدەگرێت، ئەوانیش هەرچەند هەوڵ دەدەن ناتوانن بیجوڵێنن‌و لایبەرن، بۆیە (كەئاوا بێ دەسەڵاتو داماو جۆش دائەمێنن) ڕودەكەنە خواو بەكردەوەباشەكانیان داوای كۆمەكیو یارمەتی لێدەكەن. (دوای یەكەم و دووەمیان) سێ هەمیشیان نزادەكات (كە وەختی خۆی) كچە مامێكی هەبووەو زۆری خۆش ویستووە، كچە مامەكەشی فەقیرو هەژار دەكەوێتو دەچێتە لای ئەوو داوای یارمەتی لێدەكاتو ئەویش پێی دەڵێت بە مەرجێ یارمەتیت دەدەم كە كاری بێشەرعیم لەگەڵدا بكەیت، بەڵام كچە مامەكەی ڕازی نابێت ودەڕوات، دوای ماوەیەك كەكچە مامەكەی تەواوموحتاج دەبێت دەچێتەوە بۆ لای و لە ناچاریدا بە مەرجەكەی ڕازی دەبێت، كاتێ دەرگاكان دادەخەن و كاتی كارە،پۆخڵەكەدێت،كچە مامەكەی بیری خوای دەخاتەوەو پێی دەڵێت لە خوابترسە. ئەویش پیری خوای دەكەوێتەوەو كارەكەی لەگەڵدا ناكاتوماڵەكەیشی پێدەبەخشێتو بەرێی دەكات. پاشان وتی: سا خوایە ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ كردووە لەم شوێنە ڕزگارمان بكەو دەرمان بهێنە. پەروەردگاریش نزاكەی گیرادەكاتو هێدی هێدی بەردەكە دەخزێتو لادەچێتو هەرسێكیان لە ئەشكەوتەكە دەچنە دەرەوە (البخاری).

---

مرۆڤی موسوڵمان هەموو كات پەنا دەباتەوە بۆ لای خوای گەورەو داوای كۆمەكی و یارمەتی لێدەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ئایا كێیە جگە لە زاتی پەروەردگار كە بێت بە هاناو هاواری لێقەوماوو بێدەرەتان و بێ داڵدەوە، كاتێك نزا دەكاتو لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەكان لا دەباتو دەتانكاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا.﴾(النمل ٦٢).

# تَصدِيقُ الكِتَابِ

نَزَل قولُ الله تَعالَى ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ [النور: ٣١] وَأمرَ الله المسلمَات بالحجَاب.

ذَهَب رِجَالُ الأَنصارِ إلى نِسائِهِمْ يَتلُونَ عَلَيهِنَّ كلامَ الله؛ كلُّ رجُلٍ يَقرَأُ الآيات علَى زوجتِهِ وابنتِهِ وأُختِهِ وأقربائه.

فمَا مِنْهُنَّ امرأةٌ إلاَّ وَأسرَعَتْ بالحجَابِ ولَفَّتْ رأسَهَا وصَدرَهَا بمَا عندَهَا مِنْ ثيابٍ، وذَلكَ تَصدِيقاً وَإيمَاناً بِمَا أنزَلَ اللهُ مِنْ كتابِهِ.

وقَدْ أَثنَتْ عَليهِمُ السَّيِّدةُ عَائشةُ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ـ فَقالَتْ: وإنِّي وَالله مَا رأيتُ أفضلَ مِنْ نِساءِ الأَنصَارِ أَشَدَّ تَصدِيقاً لكتَابِ الله وَإيمَاناً بِالتَّنزيلِ. [ابن كثير].

---

المُسلِمُ يُنفِّذُ أوامِر الله دُونَ تَرَدُّدٍ، قَالَ تَعالَى: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ [النور: ٥١].

# بەڕاست دانانی کتێبی خوا

کاتی فەرمانی خوا ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ﴾ دابەزی کە بە واتای ئەوە دێت (با ئافرەتانی ئیماندار) سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا- پیاوە ئەنسارییەکان زوو گەڕانەوە بۆ لای خێزانەکانیان و ئەم فەرمانەی خوایان بەسەردا خوێندنەوە، هەموو پیاوێکیان دەیخوێندەوە بەسەر ژن و کچ و خوشک و خزمە نزیکەکانیدا. لەبەرامبەریشدا هیچ ئافرەتێک نەبوو گوێڕایەڵی لە فەرمانی خوادا نەکات، بەڵکو زۆر خێراو دەست بەجی هەرچییان لە لا بووایە لە پۆشاک و قوماش دەیاندا بەسەرو مل و سینەیانداو خۆیان پی دادەپۆشی، ئەم گوێڕایەڵییە بەهێزەش دەگەڕێتەوە بۆ ئیمانێکی پتەو بەو فەرمانانەی کە لە لایەن پەروەردگارەوە دادەبەزێت. بۆیە خاتوو عائشە رضي الله عنها ستایشیان دەکات و دەفەرموێت: سوێند بە خوا من هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە کە چاکتر بوبێت لە ئافرەتە ئەنصارییەکان لە بەڕاست زانینی کتێبی خواو باوەڕبوون بەو فەرمانانەی کە لەلایەن خوداوە دادەبەزی. (ابن کثیر).

---

مرۆڤی موسوڵمان بەبێ هیچ دوودڵییەک گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکات و فەرمانەکانی جێبەجێدەکات. وەک خوای میهرەبان وەصفی ئیمانداران دەکات و دەفەرموێت: ﴿گوفتاری ئیمانداران کاتێک بانگ دەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع﴾ (النور ٥١).

# اللهُ المالِكُ

فَتحَ المُسلمُونَ مصر بقيادة عَمْرِو بنِ العَاصِ رضي الله عنـه، وبعدَ فترةٍ قَلَّ ماءُ نهرِ النَّيلِ. فَجاء المصريُّونَ إلى عَمْرِو بنِ العَـاصِ يَستَأذنُونَهُ أنْ يَفعَلُوا عَادَتَهُمُ السَّـنويَّةَ (وَهـيَ أنَّهُـمْ يُحضـرُونَ فتـاةً جَميلةً، ويُلبِسُونَهَا أفضَلَ الثِّيابِ وَالحُلِّيِّ، ثُمَّ يُلقُونَهَا فـي النِّيـلِ)، فَرَفَض عَمْرٌو، وبَعَث برِسَالةٍ إلى أميرِ المُؤمنينَ يُخبِرُهُ بِمَا حَـدَثَ، فَأرسَل إليهِ أميرُ المُؤمنينَ، قَائلاً: قَدْ أصَبْتَ، إنَّ الإسلامَ يَهدِمُ مَـا قبلَهُ، كمَا أرسَلَ إليهِ بِطاقةً أُخرَى لِيُلقِيَهَا فِي النِّيلِ.

فَفَتَحَ عَمْرٌو البِطاقةَ فإذَا مَكتوبٌ فِيهَا: «مِنْ عبدِ الله عُمَرَ أمـيرِ المؤمنِينَ إلى نيلِ مصر، أمَّا بعدُ، فَإنْ كُنتَ تَجْرِي مِـنْ قِبَلِـكَ فَـلاَ تَجْرِ وإنْ كانَ الواحدُ القَهَّارُ يُجْرِيْكَ؛ فَنَسألُ اللهَ الواحدَ القهَّـارَ أنْ يُجرِيَكَ».

فَألقَى عَمْرُو بنُ العَاصِ الرِّسالةَ فِي النِّيلِ، فإذَا بـالله سُـبحانَهُ يُجْرِي الماء فِي النِّيلِ، حتَّى كَثُرَ وَفَاض.

---

المُسلمُ لاَ يَسأَلُ أحَدًا إلاَّ الله، وَلاَ يَسـتَعِينُ بأحَـدٍ إلاَّ بـالله، قـالَ ﷺ: «..إذَا سَألْتَ فاسألِ اللهَ، وإذَا استَعَنْتَ فَاستَعِنْ بالله..» [الترمذي].

# هەرخوا خاوەنە

دوای ئەوەی بەسەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص موسوڵمانان دەرگاکانی شاری میسریان والآکرد بەڕوی جیهانی ئیسلامیدا ئاوی نیل زۆر کەمی کردبوو، خەڵکی میسریش چوونە لای عەمری کوڕی عاص تاوەکو مۆڵەتیان بدات خووە سالآنەکەیان ئەنجام بدەن (کە بریتی بوو لەوەی کچێکی جوانیان دەهێناو بەپۆشاکی گرانبەهاو زێڕو زیو دەیان ڕازاندەوەو فڕێیان دەدایە ناو ڕوباری نیلەوە)، بەڵام عەمر داواکەیانی قبوڵ نەکردو پەیامێکیشی نارد بۆ ئەمیری ئیمانداران و لە هەواڵەکانی میسر ئاگاداری کردەوە، لەبەرامبەریشدا ئەمیری ئیمانداران پەیامێکی بۆ نارد کە تیایدا نوسیبوی: ئافەرین کە ڕێگەت پێنەدان و چاکت پێکا، چونکە ئاینی ئیسلام ڕوخێنەری هەموو بیرە پوچەکانی پێش خۆیەتی، هەروەکو چۆن نامەیەکی تریشی بۆ ناردبوو کە عەمری کوڕی عاص کردییەوە بینی کە تیایدا نوسراوە: لە بەندەی خوا عومەری پێشەوای ئیماندارانەوە بۆ نیلی میسر، (لە پاش ناوی خواو سەلآوات بۆ پێغەمبەر ﷺ و سلآو بۆ تۆ، پێت دەڵێم) ئەگەر تۆ بەحەزو ویستی خۆت دەڕۆیت ئەوە مەڕۆو ڕاوەستە، ئەگەریش خوای تاک و بە دەسەلآت تۆ دەجوڵێنێ ئەوە داوای لێدەکەین بتبات بەڕێوە (و زیادت بکات). عەمری کوڕی عاصیش نامەکەی خستە ناو نیلەوەو بینیان بە ویستی خوا ئاوەکە گەشەی کردووەو زیادو زۆر بووە.

---

مرۆڤی موسوڵمان داوا هەر لەخودا دەکات و بێجگە لەویش داوای کۆمەکی لەکەس ناکات. پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: (ئەگەر داوات کرد ئەوە تۆ داوا هەر لەخودا بکەو ئەگەریش داوای یارمەتیت کرد ئەوە داوای یارمەتی هەر لەخوا بکە) ((الترمذي)).

# اللّه الشَّافِي

دخَـل عبـد الله بـنُ مسـعودٍ رضـي الله عنـه ذَات يـومٍ علَـى زوجته، فَرأى فِي عُنُقِهَا خَيْطًا، فَقَالَ لهَا: مـا هـذَا؟ قَالَـتْ: خَـيطٌ رُقِـيَ لي فيـه (أي أنَّهـا تلبسُـهُ كَرُقْيـة للشِّـفاء مـنَ المـرضِ وَمنْـعِ الأَخطارِ).

فَأَخَذَ ابنُ مسعود الخَيطَ، وَقطَّعَـهُ وقَـالَ لزَوْجَتِـه: أَنْـتُمْ ـ آلَ عبد الله ـ لأَغنياءُ عنِ الشِّرْك، سـمعتُ رسـولَ الله ﷺ يقـولُ: «إنَّ الرُّقَى (مَا كانَتْ مِن أمرِ الجاهليَّـة) والتَّمَـائم والتِّوَلَـةَ (نوعَـانِ مـنَ السحرِ) شِرْكٌ»، فَأخبرَتْهُ أنَّ عَيْنَهَـا الدَّامعـةَ كانَـتْ تَسـكُنُ عنـدَمَا يُرْقِيهَا اليَهودِي. فَقالَ ابنُ مُسعودٍ: إنَّمَا ذلكَ مـنْ عمـلِ الشَّـيطانِ، كانَ ينخَسُهَا (يلمَسُهَا) بيـده، فـإذَا رَقَاهَـا كَـفَّ عنْهَـا، إنَّمَـا كـانَ يَكفيْك أنْ تقُولِي كمَا كانَ رسُولُ الله ﷺ يقولُ: «أَذهبِ البأْس رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أنت الشَّافِي، لا شِفَاء إلاَّ شفاؤُكَ، شِفاءً لا يُغـادِرُ سَقَماً» [ابن ماجة والحاكم].

---

مِنَ الأَدبِ مع الله أنْ يعتَقدَ المُسلمُ اعتقَاداً كَاملاً بأنَّ الشِّفَاء مِنْ عند الله وحدَهُ، قَالَ اللهُ تَعالَى: ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ [الشعراء:٨٠].

# هەرخوا شیفا بەخشە

رۆژێک عبدوڵای کوڕی مەسعود‌ چووە ماڵەوە بۆ لای خێزانەکەی‌و بینی کە ژنەکەی دەزوداوێکی هەڵواسیوە بەگەردنیەوە، عبداللە لێی پرسی ئەمە چیە؟ خێزانەکەشی ووتی: ئەمە پەتێکی شیفادەرو پارێزەرە لە خراپەی خەڵکی، عبداللە لە ملیدا ڕایکێشاو بچڕاندی!! پاشان ووتی: ئەی بەندەی خواو خێزانی عبداللە: ئێمە زۆر بی پێویستین لەوەی کە هاوەڵ بۆ خودا دابنێین، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی لە هاوەڵ دانانە بۆ خوا ڕوقیەکردن (داوای نزاکردن بە شتێکی کاتی نەفامییەوە) و تەمائیم وتیوە لە (کە دوو جۆرن لە سیحر).خێزانیشی ووتی: بەلأم جولەکەکان کاتی دەیکەن چاوی فرمێسکاویان ئۆقرە دەگرێت؟ ئیبن مەسعودیش ووتی: ئەوە کاری شەیتانەو دەستیان بۆ پیا دەهێنێت، بەلأم کاتێ داوای نزای لێئەکەن واز ئەهێنێ. (ئەی خێزانم) تۆ هەر ئەوەندەت بەسە کە وەک پێغەمبەر ﷺ بڵێیت: (ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە! ئەم ئێش‌و ئازارە لابەرە، شیفای بدەو خۆشت چاکی بکەرەوە، شیفادەری بەڕاستی هەر خوتیت‌و خۆشبونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لەتۆ شیفادەری تر نییە، چارەساز هەر خۆتی، چاک کەرەوە هەر تۆی، ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێت دەرمان‌و نوشتە پارە ناکاو دەرمانی هیچ دەردی ناکا، شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەردێ نەهێڵێ)((ابن ماجة والحاكم)).

---

ئەدەب لەگەڵ خوادا ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان بیروباوەڕێکی زۆر تەواو کاملی هەبێت بەوەی کە چارەسازو شیفادەری تاک‌و تەنها بەس خوایە، پەروەردگارمان لەسەر زاری پێغەمبەر ئیبراهیمەوە دەفەرموێ: ﴿کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم، ئەوە هەر ئەو چارەسەرەم دەکات‌و شیفام بۆ دەنیرێت﴾(الشعراء ٨٠).

# التَّوكُّلُ علَى اللهِ

كَانَ النَّبيُّ ﷺ جَالساً معَ أصحابِهِ فَقالَ لَهُمْ: «عُرِضَتْ علَي الأُمَمُ فَرأيتُ النَّبي ومَعَهُ الرَّهْطُ (الجمَاعةُ القَليلةُ)، والنَّبيُّ ومعَهُ الرَّجُلُ والرَّجُلانِ، والنَّبيُّ ليس معَهُ أحَدٌ، إذْ رُفِعَ لِي سَوادٌ عَظيمٌ (رأى أشخَاصًا كَثيرِينَ) فَظَنَنتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي، فَقِيلَ لِي: هـذَا مُوسَى وقَومُهُ، ولَكِنِ انظُرْ إلى الأُفُقِ، فَنظَرْتُ فإذَا سَوَادٌ عَظيمٌ، فَقيلَ لِي: انظُرْ إلى الأُفُقِ الآخَرِ فإذَا سَوَادٌ عَظيمٌ، فَقِيلَ لِي: هذهِ أُمَّتُكَ وَمعَهُمْ سبعونَ ألفاً يَدخُلُونَ الجنَّةَ بِلاَ حِسابٍ ولاَ عَذابٍ».

فَأخذَ النَّاسُ يَتحدَّثُونَ عَن هؤلاءِ السَّبعينَ ألفاً، فَأخبَرَهُمُ النَّبيُّ ﷺ بصِفَاتِهِمْ، فقالَ: «هُمُ الذِين لاَ يَرْقُونَ ولاَ يَسْتَرْقُونَ (أَيْ برُقْيَةِ الجاهليَّةِ) ولاَ يَتطَيَّرُونَ (لا يَتشَاءَمُونَ) وعلَى ربِّهِمْ يتوكَّلُونَ»، فَقالَ عُكَّاشَةُ بنُ مُحصِنٍ: أُدْعُ اللهَ أنْ يَجعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقالَ ﷺ لَهُ: "أنتَ مِنْهُمْ" ثُمَّ قَامَ رَجلٌ آخَرُ فَقَالَ: أُدْعُ اللهَ أنْ يَجعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقالَ ﷺ: "سَبقَكَ بهَا عُكَّاشَةُ» [متفق عليه].

---

المتَوكِّلُ على اللهِ: الذِي يعلَمُ أنَّ اللهَ كافِلُ رِزْقِهِ وأَمرِهِ، فَيَركَنُ إليهِ وحْدَهُ ولاَ يتوكَّلُ على غَيرِه.

# پشت بەستن بەخوا

(جاریکیان) پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا دانیشتبوو ئەوسا فەرمووی: ئوممەتەکان خرانە بەرچاوم، بینیم پێغەمبەر هەیە کۆمەڵێکی کەمی لەگەڵدا بوو پێغەمبەری وا بوو کەسێك یان دوانی لەگەڵدا بوو. هەبوو کەسی لەگەڵ نەبوو. ئینجا خەڵکێکی زۆرم پیشاندرا، گومانم کرد کە ئوممەتەکەی من بن، پێم وترا: ئەوە موسا و گەلەکەیەتی بەڵام بڕوانە بۆ بەری ئاسۆ سەیرم کرد خەڵکێکی زۆر کە ڕەشیان دەکردەوە، وتیان: ئەوە ئومەتەکەتن.، حەفتا هەزاریان لەگەڵتا بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوەو سزایان نیە. پاشان خەڵکی کەوتنە باسی ئەو حەفتا هەزار کەسە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدان و وەصفی ئەوانی بۆ کردن و فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن کە نوشتە ناکەن، داوای نوشتەکردنیش ناکەن، ڕەشبینی ناکەن، پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. (عوکاشەی کوڕی محصن) ووتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) داوام بۆ بکە لە خوا کە بمخاتە ناو ئەوانەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "تۆ لەوانی" ئینجا پیاوێکی تر هەستاو ووتی: داوام بۆ بکە لە خوا بمخاتە ناو ئەوانەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عوکاشە پێشت کەوت.(متفق علیە).

---

پشتبەستوو بە خوا بەخوا: ئەو کەسەیە کە بەڕاستی خوا بەڕۆزیدەرو بەڕێوەبەری کارەکانی بزانێت و، (هەموو کات) پەنای بۆ لابەرێت بێجگە لەو پشت بەکەسی تر نەبەستێت.

# قَسَمٌ فِي غَيرِ مَحلّهِ

كان لرجُلٍ علَى رجُلٍ آخر دَيْنٌ، فَجاءَ يَطلبُهُ، فَسألَهُ المَدينُ أنْ يَرْفُق به، فيضع عنْهُ بعض الدَّيْنِ وَيأخُذَ بعضاً؛ لِعَجْزِهِ عنْ سَدَادِ جميعِ الدَّيْنِ.. فَرَفَضَ، وَارتفَعَتْ أصواتُهُمَا، وَحلَفَ صاحِبُ الدَّينِ باللهِ قَائلاً: وَاللهِ لاَ أفعَلُ.

وسمعَهُ النَّبيُّ ﷺ فقَالَ: «أينَ المتَألِّي علَى اللهِ، لاَ يَفعَلُ المعروفَ (أي. أين الحالفُ المُبالغُ فِي اليَمينِ؟)».

فَقالَ الرَّجلُ: أنَا يَا رسُولَ اللهِ. وَأحسَّ بخطئَهِ، وَرَجَا ألاَّ يَغضَبَ عَليهِ رسولُ اللهِ ﷺ فَأسرَعَ يَقولُ لَهُ: أيُّ ذلكَ أحَبُّ (أيْ: للمَدينِ أنْ يختارَ أحبَّ الأمرَينِ إليهِ: إمَّا أنْ يضَعَ عنْهُ مَا عجَزَ عنْهُ منَ الدَّينِ، أو أنْ يضع عنْهُ مقداراً من أصلِ الدَّينِ). وَإنَّما فعَلَ ذلكَ رُجُوعاً إلى الحقِّ، وَاستِرْضَاءً لأَخيهِ، وَطاعةً للهِ ولرسولِهِ ﷺ [متفق عليه].

---

منَ الأدبِ معَ اللهِ أنْ لاَ يُقسِمَ الإنسانُ أنَّهُ لنْ يفعَلَ الخيرَ، قَالَ تَعالَى: ﴿وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ﴾ [البقرة:٢٢٤].

# سوێندێکی نابەجێ

پیاوێک قەرزی لای پیاوێکی تر بوو، هات بۆ داواکردنەوەی قەرزەکەی، کابرای قەرزدار داوای لە خاوەن قەرز کرد نەرم‌و نیان بێـ‌و هەندێ لە قەرزەکەی خۆش بێـ، چونکە ناتوانێت قەرزەکە هەموی بداتەوە. کابرا: ڕازی نەبوو، ئیتر دەنگیان بەسەر یەکتردا بەرز کردەوە. خاوەن قەرز سوێندی خوارد: سوێند بەخوا واناکەم! پێغەمبەر ﷺ ئەم سوێندەی گوی لیبوو، فەرمووی: ئەوە کێیە زیادەڕەوی دەکات لە سوێنددا، سوێند بەخوا دەخوات کە کاری چاک نەکات. کابرا وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا، کابرا هەستی بە هەڵەی خۆی کرد، ئومیدەوار بوو کە پێغەمبەر ﷺ لێی تورە نەبێـ. ڕوی کردەوە کابرا وتی: کامیانت پێ خۆشە هەڵبژێرە یان چەندە ناتوانی قەرزەکە بدەیتەوە، مەیدەرەوە یان بە ویستی خۆت ئەندازەیەک لە قەرزەکە ببرە، بۆیە ئەمکارەی کرد تا ملکەچی حەق بێت‌و دڵی براکەی ڕازی بکات‌و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ بکات.(متفق علیه).

---

ئەدەب لەگەڵ خوای گەورە ئەوەیە، مرۆڤ سوێند نەخوات لەسەر نەکردنی کاری چاک. خوای گەورە دەفەرموێت: سوێند بەخوا مەخۆن کە چاکە نەکەن‌و تەقوای خواتان نەبێت‌و چاکسازی‌و ئاشتەوایی لە نیو خەڵکدا ئەنجام نەدەن.

# سَمِعْنَا وأطعْنَا

نَزَلَ قولُ الله تَعالَى: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [البقرة:٢٨٤].

فَأسرَعَ الصَّحابةُ إلى رسُولِ الله ﷺ وَقَالُوا: يَا رسُولَ الله! كُلِّفْنَا منَ الأَعمالِ مَا نُطيقُ؛ الصَّلاةُ والصِّيامُ والجِهَادُ والصَّدَقةُ، وقَدْ أُنزِلَتْ عَليكَ هذه الآيةُ وَلا نُطيقُهَا. فقالَ رسُولُ الله ﷺ: «أتريدُونَ أن تقولُوا كمَا قَالَ أهلُ الكتَابَينِ قَبلَكُمْ: سمِعْنَا وَعَصيْنَا؟ بَلْ قُولُوا: ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾».

فَأَقَرَّ بِهَا الصَّحابةُ، وظَلُّوا يُرَدِّدُونَها ويُكثِرُونَ منْهَا، فَنزَلَ قَولُ الله تَعالَى: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ [البقرة:٢٨٥]. فَعلَّمَ الرَّسُولُ ﷺ الصَّحابةَ أدبَ الطَّاعةِ لأوامرِ الله. [مسلم].

---

تحدَّثَ النَّبيُّ ﷺ عمَّا يُصيبُ المُسلمَ منْ خيرٍ أو شرٍّ، فَقالَ: «إنْ أصابَتْهُ سرَّاءُ شكَرَ فكانَ خيراً لهُ، وإنْ أصابَتْهُ ضرَّاءُ صَبَرَ فكانَ خيراً لهُ» [مسلم].

# بیستمان و گوێڕایەڵیشین

کاتێ ئایەتی ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(البقره ٢٨٤) دابەزی

هاوەڵان چوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندە ئەرك و فەرمان دراوە بەسەرماندا لە تواناماندا نییە: نوێژ، ڕۆژوو، جیهاد، خێرکردن، ئێستەش ئەم ئایەتەت بۆ دابەزیوە لە تواناماندا نییە. پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: بۆ ئێوەش دەتانەوێت وەکو گاورو جولەکەکانی پێش خۆتان بڵێن: دەبیستین و سەرپێچیش دەکەین، نا بەڵکو ئێوە بڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵیشین، داوای لێخۆشبونت لێدەکەین پەروەردگارمان گەڕانەوەشمان هەر بۆلای تۆیە. هاوەڵانیش دانیان پیاناو هەردووبارەیان دەکردەوە تا ئایەتی (امن الرسول........المصیر)دابەزی کە بەواتای ئەوە دێت: پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەمویان باوەڕیان هەیە بەخواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازییەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوادا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و مل کەچین (بۆ بەدیهێنەرمان)پەروەردگار لێخۆشبونی تۆمان دەوێت و سەرەنجام هەر بۆلای تۆیە گەڕانەوە،

---

پێغەمبەر ﷺ لە بارەی موصیبەتی خێرو ناخۆشی موسوڵمانەوە فەرمویەتی: (موسوڵمان) ئەگەر توشی خێر بوو سوپاسی خوای لەسەر دەکاو بەمەش بۆی دەبێتە خێر، ئەگەریش ناخۆشییەکی توش بوو ئارامی لەسەر دەگرێت و ئەوەشی بۆ دەبێت بەخێرو چاکە (مسلم).

# اللهُ مَعَنَا

هَاجَرَ رسُولُ الله ﷺ منْ مكَّةَ إلى المَدينة، ورَافقَهُ في الهِجرَةِ أبو بكرٍ الصِّدِّيقُ رضي الله عنه وكَانَ المُشرِكُونَ يَتعقَّبُونَ الرَّسُولَ ﷺ ويبحثُونَ عَنْهُ، فَلجأَ الرَّسُولُ وَأَبُو بكرٍ إلى غارِ ثَورٍ، وَبقِيَا فيهِ ثَلاثةَ أيَّامٍ حتَّى يَئِسَ المُشرِكُونَ مِنَ اللَّحَاقِ بِهِمْ.

وظَلَّ المُشرِكُونَ يبحَثُونَ عَنْهُمَا فِي كُلِّ مَكَانٍ حتَّى وصَلُوا إلى غارِ ثَورٍ، وَوَقفُوا أمامَ الغَارِ، فَخافَ أبو بكرٍ الصِّدِّيقُ رضي الله عنه علَى رسُولِ الله ﷺ، وَقَالَ لَهُ: يَا رسُولَ الله! لَو أنَّ أَحَدَهُمْ نظَرَ تحتَ قدَميهِ لأَبْصَرَنَا.

فَطَمْأَنَهُ النَّبيُّ ﷺ وقَالَ لَهُ: «مَا ظَنُّكَ يَا أَبا بكرٍ باثنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا؟!».

وكانَ سُبحانَهُ وتَعالَى مَعَهُمَا، فَأعمَى عَنْهُمَا أعيُنَ المُشرِكِينَ، ورجَعُوا مِنْ حَيثُ أَتَوا، وَوَصَلَ الرَّسُولُ ﷺ وصاحِبُهُ إلى المدينةِ بسَلامٍ. [متفق عليه].

---

الأدَبُ مع الله أَنْ نَثِقَ في أَنَّهُ معنَا دَائماً، وأنْ نتوكَّلَ عليهِ ليحفَظَنَا مِن كُلِّ سُوْءٍ، وَأَنْ نُرَاقِبَهُ في كُلِّ تصرُّفاتِنَا، ونَخشَاهُ في السِّرِّ والعَلَنِ.

# خوا لەگەڵمانە

کاتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکری صدیقدا کۆچی کرد بەرەو مەدینە. بێباوەڕەکان بە دوایانەوە بوون‌و زۆر بە وردی هەموو شوێنێکیان بۆ دەگەڕان. پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکردا پەنایان بردە ئەشکەوتی (ثەور) و سێ ڕۆژ تێیدا مانەوە، تا ئەوەبوو بێباوەڕەکان نائومێدبوون لە گەیشتن پێیان، کاتێک زۆر بە وردی هەموو شوێنەکان دەگەڕان جارێک ڕێیان کەوتە ئەشکەوتی (ثەور)و گەیشتنە دەمی ئەشکەوتەکەو لەبەردەمیدا ڕاوەستان. ئەبوبەکر (رضي الله عنه) ترسی پێغەمبەری ﷺ هەبوو کە شتێکی لی بەسەر بهێنن بۆیە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێکیان سەیری ژێر پێی بکات ئەوە دەمان بینن!!

پێغەمبەریش ﷺ دڵنەوایی دایەوەو فەرمووی: ((ما ظنک یا أبابکر باثنین اللّه ثالثهما))؟

واتە: ئەی ئەبوبەکر گومانت چۆنە بەدوو کەس خوا یەمیان بێت.؟ بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵیان بوو، کوێرایشی هێنا بەسەر چاوی بێباوەڕەکانداو چۆن هاتبوون هەر ئاوا بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە. پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکریش زۆر بەخۆشی‌و بێ ترس گەیشتنە مەدینە.

---

بە ئەدەب بوون لەگەڵ خوادا بەوە دەبێت کە متمانەمان پێی هەبێت کە هەموو کات لەگەڵماندایە، پێویستە پشتی پی ببەستین تا لە هەموو خراپەیەک بمانپارێزێت،

وە پێویستە لە هەموو کردەوەکانماندا هەست بە چاودێری بکەین‌و لە نهێنی‌و ئاشکرادا لێی بترسین.

# المُرَاقبَةُ

خَرَجَ أميرُ المؤمنِينَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه يتفقَّدُ أحوَالَ المُسلمِينَ ليلاً، فَسمع حوَاراً بينَ أُمٍّ وَابنتهَا، قَالَت الأمُّ: قُومِي إلى اللَّبنِ فَاخلُطِيه بالماءِ، فَقالَت البِنتُ: لَقَدْ سمعتُ مُنادِي أميرِ المؤمنينَ يُنادي: لا تَخلُطُوا اللَّبنَ بالماءِ.

فَقالَت الأُمُّ: فَأينَ أنتِ مِنْ عُمَرَ ومُنَادِي عُمَرَ، قُومِي فَاخلُطِي اللَّبنَ بالماءِ، فإنَّ عُمَرَ لاَ يَرَانَا.

فَقالَت البِنتُ لأُمِّهَا: مَا كنتُ لأُطِيعهُ فِي العلاَنِيَةِ وَأَعصِيه فِي السِّرِّ، وَإنْ كَانَ عُمَرُ غَائباً لا يرَانَا، فإنَّ اللهَ حاضِرٌ يرَانَا.

سمعَ أميرُ المؤمنينَ هذَا الحِوارَ فأُعجِبَ بهذِهِ الفتاةِ، وَعرَفَ البيتَ، ثُمَّ جاءَ إليهِ فِي الصَّباحِ، وَاختارَ هذِه الفتاةَ الصَّالحةَ لِتكُونَ زَوجةً لابنِهِ عَاصِمٍ، مُكافأةً لهَا علَى وَرَعِهَا وَتقْوَاهَا. [ابن عساكر].

---

يَقولُ النَّبيُّ ﷺ: «الإحسَانُ أَنْ تعبُدَ اللهَ كأنَّكَ تَرَاهُ، فإنْ لَمْ تكُنْ تَرَاهُ فإنَّهُ يَرَاكَ» [مسلم].

^

# چاودێری

شەوێکیان ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خە طاب ﷺ خەڵکی بەسەر دەکردەوەو پشکنینی کاروباری موسوڵمانانی دەکرد، لە ناکاو گوێی لە گفتوگۆی دایکو کچێک بوو، دایکەکە بە کچەکەی دەووت: کچەکەم هەستە ئاو تێکەڵی شیرەکە بکە (تا زۆر بێت) کچەکەش بە دایکی ووت: (دایەگیان) من گوێم لە بانگەشەی ئەمیری ئیمانداران بوو کە دەیووت: ئاو تێکەڵی شیر مەکەن، دایکەکەش ووتی: تۆ چیت داوە بە عومەر و بانگەشەی هەستە ئاوەکەی تێکەڵ بکە خۆ عومەر نامانبینێت.کچەکەش بە دایکی ووت: کاری وا ناکەم کە لە ئاشکراییدا گوێڕایەڵی بکەمو لە نهێنیدا سەرپێچی بکەم، خۆ ئەگەر عومەر ئێستا لیرە نیەو نامانبینێت خۆ خوا لێرەیەو دەمانبینێت. کە ئەمیری ئیمانداران گوێی لە قسەکانیان بوو زۆر سەری سوڕما لەو کچەو ماڵەکەیانی دیاری کردو بۆ بەیانی چووەوە بۆ لایانو ئەو کچە پاکو صاڵحەی دیاری کرد بۆ عاصمی کوڕی تا ببێتە خێزانی لە پاداشتی ئەو خۆپارێزیو پارێزگارییەی لەبەرخوا.

---

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: ((الاحسان أن تعبدالله كأنك تراه، فأن لم تكن تراه فإنه يراك)) (مسلم).

واتە: چاکە ئەوەیە بەندایەتی خوا بکەیت وەک ئەوەی ببینی، ئەگەریش تۆ ئەو نەبینی ئەوە بەڕاستی ئەو تۆ دەبینێ.

# قصصُ الأَدبِ معَ اللهِ

خَلقَنَا اللهُ ـ سُبحانَهُ ـ وتَعالَى وأنعَمَ عَلينَا بـنِعَمٍ كَـثيرةٍ لا تُعَـدُّ ولاَ تُحْصى، وهُوَ المُطَّلعُ عَلينا في جميعِ أحوَالِنَا؛ يَسـمَعُنَا ويَرَانَـا ويَعلَمُ سِرَّنَا ونجوَانَا، وهُوَ اللَّطيفُ بِنَا الـرَّحيمُ بجميـعِ خلْقِـهِ، كمَا أنَّهُ سُبحانَهُ قوِيٌّ شَديدُ العقَابِ، يُحاسبُ الخَلاَئِـقَ علَـى أعمَـالِهِمْ وَيجزِيهِمْ عَليهَا.

وَواجِبٌ عَلينَا أنْ نتأدَّبَ مع ربِّنَا ـ سُبحانَهُ وتَعالَى ـ ، فَنعمَـلَ دَائماً علَى تَحقيقِ العُبوديَّةِ الخَالصَةِ للهِ ـ سُبحانَهُ ـ ، وَنشكُرُهُ علَـى نعَمِهِ الكثيرةِ وآلائه العَظيمة وَنستَحِيي منْهُ ـ سُـبحانَهُ ـ أَنْ نَعصِـيَهُ، بَلْ نُطِيعَهُ فِي كُلِّ أَوامرِهِ، وَنصْدُقَ فِي التَّوبَةِ إليهِ، وَنحسِنَ التَّوكُّـلَ والاعتمَادَ عَليهِ، كمَا أنَّنَا نَرْجُو رحمَتَهُ ونخَافُ عذابَهُ.

وَهذه بعضُ الآدابِ التي يَتحَلَّى بهَا المُسـلِمُ فِـي علاَقتِـهِ مـعَ ربِّهِ سُبحانَهُ.

# چیرۆکەکانی ئەدەب لەگەڵ خوادا

خوای پەروەردگارو پاکو بێگەرد ئێمەی دروستکردووەو نازو نیعمەتی زۆرو بێ شوماری ڕشتووە بەسەرماندا کە هەرگیز ژمارە ناکرێن، (اللّه) ئەو خوایەیە کە هەموو کات بەسەرمانەوەیەو کارو کردەوەکانمان دەبینێت، دەنگەکانمان دەبیستێو کردەوەی نهێنیو ئاشکرامان دەبینێت، (اللّه) ئەو خوایەیە کە بێ سنور بەسۆزو بەزەییە بەرامبەر بە دروستکراوەکانی، هەر وەکو چۆن بەهێزو تۆڵە سێنەریشە (لە خراپەکاران). (ڕۆژێکیش دێت) لێپرسینەوە لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانیدا دەکات (سەبارەت بە کردەوەکانیان)و پاداشتیان دەداتەوە (بە گوێرەی کارەکانیان). ئەوەی کە پێویستە لەسەرمان ئەوەیە کە زۆر بە ئەدەب بین لەگەڵ خواداو زۆر بە ملکەچیو دڵسۆزییەوە بەندایەتی بۆ بکەینو بەردەوام سوپاسی بکەین لەسەر ئەو هەموو نازو نیعمەتە زۆرەی کە پێی بەخشیوینو بۆی فەراهەم هێناوین، هەروەک پێویستە لەسەرمان شەرمی لێبکەینو سەرپێچی فەرمانەکانی نەکەینو گوێڕایەڵی بینو بەڕاستی و چاکییەوە بگەڕێینەوە بۆ لایو پشتی پێببەستینو هەموو کات داوای کۆمەکیو یارمەتی هەر لەو بکەین.وەک چۆن داوای ڕەحمەتەکەی دەکەینو پەنا لە سزاکەشی دەگرین. ئەم چەند لاپەڕەش کە ڕابوردین بەناویاندا هەندێ ئادابی مرۆڤی موسوڵمان بوو لەگەڵ پەروەردگاریدا...

# صَدَقَ رسُولُ اللهِ

فِي إحدَى اللَّيالِي المبَاركَة ، أُسرِي بِالرَّسُولِ ﷺ لَيلاً مِنَ المسجِدِ الحرَامِ إلى المسجِدِ الأَقصى ، ثُمَّ عُرِجَ بهِ إلى السَّموات العُلاَ

وَفي الصَّباحِ ، حدَّث النَّبيُّ ﷺ النَّاس بِمَا رَآهُ في هذِهِ اللَّيلـةِ ، فكَذَّبُوهُ.

وذَهَبَ بعضُ المُشرِكينَ إلى أَبي بكرٍ يَقولُونَ لهُ: هَل لـكَ في صاحِبِكَ يَزْعُمُ أنَّهُ أُسرِي بهِ اللَّيلةَ إلى بيتِ المَقدِسِ؟

فَقَالَ: أَوَ قالَ ذلكَ؟ قالُوا :نَعَم.

قَالَ:لئنْ كانَ قَالَ ذلكَ لَقَدْ صَدَقَ.

قَالُوا: فَتُصَدِّقُهُ أنَّهُ ذَهَبَ اللَّيلةَ إلى بيتِ المَقْدِسِ وَجَاءَ قبلَ أنْ يُصْبِحَ؟

قَالَ: نَعَم، إنِّي لأُصَدِّقُهُ فيمـا هُـوَ أبعَـدُ مِـنْ ذَلـكَ، أُصَـدِّقُهُ في خبَرِ السَّماء في غَدْوةٍ أو رَوْحَـةٍ. فَسُـمِّيَ أَبُـو بَكْـرٍ «الصـدِّيقَ» [البيهقي].

---

الأدَبُ معَ الرَّسُولِ يتطَلَّبُ مِنَّا أَنْ نلتَزِمَ بأقوالِهِ وَأفعالِهِ، فَلاَ نَتـرُكُ شَـيئاً حَثَّنا عليه النَّبيُّ ﷺ، ونَدعَ الأَشياء التي نَهانا عَنهَا:

# ڕاستی ووتنی پێغەمبەرﷺ

لە یەکێک لە شەوە پیرۆزەکاندا شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی) الحرام) ەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا لە (فەلەستین). پاشان لەوێشەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانە بەرزەکان.

لەبەرەبەیاندا پێغەمبەر ﷺ بەخەڵکی ڕاگەیاند و هەرچی بینی بوو هەواڵی بە خەڵکیدا، بەڵام خەڵکی بە ناڕاستیان دانا. ئەوسا هەندێ لە پیاوەڕان ڕۆیشتن بۆ لای ئەبو بەکر‌و پێیان ووت: تۆ ئەڵێی چی لەبارەی هاوڕێکەتەوە کە ئەڵێ من ئەمشەو شەو ڕەویم پێکراوە بۆ مزگەوتی قودس؟ ئەبو بەکریش ووتی: ئایا ئەو وا ئەڵێ؟ ووتیان بەڵێ. ووتی: ئەگەر ئەو وابڵێ ڕاست دەکات!! ئەوانیش بەسەرسامییەوە ووتیان: بە ڕاستگۆی دائەنێی کاتێ ئەڵێ من هەر ئەمشەو چووم بۆ (بیت المقدس)و پێش سپێدەی بەیانیش گەڕاومەتەوە؟ فەرموی: بەڵێ، من لەوە زیاتریش بڕوای پێدەکەم، بە ڕاستگۆی ئەزانم کە هەواڵی بەیانیان‌و ئێوارانی ئاسمانەکانیشم بۆ دەهێنێ. ئا لێرەوە ئەبو بەکر ناونرا ڕاستگۆ(الصدیق) البیهقی))

---

بە ئەدەب بوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ داخوازی ئەوەمان لێدەکات کە پابەند بین بە فەرمودەو کردەوەکانیەوەو. واز نەهێنین لەو شتانەی کە هەڵی ناوین بۆ کردنی، هەروەها واز بهێنین لەو شتانەی کە قەدەغەی کردنی لێکردووین.

# احترام الرَّسُول ﷺ

نزل قول الله تعالى ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ [الحجرات: ٢].

فظنَّ الصحابيُّ الجليلُ ثابتُ بنُ قَيْسِ بنِ شَمَّاسٍ رضي الله عنه أنّها نزلتْ فيه؛ لأنَّ صوتَهُ كان جهْوريّاً وعالياً، وجلس ثابتٌ في بيته يبكي واعتزل النّاس

ولمّا افتقدهُ النّبي ﷺ، أرسل إليه رجُلاً ليعرف ما به.

فعاد الرَّجلُ وأخبر النّبي ﷺ بما ظنّهُ ثابتٌ.

فقال ﷺ للرَّجُلِ «اذهبْ إليهِ فقلْ لَهُ إنَّك لَسْتَ منْ أهلِ النَّارِ، ولَكنَّك منْ أهلِ الجنّة» [متفق عليه].

وهكذا يكُونُ الأدب مع الرسول ﷺ، فإذا سمعنا حديثاً عنِ النّبي ﷺ فعلينا أنْ ننصت اليه، حتّى نفْهَم ما يقولُ ونعمل به، فالرَّسُولُ ﷺ حيٌّ بأقواله وأحاديثه.

---

يقولُ الله تعالى ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ [الحجرات: ٣]

# ڕێزگرتن لە پێغەمبەر ﷺ

کاتی ئایەتی ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکەنەوە لەکاتی گفتوگۆدا، قسەی بێپەردە مەکەن لە خزمەتیدا، وەکو بۆ یەکتری دەکەن، نەوەکو کردەوەکانتان پوچ بێتەوەو هەستیشی پێنەکەن﴾(الحجرات ٢) دابەزی، کە بەواتای ئەوە دێت: هاوەڵی بەڕێز (ثابت بن قیس بن شماس) ﷺ وای گومان برد کە ئەو ئایەتە لەسەر ئەو هاتووەتە خوارەوە، چونکە ئەو دەنگێکی گڕو بەرزی هەبوو، بۆیە لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتو دەگریاو خۆی دوورە پەرێز گرتبوو لە خەڵکی. کاتێ پێغەمبەر ﷺ بیستی فەرمووی:

بڕۆ بۆ لایو بڵێ تۆ ئەهلی دۆزەخ نیت، بەڵکو تۆ ئەهلی بەهەشتی. ((متفق علیه)).

بە ئەدەب بوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا بەم شێوەیە دەبێت، کاتێک کە گوێمان لە فەرمودەیەکی دەبێت پێویستە لەسەرمان چاک گوێی بۆ ڕابگرین، تاوەکو لێی حاڵی بینو کردەوەی پێ بکەین، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە وتەو فەرمودەکانی هەر زیندووە.

---

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿بەڕاستی ئەوانەی دەنگیان هێواش دەکەنەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە دڵەکانیانی زاخاو داوە بۆ تەقواو خوا ناسین، ئەوانە لێخۆش بوونو پاداشتی گەورەو گرانبەها بۆیان ئامادەیە﴾ (الحجرات ٣).

# سِرُّ الرَّسُولِ ﷺ

ذاتَ يَومٍ أَرسَل الرَّسُولُ ﷺ خَادِمَهُ أَنس بنَ مَالِك رضي الله عنه لقَضَاء أمرٍ مَا، ورَجَعَ أنسٌ إلى بيتِه مُتأخِّراً، فَسأَلتْهُ أُمُّهُ السَّيِّدةُ أُمُّ سُلَيْمٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ـ عَن سببِ تأخُّرِه، فَأخبَرَهَا أَنَّهُ كانَ فِي أمرٍ لِرسُولِ الله ﷺ.

فَقالَتْ لَهُ: مَا هُوَ؟

فَقالَ لهَا: إنَّهُ سِرٌّ

فَفرِحَتْ بهِ أمُّ سُلَيمٍ، وقَالَتْ لَهُ: يَا أَنسُ، لا تُخبِرْ أَحَداً بسِرِّ رَسُولِ الله ﷺ. [أبو داود].

ونحنُ نَتعلَّمُ مِنَ الصَّحابةِ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ ـ أَنْ نُحافِظَ علَى الأَسرارِ الَّتي يَأتَمِنُنَا النَّاسُ عَلَيهَا، وَنكُونُ علَى قدْرِ المَسؤُوليَّةِ التي رَآنا النَّاسُ أكْفَاءَ لها.

---

المُسلِمُ لاَ يَنقُلُ عَنْ رسُولِ الله ﷺ إلاَّ مَا صَحَّ مِن أحاديث، يَقُولُ ﷺ: «مَنْ كَذَبَ عليَّ مُتعَمِّداً فَلْيَتبوَّأْ مقعدَهُ مِنَ النَّارِ» [متفق عليه].

# نهێنی پێغەمبەر ﷺ

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ ئەنەسی کوڕی مالیکی نارد بۆ کارێک، (بەم هۆیەوە) ئەنەس کەمێک درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بۆیە دایکی پرسیاری لێکرد لە هۆی درەنگ کەوتنی؟ ئەویش ووتی: خەریکی کارێکی پێغەمبەر ﷺ بووم.ووتی: چ کارێک؟ ئەنەسیش ووتی: نهێنیە! لەم کاتەدا (أم سليم) ی دایکی زۆر دڵخۆش بوو، ئەوسا ووتی: ئەی ئەنەس نەکەی کەس لە نهێنی پێغەمبەر ﷺ ئاگادار بکەیت. (ابو داود).

ئێمەش دەبێت لە هاوەڵانەوە فێری پاراستنی نهێنی بین کاتێک خەڵکی پێمان ڕادەسپێرن، وە لەو گومانە باشانەی خەڵکیدا بین کە ئێمە وا دەبینن شیاوین بۆ ئەو بەرپرسیارێتیەی کە لەسەر شانمانە.

---

مرۆڤی موسوڵمان لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی (صەحیح)و زۆر شایەنی پێغەمبەر ﷺ نەبێ نایگەیەنێت. چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من كذب علي متعمدا فليتبؤ مقعده من النار)(متفق عليه). واتە: هەرکەسێ بە ئارەزوو درۆم بەدەمەوە بکات ئەوە با شوێنی خۆی لە ناو دۆزەخدا ئامادە بکات.

# الرَّسُولُ أَوَّلاً

انتهَتْ غَزوَةُ أُحُد، وجاءَت امرأةٌ مُسْلمَةٌ تَسأَلُ عَنْ زَوجِهَا وَأخيهَا وَأبيها، فَأخبَرُوهَا بأَنَّهُمْ نَالُوا الشَّهادةَ جَميعاً، فَقالَتْ: مَا فَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟

فَقالُوا لهَا: خَيْراً يَا أُمَّ فُلانٍ، هُوَ بحَمْدِ اللهِ كمَا تُحِبِّينَ!

فَطَلَبَتْ منْهُمْ أنْ تراهُ لِتَطمئِنَّ أنَّهُ بخَيرٍ، فَأَشارُوا إليه، فلَمَّا رأَتْهُ زَالَ عنهَا حُزْنُهَا، وَحمدَتِ اللهَ ـ تَعالَى ـ وقَالَتْ: كُلُّ مُصيْبةٍ بعدَكَ جَلَلٌ (هَيِّنَةٌ).

وَلهذَا، فَالمُسلمُ يتأدَّبُ معَ الرَّسُولِ ﷺ، وَلاَ يُفَضِّلُ عليهِ أَحَداً مِنَ النَّاسِ، سَوَاءً كانَ أباً أَو أخاً أَو زَوْجاً، أَو حتَّى نفسهِ.

---

قَالَ رسُولُ اللهِ ﷺ: «لا يُؤمِنُ أَحَدُكُمْ حتَّى أكُونَ أَحَبُّ إليهِ مِنْ ولَدِهِ وَوَالده والنَّاسِ أجمعِين» [النسائي وابن ماجه].

# یەکەمجار پێغەمبەر ﷺ

دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود ئافرەتێکی موسوڵمان هاتو هەواڵی میردەکەیو براکەیو باوکی دەپرسی، بەڵام پێیان ووت: هەموویان گەیشتن بە پلەی شەهیدیو شەهید بوون، پاشان ووتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ چی بەسەر هاتووە؟ ووتیان: ئەی دایکی فلان ئەو زۆر باشەو چۆنتان پێخۆشە لە باشیدا ئەو ئاوایە. ئەوسا داوای لێکردن کە پێغەمبەری ﷺ نیشان بدەن تا دڵی ئارام بگرێت، ئەوانیش ئاماژەیان کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ، کاتێک کە بینی هەرچی خەمو ناخۆشییەکی هەبوو لاچوو، ئینجا سوپاسی خوای کردو ووتی: (ئەی پێغەمبەری خوا) هەموو موسیبەتو ناخۆشییەک لە دوای (بینینی) تۆ ئاسانە. هەر ئاوا بەم شێوەیە مرۆڤی موسوڵمان زۆر بە ئەدەب دەبێت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و فەزڵی هیچ یەکێکی لە خەڵکی نادا بەسەردا، ئیتر یەکسانە ئەو خەڵکانە باوکی یان برای یان مێردی تەنانەت خۆیشی بێت.

---

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت: (هیچ یەکێ لە ئێوە ئیمانی نیە تا وەکو منی خۆشتر نەوێت لە منداڵەکەی و دایکیو باوکیو هەموو خەڵکی بەگشتی) ((النسائی و ابن ماجة).

# الخَوفُ علَى الرَّسولِ ﷺ

كانَ طَلْحَةُ بنُ البَراءِ رضي الله عنه يُحبُّ النَّبيَّ ﷺ حُبّاً شَديداً، ويَخَافُ عليهِ من كُلِّ سُوءٍ، وذاتَ يومٍ من أيَّامِ الشِّتاءِ، زَارَ النَّبيُّ ﷺ طَلْحَةَ، وكانَ مَريضاً، وعندَ انصرافِهِ ﷺ قَالَ لأهلِ طَلْحَةَ: «لاَ أرَى طَلْحَةَ إلاَّ قَدْ حَدَثَ فيهِ الموتُ، فَآذِنُونِي بهِ حتَّى أشهدَهُ، وأُصلِّي عليهِ، وَعجِّلُوهُ».

فلَمَّا جاء اللَّيلُ، أحَس طَلْحَةُ رضي الله عنه باقترابِ أجَلِهِ، فَقالَ لأهلِهِ: أُدفنُونِي وَألحقُونِي بِربِّي عزَّ وجلَّ وَلا تَدعُوا رسُولَ الله ﷺ، فإنِّي أخافُ عليهِ اليَهودَ وكانَ طَلْحَةُ يَخافُ علَى النَّبيِّ ﷺ أنْ يُصيبَهُ اليَهودُ بأذًى أثناء اللَّيلِ.

وَبالفعلِ مَاتَ طَلْحَةُ، فَدَفنَهُ أهلُهُ وفي الصَّباحِ أخبَرُوا الرَّسُولَ ﷺ بوفَاتِهِ، فَذهبَ ﷺ إلى قَبرِ طَلْحَةَ، وَوَقَفَ ومعَهُ النَّاسُ ثمَّ رفعَ يدَيهِ يَدعُو لِطَلْحَةَ، ويَقُولُ: «اللَّهمَّ الْقَ طَلْحَةَ تضحَكُ إليهِ، وَيضحَكُ إليكَ» [الطبراني].

---

كانَ الصَّحابةُ -رَضِيَ اللهُ عَنهُمَ- يَخافُونَ علَى النَّبيِّ ﷺ خَوفاً شَديداً، ويُضَحُّونَ منْ أجلِهِ ولَو بأنفُسِهِمْ وذلكَ دَليلٌ على شِدَّةِ الأدبِ معَهُ ﷺ.

# دەترسێ کە پێغەمبەر ﷺ توشی زیان بێت

تەلحەی کوڕی بەڕرا پێغەمبەری ﷺ زۆر خۆش دەویست و زۆر لێی دەترسا کە خراپەیەکی بەسەر بهێنن، ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی زستان تەلحە نەخۆش کەوتبوو. پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ سەردانی، کاتێک کە هاتە دەرەوە بە نزیکەکانی فەرموو: وا نابینم تەلحە زیندوو بمێنێتو دەمرێت، بۆیە ئەگەر مرد ئاگادارم بکەنەوە تا ئامادەی بمو نوێژی لەسەر بکەم، ئێوەش خێرای لێبکەن.

کاتی کە شەو داهات تەلحە هەستی بە ئەجەلەکەی کرد، بۆیە دەوروبەرەکەی کۆکردەوەو پێی ووتن: (ئەگەر مردم) بمخەنە ناو گۆڕەوەو بمگەیەننە پەروەردگارم، نەکەن پێغەمبەر ﷺ ئازار بدەنو هەواڵی کۆچی منی پێبدەن، چونکە لەبەر جولەکەکان زۆری لێدەترسم شتێکی بەسەر بهێنن، (دیقەت بە) تەلحە لە نیوەی شەودا خەمی ئەوەیەتی جولەکەکان بەڵایەک بەسەر پێغەمبەردا ﷺ بهێنن!! بەڵێ ئەوەبو تەلحە مردو کەسو کارەکەی (بە نهێنیەوە) تەسپەردەی خاکیان کرد، لەبەرەبەیاندا کە هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ کەوتە ڕێ بەرەو لای گۆڕەکەیو لەسەر گۆڕەکەی لەگەڵ خەڵکیدا ڕاوەستاو دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرموی: پەروەردگارا: تەلحە بگەیەنە بە خۆت بە شیوەیەک بۆی پێبکەنیتو ئەویش بۆ تۆ پێبکەنێت.

---

هاوەڵان ﷺ لەبەرامبەر پێغەمبەردا ﷺ زۆر دەترسانو (بە چاکی پاریزگاریان لێدەکرد)و لە پێناویدا قوربانی زۆریان دەدا با بەر گیانیشیان بوبیت. کە ئەمەش گەورەترین بەڵگەی بە ئەدەب بوونە لەگەڵیدا.

# حكمُ الرَّسُولِ ﷺ

كان الزُّبَيرُ بنُ العوَّامِ رضي الله عنه يمتَلكُ أرضاً مجاوِرةً لأرضِ رجُلٍ مِنَ الأنصارِ.

وفي يومٍ مِن الأيَّامِ، تخاصم الأنصاريُّ معَ الزُّبيرِ، فذهبَا إلى النَّبيِّ ﷺ، ليحكُمَ بينَهُمَا: أيُّهُمَا يسقِي أوَّلاً، فَقالَ الرَّسُولُ ﷺ: «اسْقِ يَا زُبَيرُ، ثُمَّ أرسلِ الماء إلى جَارِكَ» ، فَغضِبَ الأنصَاريُّ، وظَنَّ أنَّ الرَّسُولَ ﷺ فَضَّلَ الزُّبَيرَ لأنَّهُ ابنُ عمَّتِه.

فَتغيَّرَ وجهُ رسُولِ الله ﷺ وقَالَ لِلزُّبَيرِ: "اِسْقِ يَا زُبَيرُ، ثُمَّ احبِسِ الماء حتَّى يرجِعَ الجَذْرُ( أي: اسْقِ حتَّى يَصِلَ الماءُ إلى أُصولِ النَّخلِ)" [ متفق عليه].

ثُمَّ نَزلَ قَولُ الله تَعالَى: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ [ النساء:٦٥].

---

الأَدَبُ مع الرَّسُولِ ﷺ يَتطلَّبُ طاعتَهُ والرِّضَا بحُكْمِه، وتَنفيذَ تَعاليمِه، وَالاقتداء به. يَقولُ تَعالَى: ﴿مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ [ النساء:٨٠].

٨

# بڕیاری پێغەمبەر ﷺ

زوبەیری کوڕی عەوام رضي الله عنه خاوەن زەوییەک بوو کە زەوی تەنیشتیشی دراوسێیەکی ئەنصاری خاوەنی بوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان زوبەیرو ئەو پیاوە ئەنصارییە بوو بە دەمەقاڵێیان لەسەر ئەوەی کە کامیان یەکەمجار زەوییەکەی ئاو بدات، بۆیە ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ تا داوەرییان بکات،

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: زوبێر تۆ مەزراکەت ئاودەو دوای ئەوە ئاوەکە بەردە بۆ دراوسێکەت.پیاوە ئەنصارییەکە تورە بوو ڕقی هەستا، چونکە وای دەزانی پێغەمبەرﷺ ڕێزی زوبێری داوە بەسەر ئەودا لەبەر ئەوەی کە پورزایەتی. ڕەنگی پێغەمبەر ﷺ تێکچوو، ئەوسا بە زوبێری فەرموو: ئەی زوبێر مەزراکەت ئاودەو دوای ئەوە دوا ئاوەکە بگرەوە با بگەڕێتەوە بۆ پەنگاوەکان. (متفق عليه). پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿سوێند بێت بە خوا باوەڕتان تەواو نیە هەتا تۆ دەکەن بە حەکەم لە هەموو ئەو ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا پەیدا دەبیٚو گوێڕایەڵی تۆ دەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵو دەرونیاندا هیچ نارەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر بەوەی کە داوەریت لەسەر کردووەو دەبێت بە تەواوی تەسلیم بنو ڕازی بن﴾ (النساء ٦٥).

---

بە ئەدەب بوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ داخوازی ئەوەمان لێدەکات کە گوێڕایەڵی بینو ڕازیش بین بە بڕیارەکانیو فەرمانەکانیشی بە چاکی جیبەجێبکەینو شوێنی بکەوین. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەرﷺ بکات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای گەورەی کردووە﴾ (النساء ٨٠).

# الأَعرابُ وَالرَّسُولُ ﷺ

جَـاءتْ جَماعَـةٌ مِـنَ الأَعْـرابِ إلى رسُـولِ اللهِ ﷺ، ووَقَفُوا أمامَ حُجْرَتِهِ، وظلُّوا يُنادُونَـهُ بصَـوتٍ عـالٍ لِيَخـرُجَ إليهِمْ: يَا محمَّدُ..يَا محمَّدُ [الطبراني].

فَأنزلَ اللهُ سُبحانَهُ وتَعالَى قولَهُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحجرات: ٤ ـ ٥].

وذلكَ لِيَعْلَمَ المُسلِمُونَ كيفَ يُنادُونَ الـنَّبيَّ ﷺ مُراعـاةً لمَكَانَتِهِ، فَهُوَ نَبيُّ اللهِ عزَّ وجلَّ وليسَ مُجرَّدَ بشَرٍ عَاديٍّ.

ونحـنُ إذَا تَكلَّمْنَـا عَـنِ الـنَّبيِّ ﷺ، فَعلَيْنَـا أَنْ نـتكَلَّمَ بصَوتٍ خَفيضٍ، مُتأدِّبينَ بأدَبِ الصَّحابَةِ فِـي تَعـامُلِهِمْ مـعَ النَّبيِّ ﷺ.

---

أَمرَنَا اللهُ سُبحانَهُ وتَعالَى أَنْ نتأدَّبَ معَ النَّبيِّ ﷺ، ونُعامِلَهُ مُعامَلَـةً فِيهَـا تَنزيهٌ لشَخْصِهِ ﷺ تَختَلفُ عَنْ مُعامَلَةِ أيِّ فَرْدٍ عاديٍّ.

# دەشتەکییەکان و پێغەمبەر ﷺ

کۆمەڵێک خەڵکی عەرەبی دەوارنشین چوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، لەبەردەم ماڵیدا وەستان و بەدەنگی بەرز بانگیان دەکرد: ئەی محمد. .ئەی محمد... تا هاتە دەرەوە بۆ لایان ((الطبراني)).

بۆیە لە لایەن پەروەردگارەوە ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ۝ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝﴾(الحجرات ٤-٥). واتە:

بەراستی ئەوانەی لە دەرەوەی ژوورەکان بانگت دەکەن، ئەوانە زۆربەیان نەفامن و ژیری وەرناگرن (چونکە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی دروستیان لەو بوارەدا ڕەچاو نەکراوە). خۆ ئەگەر ئەوانە خۆڕاگر بونایە، تا دەچویتە دەرەوە بۆ لایان، ئەوە چاکترو ڕەوانتر بوو بۆیان، خوا لێخۆش بوو میهرەبانە. بۆیە دەبێ موسوڵمانانیش بزانن چۆن بانگی پێغەمبەر ﷺ دەکەن و ڕەچاوی ڕێزو گەورەیی بکەن چونکە ئەو مرۆڤێکی ئاسایی نیە بەڵکو ئەو نێردراوو پێغەمبەری خوایە. هەروەها پێویستە ئێمەش کاتێک قسە دەکەین لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ بە دەنگی هێمن و لەسەر خۆ بدوێین، وەکو مامەڵەی هاوەڵان بە ئەدەب بین و ڕێزی فەرامۆش نەکەین.

---

خوای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات کە بە ئەدەب بین لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و بە شێوەیەکی زۆر جیاواز لە خەڵکانی تر مامەڵەی لە بەرامبەردا بنوێنین.

# الحُبُّ النَّافِعُ

جَاءَ رَجلٌ إلى رسُولِ اللهِ ﷺ فَسألَهُ عن وقتِ يَومِ القيامة، وقَالَ لَهُ: متَى السَّاعةُ؟

فَقالَ لَهُ النَّبيُّ ﷺ: «ومَا أعدَدْتَ لهَا؟».

فَقالَ الرَّجلُ: لا شيءَ، إلاَّ أنِّي أُحِبُّ اللهَ ورَسولَهُ.

فَقالَ لَهُ النَّبيُّ ﷺ «أنتَ مع مَنْ أَحبَبْتَ» [متفق عليه].

فَفرِحَ الصَّحَابةُ بهذَا الحديثِ فَرَحاً عَظيماً لِحُبِّهِمُ الشَّديدِ لِرسُولِ اللهِ ﷺ ورَغبتِهِمْ فِي أنْ يكونُوا معَهُ فِي الجنَّةِ.

وَيجِبُ علَى المُسلِمِ أنْ يُترجِمَ حُبَّهُ لِلرَّسُولِ ﷺ إلى واقِعٍ عَمَليٍّ، فَيُحوِّلَ أقوالَهُ وأفعالَهُ إلى سُلوكٍ طيِّبٍ يَمشِي بهِ بينَ النَّاسِ.

---

منْ علامَاتِ حُبِّ المُسلِمِ للنَّبيِّ ﷺ الاقتداءُ بأقوالِهِ وأفعالِه، قَالَ تَعالَى: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ [آل عمران: ٣١].

# خۆشەویستی بەسود

پیاوێک چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێکرد دەربارەی هاتنی ڕۆژی قیامەت وتی: کەی قیامەت بەرپا دەبێ؟ پێغەمبەریش ﷺ لە وەڵامیدا فەرموی: چیت بۆ ئامادە کردووە؟ کابراش ووتی: هیچ شتێک تەنها ئەوە نەبێت کە بەڕاستی من خواو پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدای (لە ڕۆژی دوایدا) کە خۆشت ئەوێت. ((متفق علیه)). هاوەڵان زۆر زۆر بەم فەرمودەیە دڵخۆش و شادمان بوون، چونکە ئەوان بە ڕاستی و بە چاکی پێغەمبەری خوایان ﷺ خۆش دەویست، وە ئومێدو هیوای زۆریشیان هەبوو کە لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا بن.

پێویستە لەسەر مرۆڤی موسوڵمانیش خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی ڕۆژانەیدا ڕەنگ بداتەوەو قسەو کرداری وەکو هی ئەو سەنگین بێت‌و لە نێوانی خەڵکیدا پێیانەوە بڕوات بە ڕێگادا...

---

یەکێک لە نیشانەکانی خۆشەویستی موسوڵمان بۆ پێغەمبەرﷺ بریتی یە لە شوێن کەوتنی وتەو کردارەکانی، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون‌و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەو کاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت‌و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت.

# أَصحَابُ الرَّسُولِ

وقَــعَ الصــحَابيُّ الجَلِيــلُ زَيــدُ بــنُ الدَّثِنَّــةِ في أَسْــرِ المُشركينَ، ولَمَّا همُّوا بقَتلـه قَـالَ لـهُ أبـو سُـفيانَ: أُنشـدُكَ (أستَحلفُكَ) بـالله يَـا زَيـدُ! أَتُحِـبُّ أنَّ مُحمَّـداً الآنَ عِنـدَنَا مكانَكَ نَضرِبُ عُنُقَهُ، وأنتَ فِي أَهلِكَ؟

فَقالَ زَيدٌ: والله! مَا أُحِـبُّ أَنَّ مُحمَّـداً الآنَ فِـي مكانِـهِ الذِي هُوَ فيهِ تُصيبُهُ شَوكةٌ تُؤذِيهِ، وَأَنِّي جَالِسٌ فِي أَهلِي.

فَقالَ أبو سُفيَانَ: مَا رأيتُ مِنَ النَّاسِ أَحَداً يُحِبُّ أَحَـداً كَحُبِّ أَصحَابِ مُحمَّد مُحمَّداً! [البيهقي].

وهُنَا تَتجَلَّى مَحبَّةُ النَّبيِّ ﷺ وَمكانَتُهُ السَّامِيَةُ فِـي قُلـوبِ أَصحَابِهِ وتَابِعيهِ، وَتَتَّضِحُ قِمَّةُ التَّأَدُّبِ معَ النَّبيِّ ﷺ فِي إِيثَـارِهِ وَتفضِيلِهِ على النَّفسِ. ولِكَيْ نَتَأَدَّبَ معَ النَّبيِّ ﷺ، فَلاَ بُـدَّ أَنْ نَبذُلَ قُصَارَى جَهدِنَا، حتَّى وَلَو تطَلَّبَ منَّا ذلكَ بَذْلَ الرُّوحِ

---

مِنْ علامَاتِ الإيمانِ القَويِّ أَنْ يُضَـحِّيَ المُسـلِمُ بنَفسِـهِ وأهلِـهِ ومالِـهِ طَاعةً للهِ وحُبَّاً لِرَسولِ الله ﷺ

# هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

کاتی هاوەڵی بەڕێز (زید بن الدثنة) کەوتە بەردەستی بێباوەڕان‌و بەدیل گرتیان، ئەبو سوفیان لێی پرسی: سوێندت دەدەم بەخوا ئەی زەید!ئایا حەز دەکەیت موحەمەد لەم شوێنەی تۆدا بێت‌و ئێمە لەملی بدەین‌و تۆش لە ناو ماڵ‌و منداڵی خۆتا بیت؟ زەیدیش ووتی: سوێند بەخوا حەزناکەم موحەمەد (ﷺ) دڕکێك ئازاری بدات لە شوێنی خۆیداو منیش لە ماڵەوە دانیشتبم. بۆیە ئەبو سوفیانیش ووتی: هەرگیز لە ناو خەڵکیدا کەسێکم نەبینیوە کەسێکی خۆش بوێت بەو شێوەیەی هاوەڵانی موحەمەد کە موحەمەدیان خۆش دەوێت. ((البیهقی)).

ئالێرەدا خۆشەویستی‌و گەورەیی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێت لە ناو دڵی هاوەڵان‌و شوێنکەوتوانیدا، وە ئەو پەڕی گیان فیدایی هاوەڵان دەردەکەوێت با ئەگەر لە دەستدانی ژیان‌و گیانیشیان بێت، بۆ ئەوەی ئێمەش بە ئەدەب بین لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەبێ هەموو توانامان فیدا بکەین، ئیتر با ئەو شتە داواکردنی گیان‌و ڕۆحیشمان بێت..

---

لە نیشانەکانی ئیمانی بەهێزو تەواو: ئەوەیە کەسی موسوڵمان خۆیی‌و ماڵ‌و منداڵ‌و سەروەتی بکاتە فیدای گوێڕایەڵی خواو خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ.

# طَاعةُ الرَّسُولِ

ذاتَ يَومٍ، أكَل رجُلٌ عندَ رسُولِ الله ﷺ بيَدهِ اليُسرَى، فَقالَ لهُ النبَّيُّ ﷺ: «كُلْ بيَمِينكَ» فَتكَبَّرَ الرَّجلُ وقَالَ: لا أَستطِيعُ

وكَانَ الرَّجلُ يَستطِيعُ الأَكلَ بيَمينِه، لكنَّهُ لَمْ يُنفِّذْ أمْرَ رَسُولِ الله ﷺ، فَقالَ لهُ رَسُولُ الله ﷺ: «لاَ استَطَعْتَ».

فَأُصِيبَ الرَّجُلُ بِالشَّلَلِ فِي يَدهِ، ولَمْ يَستَطِعْ رَفْعَهَا إلى فَمِهِ، عُقوبَةً لهُ على مخالَفة أَوامرِ الرَّسُولِ ﷺ. [مسلم].

فَالمُسلِمُ يُطِيعُ الرَّسُولَ ﷺ، ويَرَى في طاعَتِه الفَلاَحَ والنَّجَاحَ قَالَ ﷺ: «دَعُونِي مَا تَركتُكُمْ، إنَّما أهلَكَ مَن كانَ قبْلَكُمْ كثْرَةُ سُؤَالِهِمْ واختلاَفِهِمْ علَى أنبيائِهِمْ، فإذَا نَهَيْتُكُمْ عَن شَيءٍ فَاجتَنِبُوهُ، وإذَا أمرتُكُمْ بأمرٍ فَأتُوا مِنْهُ مَا استَطَعتُمْ» [متفق عليه].

---

يُحذِّرُ الله سُبحانَهُ مِنْ مخالَفةِ الرَّسُولِ ﷺ، فيَقولُ تَعالَى: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [النور: ٦٣].

# گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ

ڕۆژێک پیاوێک لە خزمەتی پێغەمبەرداﷺ بە دەستی چەپی شتی دەخوارد، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: بەدەستی ڕاست بخۆ، پیاوەکەش بە فیزەوە ووتی: ناتوانم، لە کاتێکدا دەشی توانی، بەڵام فەرمانەکەی پێغەمبەری ﷺ جیبەجی نەکرد، پێغەمبەریشﷺ پێی فەرموو: ((هەر نەتوانی)) وەک سزایەک بۆ شکاندنی گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ ئەو دەستەی توشی نەخۆشی بوو، بە شێوەیەک کە نەیدەتوانی بەرزی بکاتەوە بۆ لای دەمی.((مسلم)).

مرۆڤی موسوڵمان گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەکات، چونکە دەزانێت سەرکەوتن و سەرفرازی هەر لەوەدایە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لێم گەڕێن لەو شتانەدا کە وازم هێناوە بۆتان، بەڕاستی ئەو شتەی ئومەتەکانی پێش ئێوەی لە ناو برد زۆر پرسیارکردنیان و لە فەرمانی پێغەمبەران دەرچونیان بوو. بۆیە هەر شتێ ڕێگریم لێکردن لێی دوور بکەونەوەو، ئەوەشی فەرمانم پێکردن بە گوێرەی تواناتان ئەنجامی بدەن. ((متفق علیه)).

---

خوای گەورە ئاگاداری دەدات لەسەرپێچی کردنی پێغەمبەرﷺ و دەفەرموێت:
﴿ دەبا ئەوانەی کەسەرپێچی لە فەرمانی دەکەن بترسن لەوەی کە توشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت، یان توشی سزایەکی بە ئێش بن﴾

# اتِّباعُ الرَّسُولِ

ذات يومٍ، كانَ الرَّسُولُ ﷺ يخطُبُ علَى المِنْبَرِ، وجاءَ عبدُ اللهِ بنُ رَوَاحَةَ رضي الله عنه لِيدخُلَ المَسجِدَ، وَقبلَ أَنْ يَدخُلَ سمعَ الرَّسُولَ ﷺ يقولُ: "اجلسُوا"

فَجلسَ في مكانِهِ خارِجَ المَسجدِ حتَّى فرَغَ النَّبيُّ ﷺ مِن خُطبَتِهِ.

ولمَّا عَلِمَ النَّبيُّ ﷺ بِمَا فعَلَ عبدُ اللهِ بنُ رَوَاحَةَ، دعَا لهُ بخيرٍ وَقالَ لهُ: «زَادَكَ اللهُ حِرْصاً علَى طَوَاعِيَةِ اللهِ وَطَوَاعِيَةِ رَسُولِهِ» [البيهقي].

فَقَدْ كَانَ الصَّحابةُ ـ رِضوانُ اللهِ عَليهِمْ ـ يَلتزِمُونَ بِأوامرِ النَّبيِّ ﷺ وَلا يَتَعدُّونَ ذلكَ بقَولٍ أَو فِعلٍ.

قَالَ تَعالَى: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ [الأحزاب:٣٦].

---

يَقولُ اللهُ سُبحانَهُ وتَعالَى: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ [الأحزاب:٢١].

# شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە وتاری دەدا، لەو کاتەدا (عبداللە بن رواحة) بەرەو مزگەوت دەهات تا بچێتە ژورەوە، بەڵام پێش ئەوەی بچێتە ناو مزگەوتەکەوە پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەیدا فەرموی: دانیشن.

خێرا عبداللە لە دەرەوەی مزگەوتو لە شوێنی خۆیدا دانیشت تا پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەی تەواو بوو. کاتێک پێغەمبەر ﷺ بەم هەڵوێستەی (عبداللە) ی زانی دوعای خێری بۆ کردو فەرموی: یاخوا پەروەردگار زیاتر دامەزراویو ڕاوەستاویت پی ببەخشێت لەسەر گوێڕایەڵی خۆیو پێغەمبەرەکەی. ((البیهقی)).

هاوەڵان ﷺ ئاوا پەیوەست بوون بە فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەرگیز چ بە قسەو چ بە کردەوە سنورەکانیان نەدەبەزاند. پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە کاتێک خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن، ئەوان سەرپشک بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە بەڕاستی بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە﴾(الاحزاب ٣٦).

---

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا چاکترین نمونەی تەواوو ڕێکو پێک هەیە تا چاوی لێبکەنو شوێنی بکەون، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشەو بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەنو زمانیان پاراوە بە یادی ئەو﴾(الاحزاب ٢١).

# الشَّهادَةُ الصَّادِقَةُ

اشتَرَى الرَّسُولُ ﷺ فَرَسًا مِنْ أعرابيٍّ، وَطلَبَ مِنْهُ أن يتَّبعَهُ ليأخُذَ الثَّمنَ، فَتأخَّرَ الأعرابِيُّ فِي الطَّريقِ، وقَابَلَ رَجُلاً طلَبَ منْهُ شِراء الفرسِ، وَزَادَ في ثمنِه وهُوَ لاَ يَعرِفُ أنَّ الرسُولَ ﷺ اشتَرَاهُ، فَنادَى الأعرابيُّ الرَّسولَ ﷺ: «إنْ كُنْتَ مُبْتاعاً (مُشتَرِياً) هذَا الفرس فَابتَعْهُ (اشتَرِه) وَإلاَّ بِعتُهُ».

فَذكَّرَهُ النَّبيُّ ﷺ بمَا دارَ بينَهُمَا، فَأنكَرَ الأعرابيُّ، وَطلَبَ مَنْ يَشْهَدُ على ذلكَ، فَجاء خُزَيْمَةُ بنُ ثَابتٍ الأنصَاريُّ، وَقالَ: أنَا أشهَدُ أنَّكَ قَدْ بَايَعْتَهُ.

فَقالَ ﷺ: «يَا خُزَيْمَةُ! بِمَ تَشْهَدُ ولَمْ تكُنْ مَعَنا؟».

فَقالَ: يَا رسُولَ اللهِ! أنَا أُصَدِّقُكَ بخبَرِ السَّماءِ؛ أفَلا أُصَدِّقُكَ بمَا تَقولُ؟

فَجعَلَ الرَّسُولُ شَهَادةَ خُزَيْمَةَ بِشَهَادةِ رَجُلَيْنِ. [ابن سعد].

---

الأدَبُ معَ الرَّسُولِ ﷺ يَفرِضُ علينَا العمَلَ بحديثِه وتبليغَهُ إلى النَّاسِ. قَالَ ﷺ: «نَضَّرَ اللهُ امرِءاً سمع منَّا حَديثاً فبلَّغَهُ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ» [ابن ماجه].

# شایەتییەکی ڕاستگۆیانە

جارێکیان پێغەمبەر ﷺ ئەسپێکی لە کابرایەکی دەشتەکی کڕی، پاشان داوای لە پیاوەکە کرد کە شوێنی بکەوێت تا پارەکەی بداتێ، پیاوە دەشتە کیەکەش لە ڕێگادا دوا کەوت تا ئەوەبوو کەسێکی تری بۆ ڕێکەوت‌و داوای فرۆشتنی ئەسپەکەی لێکردو نرخێکی زۆریشی پێدا، بەڵام نەیدەزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەسپەکەی کڕیوە، کابرای خاوەن ئەسپیش بانگی پێغەمبەری ﷺ کردو ووتی: تۆ ئەگەر کڕیاری ئەم ئەسپەی وەرە بیکرەو پارەکەیم بدەرێ، ئەگینا فرۆشتوومە. پێغەمبەریش ﷺ بیری کابرای خستەوە کە مامەڵەو پەیمانێک هەبووە لە نیوانماندا، بەڵام کابرای دەشتەکی نکۆڵی لێکردو داوای شاهێدی کرد. لەو کاتەدا خوزەیمەی کوڕی سابیتی ئەنساری هات‌و ووتی: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) من شاهێدی دەدەم کە تۆ ئەم ئەسپەت کڕیوە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی خوزەیمە چۆن شاهێدیم بۆ دەدەیت خۆ تۆ لەگەڵمان نەبویت؟ خوزەیمەش ووتی: ئەی نێردراوی خوا من بە ڕاستگۆت دەتەنێم ئەگەر هەواڵی ئاسمانیشم پێبدەی، جا چۆن بە ڕاستگۆت نەزانم بەوەی کە دەیڵێیت؟ بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ خوزەیمەی کرد بە شاهێدی خۆی‌و لە جێی دوو شاهێد داینا. ((ابن سعد)).

---

بە ئەدەب بوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ فەرمانمان پێدەکات کە کار بکەین بە فەرمودەکانی‌و بیگەیەنن بە خەڵکی. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خوا ڕوی ئەو کەسە گەشاوە بکات کە لە ئێمەوە گوێی لە ووتەیەک دەبێ‌و دەیگەیەنێ، چونکە زۆر کەس کە پێی دەگات هۆشیارترە لە بیسەر) (ابن ماجة).

# غِيرَةٌ علَى الرَّسُولِ

يُحْكى أنَّ بعض الأولاد كَانُوا يَلعَبُونَ بالصَّوَالجَة (العصي المعْوَجَّة)، وكانَ رجُلٌ منَ الكفَّارِ قَاعداً، فوقَعَتِ الكُرَةُ علَى صَدْرِه، فَأخَذَهَا.

وَذهَبَ الأولادُ إليهِ، ليَطلُبُوهَا منْهُ، فَرَفَضَ أنْ يُعطيَهَا لَهُمْ، وَأمامَ إصرارِ هذَا الرَّجُلِ الكافرِ علَى ألاَّ يُعطيَهُمُ الكُرَةَ، فكَّرَ أحَدُ الأولاد في فكْرَة تجعَلُهُ يُعيدُ الكُرَةَ إليهِمْ، فَذكَّرَهُ برسول الله ﷺ وَأقسم عَليهِ أنْ يُعيدَهَا لَهُمْ فَرَفَضَ الرَّجُلُ، وسبَّ رسولَ الله ﷺ

غَضِبَ الغلمَانُ غَضباً شَديداً، وهجَمُوا علَى الرَّجُلِ، وَضَربُوهُ بِصَوَالِجِهِم حتَّى مَاتَ.

ولمَّا وصَلَ الخبَرُ إلَى أميرِ المُؤمنينَ عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه فَرِحَ بمَا فعلَهُ الأولادُ فَرَحاً كَبيراً وقالَ: الآنَ عَزَّ الإسلامُ، إنَّ أطفَالاً صِغَاراً شُتِمَ نَبيُّهُمْ، فَغَضِبُوا لَهُ وانتَصَرُوا. وَأهْدَرَ عُمَرُ دَمَ الرَّجُلِ الكَافرِ

---

المُسلمُ يُكثِرُ منَ الصَّلاة على النَّبيِّ ﷺ، قَالَ تَعالَى ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا﴾ [الأحزاب:٥٦].

# پەرۆشی بۆ پێغەمبەر ﷺ

دەگێڕنەوە هەندێ منداڵ بە داری خوار یارییان دەکرد، پیاوێکی بێباوەڕیش لەیان ڕاوەستا بوو، لە ناکاو تۆپەکەیان کێشای بەسەر سنگی ئەو بێباوەڕەداو تۆپەکەی گرت. منداڵەکانیش چوونە لای تا داوای تۆپەکەیانی لێبکەن، بەلام پیاوەکە بەپەرچی دانەوە کە بۆیان بگەڕێنێتەوە، یەکێ لە منالەکان بیری کردەوە ئەوەی بە بیرهێنانەوەی پێغەمبەر ﷺ پیاوەکە تۆپەکەیان بۆ دەگەڕێنێتەوە، ئەوەبوو وای کردو سوێندی کابرایدا کە تۆپەکەیان بۆ بگەڕێنێتەوە، بەلام کابرا داواکەی قبوڵ نەکردو جوێنیشی دا بە پێغەمبەر ﷺ، منالەکانیش زۆر تووڕە بوون و هێرشیان کردە سەر کابراو بە دارەکانیان لێیاندا هەتا کوشتیان.

کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە ئەمیری ئیمانداران (عومەری کوڕی خەتاب) زۆر زۆر دڵخۆش بوو، ئەوسا فەرمووی: ئێستە ئیسلام خاوەنی هێزە، منداڵانێك قسە بە پێغەمبەرەکەیان بووترێت، تووڕە ببن و سەری بخەن. ئەوە عومەریش خوێنی کابرای کافری بە فیڕۆ دانا.

---

مرۆڤی موسوڵمان زۆر سەلاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، خوای گەورە دەفەرموێت: ابەڕاستی خواو فریشتەکانی سەلاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئێوەش سەلام و سلاواتی لەسەر بدەن و (بەردەوام یادی خێری بکەن).

# حُبُّ الرَّسُولِ

يُرْوَى أنَّ رجُلاً جَاء إلى النَّبي ﷺ فَقالَ لَـهُ يـا رسُـولَ اللهِ! إنَّكَ لأَحَـبُّ إلي مـنْ نفْسـي، وإنَّـكَ لأَحَـبُّ إليَّ مـنْ وَلَدِي، وإنِّي لأَكُونُ فِي البَيتِ فَأذْكُرُكَ؛ فمَا أصبِرُ حتَّى آتِي فَـأنظُرَ إليـكَ، وإذَا ذكَـرْتُ مَـوتِي وَموتَـكَ عَرَفْـتُ أنَّـكَ إذَا دَخَلْتَ الجَنَّـةَ رُفِعْـت مـعَ النَّبـيين، وأنِّـي إذَا دَخَلـتُ الجنَّـةَ خَشِيتُ أنْ لاَ أرَاكَ.

فَلَمْ يَرُدَّ عَليـهِ الـنَّبيُّ ﷺ بِشـيءٍ، فَنـزَلَ جِبريـلُ عليـه السـلام بقـولِ اللهِ تَعـالَى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا﴾ [النساء:٦٩].

فَدعَا الرَّسُولُ ﷺ الرَّجُلَ، وتَلاَ عَليهِ الآيَةَ. [الطبراني].

---

يُقالُ بعدَ الأَذانِ: اللَّهمَّ رَبَّ هذه الدَّعوَةِ التَّامَّةِ، والصَّلاَة القائمَـةِ، آتِ مُحمَّداً الوَسِيلةَ والفَضِيلةَ، وابعَثْهُ مَقاماً مَحموداً الذي وعَدْتَهُ، إنَّـكَ لا تُخلِفُ المِيعَادَ.

# خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

دەگێرنەوە پیاوێک چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی نێردراوی خوا بەڕاستی من تۆم خۆشتر دەوێت لە خۆمو منداڵەکەشم، هەر کاتێکیش لە ماڵ باسی تۆ بکەم خۆم ناگرم هەتا نەیەمو تەماشات نەکەم، کاتێکیش بیر لە مردنی خۆمو مردنی تۆ دەکەمەوە دەزانم تۆ لە پلە بەرزەکانو لەگەڵ پێغەمبەراندا دەبیتو منیش لە پلە نزمەکاندا) بۆیە زۆر دەترسم نەتبینم؟! پێغەمبەر ﷺ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە تا ئەوەبوو جبریل (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە لایەن خواوە ئەم ئایەتەی هێنا: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾(النساء ٦٩). واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) کە خوا نازو نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵو هاوڕێو هاودەمێکی چاکو بێ وێنەن. پاشان پێغەمبەریش ﷺ پیاوەکەی بانگ کردو ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە (الطبرانی).

---

لە دوای بانگدان سوننەتە بوترێت: پەروەردگارا: ئەی خاوەنی ئەم بانگەوازە ڕێکو تەواوەو نوێژی ڕاوەستاو ئەنجامدراوە، ببەخشە بە موحەمەد ﷺ شوێنە بە فەرو ڕێزدارەکەی وەسیلەو فەزیلە (کە دوو پلەی بەرزن لە قیامەتدا) وە بەو بەخششە شوێنی سوپاسکراو کە بەڵێنت پێی داوە، بەڕاستی تۆ هەرگیز پەیمان شکێن نیت.

# الأَدَبُ معَ الرَّسُولِ ﷺ

المُسلِمُ يُؤمِنُ برِسالة النَّبيِّ ﷺ وبأنَّهُ خَاتَمُ الأنبيَاءِ وَالمُرسَلِينَ، أَرسَلَهُ اللهُ إلى النَّاسِ أجمعينَ، فَبلَّغَ الرِّسالةَ، وَأَدَّى الأَمَانَةَ، وجَاهَدَ في سبيلِ اللهِ حتَّى توَفَّاهُ اللهُ.

والمُسلمُ يُحبُّ رسُولَ الله ﷺ، وينفِّذُ أوامرَهُ وَلا يُخالفُهُ، وَيطَبِّقُ سُنَّتَهُ، كمَا أَنَّهُ يتَّخذُ مِن حياة الرَّسُولِ ﷺ وسِيْرَته الأُسْوَةَ والقُدْوَةَ، فيَتَخَلَّقُ بأخلاقه، وَيتَأدَّبُ بآدابِه، يَقولُ تَعالَى: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ [الأحزاب: ٢١].

وَفي هذَا الكتابِ بعضُ القِصَصِ التِي نَتعلَّمُ مِنْ خِلالِهَا كيفَ يكُونُ المُسلمُ مُتأدِّباً مع رسُولِ اللهِ ﷺ، حتَّى نَحْظَى بشَفَاعَته، وَنَنالَ رِضَاهُ؛ فَنكُونَ معَهُ في الجنَّةِ، يَقولُ ﷺ: «كلُّ أُمَّتي يَدخُلُونَ الجنَّةَ إلاَّ مَنْ أَبَى (رفَض وَامتَنَعَ)» قِيلَ: ومَنْ يَأْبَى يَا رسولَ الله؟ قَالَ ﷺ: «مَنْ أطَاعَنِي دَخَلَ الجنَّةَ، ومَنْ عَصَانِي فقَدْ أَبَى» [البخاري].

* * * * *

# بە ئەدەب بوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ

مرۆڤی موسوڵمان باوەڕی تەواوی هەیە بە پەیامی پێغەمبەرﷺو بە کۆتا پێغەمبەرو نێردراوی خوای دەزانێت، ئەو پێغەمبەرەی خوا ڕەوانەی کردووە بۆ هەموو خەڵکیو پەیامو ئەمانەتی خوای ڕاگەیاندووە بە هەموو خەڵکیو، هەتا ڕۆژی وەفاتی تێکۆشاوە لە پێناوی خوادا.

بۆیە مرۆڤی موسوڵمانیش زۆری خۆش دەوێتو فەرمانەکانی جێبەجێ دەکاتو هەرگیز سەرپێچی ناکات، هەروەها مرۆڤی موسوڵمان لە ژیانی ڕۆژانەیدا پێغەمبەر ﷺ دەکاتە پێشەواو ڕابەری خۆیو ژیانی ئەو لە ژیانیدا پەیڕەو دەکاتو شوێن ڕەوشتو ئاکارە بەرزەکانی دەکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سوێند بە خوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو ڕێکو پێک هەیە تا چاوی لێبکەنو شوێنی بکەون، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشەو بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەنو زمانیان پاراوە بە یادی ئەو﴾(الاحزاب ۲۱).

ئێمەش لەم کۆمەڵە چیرۆکەی ناو ئەم پەرتوکەوە فێری ئەوە بوین کە مرۆڤی موسوڵمان چۆن دەبێت بە ئەدەب بێت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەتا بەر تکای بکەوێتو ڕەزامەندی ئەو بەدەست بهێنێت، تاوەک لە بەهەشتیشدا لەگەڵیدا بێت، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: هەموو ئومەتەکەم دەچنە بەهەشت مەگەر کەسێک پشت هەڵبکات،وترا: جا کێ هەیە پشت لە بەهەشت بکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ!!؟ فەرموی: هەرکەس گوێڕایەڵی من بکات دەچێتە بەهەشت، هەرکەس بێفەرمانیم بکات ئەوە پشتی هەڵکردووە. (البخاري)

# ئادابی خواردن و خواردنەوە

نوسینی: احمد محمد حسن

وەرگێڕانی: ناصح محمد شارباژێڕی

# النَّبيُّ والأعرابيُّ

ذات يوم، أراد النَّبي ﷺ أنْ يدْعُوَ أصحابَهُ إلى تناولِ الطعامِ معَهُ إكراماً لهُم، وتواضُعاً منْهُ، فأمَرَ خادمتَهُ سلْمَى أنْ تُعدَّ طعاماً، وذهب النَّبي ﷺ يَدعُو أصحابَهُ ليأكلُوا معَهُ.

وتناوَلَ رسولُ الله ﷺ والصَّحابةُ - رضِي اللهُ عَنْهم - الطَّعامَ حتَّى شَبعُوا، وتَبَقَّى بعضُهُ.

فمر رجلٌ من الأعرابِ عَلى رسولِ الله ﷺ، فدَعَاهُ النَّبيُّ ﷺ إلَى تَناولِ الطَّعامِ، فجَاء الأعرَابِيُّ، وجَلس وأخَذَ الطَّعامَ كُلَّهُ بيَده، ولَمْ يُسم الله تعالَى ﷺ.

فأمَرَهُ النَّبي ﷺ أنْ يَضعَ الطَّعامَ، ثُمَّ قالَ لَهُ «سَمِّ الله، وكُلْ مِنْ أدنَاهَا» (أي مِنْ أقربِهَا لكَ ومِنْ أمَامِكَ).

فاستَجاب الأعرابِيُّ لأمْرِ النَّبي ﷺ، فشَبِعَ، وتبَقَّى جُزْءٌ منَ الطَّعامِ. [الطبرانِيّ].

---

المُسلمُ يُسمي الله قبل أنْ يأكُل، قالَ رسولُ الله ﷺ «إذَا أكل أحَدُكُم فليَذكرِ اسم الله تعالَى، فإنْ نَسِي أنْ يَذْكُرَ اسم الله تعالَى فِي أوَّلِه فلْيَقُلْ بِسْمِ الله أوَّلَهُ وآخِرَهُ» [أبُو داود].

# پێغەمبەرﷺ و کابرای دەشتەکی

ڕۆژێک پێغەمبەری خواﷺ وەک ڕێز گرتنێک لە هاوەڵانی ویستی بانگیان بکات بۆ میوانداریەک، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانی بە (سەلما) ی خزمەتکاری کرد کە خواردن ئامادە بکات و پێغەمبەر یشﷺ ڕۆیشت بۆ ئەوەی هاوەڵان بانگ بکات بۆ سفرەو خوانەکە، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان ﷺ) نانیان خوارد و تێر بوون و کەمێک خواردن مایەوە لەو کاتەدا کابرایەکی دەشتەکی بەلایاندا تێپەڕ بوو پێغەمبەریشﷺ بانگی کرد بۆ نان خواردن، کابرا هات و خواردنەکەی هەموو بە دەستەوە گرت و ناوی خوای نەهێنا و دەستی بە خواردن کرد پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کرد فەرمووی:

خواردنەکە دابنێ و پاشان ناوی خوا (بسم الله) بکەو لەو جێگەوە دەست بە خواردن بکە کە لێت نزیکە واتە: لە بەردەمی خۆتەوە، کابراش گوێی بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەرﷺ گرت و تێری خوارد و هێشتا خواردن هەر مایەوە الطبرانی)

---

موسڵمان (بسم الله) دەکات پێش ئەوەی نان بخوات، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ئەگەر یەکێک لە ئێوە نانی خوارد با (بسم الله) بکات، ئەگەر بیری چو ناوی خوای گەورە بهێنێت لە سەرەتادا، با کە بیری کەوتەوە بڵێت (بسم الله أوله و اخره) (ابو داود).

# أكْلٌ لا يُشْبِعُ

كان رسولُ الله ﷺ يعلِّمُ أصحابَهُ ـ رضي الله عنهم ـ آداب الطَّعامِ والشَّرابِ، ويحرِصُ علَى أنْ يُوَجِّهَهُمْ إلَى كُلِ ما يَنْفَعُهُم فِي دِينِهِم ودُنْياهُمْ؛ صَغيراً كانَ أو كَبيراً.

وفِي يَومٍ مِن الأيَّامِ، جاءَ جَماعةٌ مِنْ أصحَابِ النَّبِي ﷺ يشكُون إليه أنَّهُم يأكُلونَ ولاَ يشبَعُونَ، فقالُوا: يا رسولَ الله، إنَّا نأكُلُ ولا نَشْبَعُ

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «فلَعلَّكُم تفترِقُونَ؟» (أيْ: لعَلَّ كُلَّ واحِدٍ منكُم يأكُلُ وحْدَهُ، ولا ينْتَظِرُ الآخرينَ). فقالُوا: نَعَمْ.

فوجَّهَهُمُ النَّبيُّ ﷺ إلَى مَا فيه علاجُ المُشكلَة، فقالَ ﷺ: «فاجْتَمعوا علَى طعَامكم، واذكُرُوا اسْمَ الله علَيهِ، يُبارَكْ لَكُمْ فِيه» [أبو داود].

وهكَذَا نَتعلَّمُ أنَّ الاجتماعَ علَى الطَّعامِ يَكونُ سبَباً في البَركةِ.

---

المُسلمُ يأكُلُ باليَد اليُمْنَى؛ قالَ رسولُ الله ﷺ: «لا يأكُلَنَّ أحَدٌ منكم بشمَاله، ولا يَشْرَبَنَّ بِهَا، فإنَّ الشَّيطانَ يأكُلُ بشِمالِهِ ويَشرَبُ بِهَا» [مسلم].

# خواردن و تێر نەبوون

هەمیشە پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵانی فێری ئادابەکانی خواردن و خواردنەوە دەکرد، شتانێکی فێر دەکردن کە بۆ دنیاو دوا ڕۆژیان سودی هەبێت.

ڕۆژێک کۆمەڵێک لە هاوەڵانی هاتن بۆ خزمەتی ووتیان: ئێمە نان دەخۆین، بەڵام تێر نابین ؟!

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕەنگە هەر کەس لە ئێوە بۆ خۆی نان بخوات و چاوەڕێی ئەوانی تر نەکات؟

ووتیان: بەڵێ وایە!!

ئینجا پێغەمبەرﷺ چارەسەری نیشان دان و فەرمووی: هەمووتان لەسەر خواردن کۆببنەوە و (بسم الله) بکەن لە سەر خواردنەکە خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە ناو خواردنەکە (ابو داود).

بەم شێوەیە فێر دەبین: کۆبونەوە لە سەر سفرەو خوارد و چاوەڕێ کردنی یەکتر و ناو هێنانی خوای گەورە مایەی خێر و بەرەکەت دەبێت.

---

موسڵمان بەدەستی ڕاست دەخوات، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: کەس لە ئێوە بە دەستی چەپ نان نەخوات و نەخواتەوە، چونکە شەیتان بە چەپ دەخوات و دەخواتەوە (مسلم)

# خُبزٌ ولَحمٌ

نَهى النَّبي ﷺ عنِ الأَكلِ حتَّى تمتَلئ البَطْنُ؛ لأنَّ فِي ذلكَ ضرراً علَى صحَّة الإنسان.

وذات يومٍ. أكل الصحابِيُّ أبو جُحَيْفَةَ رضي الله عنه لَحماً سميناً وثَرِيْداً (خُبْزاً بالْمَرَقِ) حتَّى شَبِع.

وبعد ذلك، ذهب أبو جحَيْفةَ إلَى النَّبي ﷺ، وأخذَ يَتَجشَّأُ أمَامَهُ ﷺ (والجُشَاءُ رِيحٌ يخرُجُ مِنَ الفَمِ، ولَهُ صوتٌ).

فلمَّا رآهُ النَّبيُّ ﷺ يفعَلُ ذلكَ، قالَ لَهُ: «اكفُفْ عنَّا جُشَاءَكَ أبَا جُحَيْفةَ. فإنَّ أكثَرَ النَّاسِ شَبَعاً فِي الدُّنْيا أطولُهُمْ جُوعاً يومَ القِيامة»

فلَمَّا سمِعَ أبُو جُحَيفةَ هَذه الوصيَّةَ مِنْ رسولِ الله ﷺ عزَمَ علَى عدَمِ الإكثَارِ مِنْ تَناول الطَّعامِ بعدَ ذلكَ؛ فكانَ إذا تغَدَّى لا يَتَعشَّى، وإذا تَعشَّى لا يَتَغدَّى. [الطبراني].

---

مِن السُّنَّة عدم النَّفخ في الطَّعام الْحَارِّ أو الشَّرَابِ الْحَارِّ؛ لأنَّ النَّبيَّ ﷺ نَهَى عنِ التَّنفسِ في الإناء والنَّفخ فِيهِ. [الترمذي].

# نان و گۆشت

پیغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە زۆر خواردن بە شێوەیەک هەموو سک پڕ بێت
ـە خواردن. چونکە ئەوە زیان بە تەندروستی دەگەیەنێت

رۆژێک هاوەڵێک بەناوی (أبو جوحەیفە) رضي الله عنه تریت و گۆشتێکی زۆری خواردبوو، لە دوای ئەوە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، لە بەردەم پێغەمبەردا ﷺ قرخێنەی دەکرد و هەناسەی بۆ نەدەدرا، کاتێک بەم شێوە بینی، پێی فەرموو: ئەی جوحەیفە قرخێنەکەتمان لێ دوور بخەرەوە، چونکە زۆرترین کەس کە لە دنیادا زۆر تێرن، لە قیامەتدا زۆر برسین، کاتێک ئەم هاوەڵە گوێی ـە فەرمایشتەکە بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە بڕیاری دا چیتر خواردن زۆر نەخوات، بەشێوەیەک کەنانی نیوەڕۆ دەخوارد هەرگیز ئێوارە نانی نەدەخوارد و ئەگەر ئێوارە نانی بخواردایە، نیوەڕۆ نانی نەدەخوارد (الطبراني)

---

سوننەتە مرۆڤ فوو لە خواردن و خواردنەوە ی گەرم نەکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە هەناسەدان لەناو قاپ و فووکردن پیایدا (الترمزی)

# دَعوةٌ إلَى الطَّعَامِ

كَانَ الكَرَمُ صفةً مِنْ صِفَاتِ الصَّحَابةِ رضي الله عنهم؛ حيثُ كانُوا يَحرِصُونَ علَى إطعامِ الطَّعامِ.

وكانَ للصَّحابِي الجَليلِ أَبِي شُعَيبٍ رضي الله عنه غُلامٌ يُجِيدُ طَهْيَ اللَّحمِ.

وذاتَ يَومٍ، قالَ لَهُ أبو شُعَيبٍ: اصنَعْ لِي طَعاماً يَكفِي خمسَةً. ثُمَّ ذهَبَ أبُو شُعَيبٍ إلى النَّبيِّ ﷺ ودَعَاهُ إلى تَناولِ الطَّعامِ، ومعَهُ أربعةٌ مِنَ الصَّحابةِ.

فلَمَّا أرادَ الرَّسولُ ﷺ أنْ يَذهَبَ هوَ والصَّحابةُ الأَربعةُ إلَى أَبِي شُعَيبٍ؛ ذهَبَ معَهُمْ رَجلٌ خامِسٌ.

فلَمْ يَرُدَّهُ النَّبيُّ ﷺ، وأخَذَهُ معَهُم، فلَمَّا وَصَلُوا إلَى بيتِ أبي شُعَيبٍ، قالَ النَّبيُّ ﷺ لأَبِي شُعَيبٍ: «إنَّ هـذَا تَبِعنَا، فإنْ شئتَ أنْ تأذَنَ لَهُ، وإنْ شئتَ أنْ يَرجِعَ رَجَعَ».

فقالَ أبُو شُعَيبٍ بلْ أَذِنتُ لَهُ. [البخارِي].

---

الاجتِماعُ علَى الطَّعامِ يَجْلُبُ البركَةَ؛ قالَ رسولُ الله ﷺ: «طَعامُ الاثنَينِ كافِي الثَّلاثة . وطَعامُ الثَّلاثة كافِي الأربعةِ» [متفقٌ عليه].

# میوانداری

بەخشندەیی ڕەوشتی هاوەڵانی پێغەمبەر بووە، بە تایبەت زۆر سووربوون لەسەرخواردن بەخشین، یەکێک لە هاوەڵان کە ناوی (أبی شعیب) بوو خزمەتکارێکی هەبوو، خواردنی زۆر خۆشو بەچێژی ئامادە دەکرد، ڕۆژێک (أبی شوعەیب) پێی ووت: خواردنێکی خۆشم بۆ ئامادە بکە بەشی پێنج کەس بکات ئینجا چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ و خۆی و چوار کەسی بانگهێشت کرد بۆ میوانداری، پێغەمبەریش وەڵامی دایەوەو چوار کەسی لەگەڵ خۆیدا برد، کاتێک گەشتنە لای ماڵی (أبی شوعەیب) کابرایەک شوێنیان کەوتبوو پێغەمبەریشﷺ بە أبی شوعەیب)ی فەرموو: ئەم کابرایە شوێنمان کەوتووە، ئەگەر مۆڵەتی بدەی باشە، ئەگەر بشتەوێت کە بگەڕێتەوە، دەگەڕێتەوە ؟ ئەم هاوەڵە بەڕێزە ووتی: بەڵێ مۆڵەتی دەدەم (البخاری).

---

کۆبوونەوە لە سەر خواردن مایەی بەرەکەتە، پێغمبەرﷺ دەفەرموێت: خواردنی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکات، خواردنی سێ کەسیش بەشی چوار کەس دەکات.

# دَرْسٌ لا يُنْسَى

كانَ عُمَرُ بنُ أبي سَلَمةَ ـ رضيَ اللهُ عنهما ـ غُلاماً صغيراً، يَعيشُ في بيت رسول الله ﷺ، وكانَ كُلَّمَا أرادَ أنْ يأكُلَ تَحرَّكَتْ يَدُهُ فِي نَواحِي الطَّبَقِ، ولاَ يأكُلُ مِنْ جانِبٍ واحدٍ، وهذَا ليس مِنْ آدابِ الطَّعامِ.

وكَانَ النَّبيُّ ﷺ لا يَدَعُ فُرصةً تَمُرُّ عليهِ وهوَ مُجتَمِعٌ معَ الصَّحابةِ إلاَّ ويُعَلِّمُهم ما فيه خَيرُهم فِي الدُّنيَا والآخِرةِ.

وذاتَ يومٍ، كانَ عُمَرُ بنُ أبِي سَلَمةَ رضي الله عنه يأكُلُ أمامَ النَّبيِّ ﷺ، فلَمَّا رأى النَّبيُّ ﷺ ما يَفعَلُهُ هذا الغُلامُ، قالَ لَهُ: «اُدْنُ يا بُنَيَّ (اِقْتَرِبْ)، ثُمَّ أخَذَ النَّبيُّ ﷺ يُعَلِّمُهُ آدابَ الطَّعامِ، فقالَ لَهُ ﷺ: «سمِّ الله، وكُلْ بِيَمينِكَ، وكُلْ مِمَّا يَلِيكَ» [البخاري].

وظَلَّ عُمَرُ بنُ أبي سَلَمَةَ بعدَ ذلكَ يَلتَزِمُ بهذِهِ الآدابِ الَّتِي علَّمَهُ إيَّاهَا رَسولُ الله ﷺ.

---

قالَ ﷺ: «ما مَلأَ آدَمِيٌّ وِعاءً شَرّاً منْ بَطْنِه، بِحَسْبِ ابنِ آدمَ أُكُلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فإنْ كانَ لا مَحَالةَ فثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وثُلُثٌ لشَرابِهِ، وثُلُثٌ لِنَفَسِهِ» [الترمذي].

# وانەیەك کە بیر ناچێتەوە

عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە ﷺ منـاڵێکی بچـووك بـوو، لـە مـاڵی پێغەمبـەری خوا ﷺ دەژیا، ئەو هەر کات دەیویسـت نـان بخـوات، دەسـتی دەگێـرا بـە نـاو قاپەکەدا، لە لایەکەوە نەیدەخوارد، ئەمەش لە ئاکاری خواردن نییە

پێغەمبـەریش هـیچ هـەڵێکی فـەرامۆش نـە دەکـرد کـاتێ لەگـەڵ هـاوەڵان کۆدەبووەوە، ئەو فێری شتانێکی دەکردن کە بەرژەوەندی دنیـاو دوارۆژی هـەبێت ڕۆژێك عومـەری کـوڕی ئـەبی سـەلەمە ﷺ لـە خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ نـانی دەخوارد کاتێ پێغەمبەر بینی ئەم مناڵە ئـاوا نـان دەخـوات پێـی فـەرموو: کـوڕم نزیك ببەرەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فێری ئاکاری خواردنی کـرد و پێـی فـەرموو: (بسم اللّٰه) بکەو بەناوی خوا دەست بە خواردن بکە، بە دەستی ڕاست بخۆ ئینجـا لە لای خۆتەوە بخۆ (دەست مەگێڕە) (بوخاری)

ئیتر هەمیشە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە، پابەند بـوو بـەو ئاکـارە جوانانـەی پێغەمبەر ﷺ فێری کرد.

---

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: مرۆڤ هیچ دەفرێکی پڕ نەکردووە خراپتر لە ورگـی، مرۆڤ ئەوەندەی بەسە لە چەند پارویەك بخوات و پشتی ڕا بگرێت ئەگەر دەبـوو هەر بخوات، با سێیەکی بۆ خواردن و سێیەکی بۆ خواردنەوە (ئـاو) و سێیەکیشـی بۆ هەناسە بێـت (الترمزي)

# دُعَاءُ الرَّسُولِ

ذاتَ يَومٍ، أرسلَ الصَّحابِيُّ الجَليلُ بُسْرُ بنُ أبِي بُسْرٍ المَازِنِيُّ رضي الله عنه ابنَهُ عبدَ اللهِ إلى رَسولِ الله ﷺ يَدعُوهُ إلَى تَنَاوُلِ الطَّعَامِ معهُمْ فِي البَيتِ، فذَهبَ عبدُ اللهِ إلَى النَّبيِّ ﷺ ودَعَاهُ، فجاءَ النَّبيُّ ﷺ.

فلَمَّا اقتَرَبَ رسولُ الله ﷺ مِنَ البيتِ، خرَجَ إلَيهِ أبو بُسْرٍ رضي الله عنه، ورَحَّبَ بِهِ، وأحضَرَ لَهُ فِرَاشاً مِنْ قَطيفَةٍ، وأجلَسَهُ علَيه، ثُمَّ أمَرَ زَوجتَهُ بإحضارِ الطَّعامِ، فجَاءَتْ زَوجتُهُ بِقَصْعَةٍ فيها طَعامٌ، ووَضَعَتْهَا أمامَ النَّبيِّ ﷺ، فقالَ لَهُمْ رَسولُ الله ﷺ: «خُذُوا مِنْ حَوَالَيْهَا، وذَرُوا ذِرْوَتَها، فَإنَّ البَرَكةَ فِيهَا». فأكلُوا حتَّى شَبِعُوا، وبَقِيَ مِنَ الطَّعامِ.

ثُمَّ دَعَا الرَّسولُ ﷺ لأهلِ البَيْتِ قائلاً: «اللَّهُمَّ اغفِرْ لَهُم، وارْحَمْهُمْ، وبَارِكْ عليْهِمْ، ووَسِّعْ علَيْهِمْ فِي أرزَاقِهِم» [أحمد].

---

يُستَحَبُّ لِلمُسلِمِ أنْ يَدعُوَ أهلَ التَّقْوَى إلَى طَعامه؛ قالَ رَسولُ الله ﷺ: «لا تُصاحِبْ إلاَّ مُؤمِناً، ولاَ يأكُلْ طعَامَكَ إلاَّ تَقِيٌّ» [الترمذِي].

^

# دوعای پێغەمبەرﷺ

ڕۆژێك هاوەڵی بەڕێز: بوسر كوڕی ئەبو بوسری مازەنی‌رضي الله عنه (عبدالله) ی كـوڕی نارده خزمەت پێغەمبەرﷺ تا بانگی بكات بۆ نان خـواردن لـه ماڵیـان، (عبـدالله) چووه خزمەت پێغەمبەرﷺ میوانداری كردو ئەویش لە گەڵیدا تەشـریفی هـات، كاتێك پێغەمبەری خواﷺ لە ماڵیان نزیـك بـۆوه، (أبـو بوسـر) هاتـه خزمـەتی و پێشوازی لێكرد، دۆشەكێكی قەیفەی ئامـاده كـرد و پێغەمبـەری لەوێـدا فـەرموو كرد، پاشان بانگی خێزانی كرد بۆ ئاماده كردنی سفرەو خوان، ئـەویش خـواردنی بۆ هێنان و له بـەردەم پێغەمبـەرﷺ دا داینـا، پێغەمبـەریشﷺ فـەرمووی: لـە قـەراغ و دەورو بـەری قەصـعەكە بخـۆن و واز لـە ناوەڕاسـتی بهێـنن، چـونكە بەرەكـەتی تیایـە، ئـەوانیش وایـان كـرد بۆیـە تـا تێـر بـوون خواردیـان و لـە خواردنەكەش مایەوه. پاشان پێغەمبەری خواﷺ دوعـای بـۆ خـاوەن مـاڵ كـرد و فەرمووی: خودایە، لێیان خۆش بەو بەزەیی و سۆزت بۆیان هەبێت فەڕ و پیرۆزی بڕژە بە سەریاندا و ڕۆزییان فراوان بكە (احمد)

---

سوننەتە موسڵمان خواناسان و ئەهلی تەقوا میوانداری بكات بۆ نان خواردن لـە ماڵیاندا...

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: هاوڕێی كەس مەكە مەگەر باوەڕدار، خواردنیشـت جگە لە ئەهلی تەقوا مەدە بە كەس (الترمزی)

# الرَّجلُ والشَّيطانُ

كَان منْ تواضعِ النَّبي ﷺ أنَّهُ كانَ يُلبِّي الدَّعْوَةَ ، ويجْلس بين أصحابِه وكأنَّهُ واحدٌ منْهُمْ

وذاتَ يومٍ ، كانَ النَّبيُّ ﷺ جالساً مع بعضِ أصحابِه.

وكانَ مِنْ بينِ هؤلاء الصحابةِ رجلٌ كانَ يأكلُ طَعاماً ؛ ولَمْ يُسَمِّ الله سُبحانَهُ ، وانتَظَرَ النَّبي ﷺ والصَّحابةُ منَ الرَّجلِ أنْ يَقُولَ بِسم الله. ولَكنَّهُ لمْ يَفعَلْ

فلَمَّا اقتَرَب الرَّجلُ منَ الانتِهاء مِنَ الطَّعامِ ، ولَمْ يَبْقَ منْهُ إلاَّ لُقْمة ؛ تذكَّرَ أنه لَمْ يَذكُرِ اسم الله ، فقالَ : بِسْمِ الله أوَّلَهُ وآخِرَهُ.

فلَمَّا سمِعَ النَّبيُّ ﷺ قولَهُ ضَحكَ ، وقالَ «ما زالَ الشَّيطانُ يأكُلُ مَعَهُ . فلَمَّا ذَكَرَ اسْم الله ـ عَزَّ وجَلَّ ـ اسْتَقَاء (يَعني الشَّيطان» [أبو داود].

وهكَذا نَتعلَّمُ أنَّ الشَّيطانَ لا يَأكُلُ مَعَ المُسلِمِ إذَا ذَكَرَ اسم الله علَى الطَّعَامِ

---

منْ آدابِ الطَّعامِ والشَّرابِ أنْ نَحمَدَ الله تعالَى بعدَ الأكلِ أو الشُّربِ ، قال رسولُ الله ﷺ «إنَّ الله لَيَرْضَى عَنِ العبدِ أنْ يأكُلَ الأكْلَةَ فيَحْمَدَهُ عليها ، ويَشرَبَ الشَّرْبَةَ فيَحْمَدَهُ علَيْهَا» [مسلم].

# پیاو و شەیتان

ـەشێك لە بێفیزی پێغەمبەرﷺ ئەوە بوو کە وەلأمی میوانداری و بانگ کردنـی ـەدایـەوە، لـە نێـو هاوەلأنـدا هـەروەك یـەکێك لـەوان دادەنیشـت، ڕۆژێـك ـیەمبەرﷺ لەگەڵ کۆمەلێك لە هاوەلأن دانیشتبوو، لە نێـوان ئەوانـدا هاوەڵێـك ـە نانی دەخوارد، (بسم الله) ی نەکرد پێغەمبەرﷺ و هاوەلأن چـاوەڕێیان کـرد ـو پیاوە کە بڵێت (بسم الله) بەلأم نەیوت: کاتێ کابرا نزیك بۆوە لە تەواو بوون ـە خواردنەکە، تەنها پارویەك مابوو، بیری کەوتەوە کـە نـاوی خـوای نـەهێناوە، ـیرا ووتی (بسم الله او له و اخره)

کاتی پێغەمبەرﷺ گوێی لی بوو، پێکەنی و فەرمووی: بەردەوام شەیتان لەگـەڵی ـەخوارد، کاتێ ناوی خوای گـەورەی هێنـا (ڕشـایەوە) واتـە شـەیتان ڕشـایەوە و ـودی لە خواردنەکە نەکرد (ابو داود)

بەم شێوەیە فێر دەبین کە شەیتان لەگەڵ موسڵماندا ناخوات ئەگەر ئەو لەسەر ـان ناوی خوا بهێنێ.

---

یەکێك لە ئادابی خواردن و خواردنەوە ئەوەیە لە دوای تەواو بوون لە خواردن و خواردنەوە سوپاسی خوا بکات

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: خـوای گـەورە ڕازیـە لـەو بەندەیـەی کـە خـواردن دەخوات و سوپاسی خوای گەورە دەکات و ئاو دەخواتەوە سوپاسی خوای گەورەی لەسەر دەکات (مسلم).

# سَارِقُ الطَّعامِ

كانَ الصحابةُ رضي الله عنهم إذَا جلَسُوا لِتَناولِ الطَّعامِ معَ رسولِ الله ﷺ لا يَمُدُّونَ أيدِيَهُمْ فِي الطَّعَامِ قَبلَهُ

وفِي إحدَى المرَّاتِ ، جَلَسُوا معَ الرَّسولِ ﷺ حولَ الطَّعامِ ، فجاءتْ فتاةٌ صغيرةٌ ، فمَدَّتْ يدَهَا إلَى الطَّعَامِ ، فأمْسَكَ النَّبيُّ ﷺ يَدَهَا ، لِيَمْنعَهَا

ثُمَّ جاءَ أعرابِيٌّ ، ومَدَّ يَدَهُ إلَى الطَّعامِ قَبْلَ رَسولِ الله ﷺ ، فأمْسَكَ النَّبيُّ ﷺ يَدَ الرَّجلِ

ثُمَّ قالَ «إنَّ الشَّيطانَ يَستَحِلُّ الطَّعامَ أنْ لا يُذْكَرَ اسمُ اللهِ علَيهِ ، وأنَّهُ جاء بِهَذه الجاريةِ لِيَستَحِلَّ بِهَا ، فأخَذْتُ بِيدِها ، فجاءَ بِهذا الأعرابِي يستَحِلُّ بِهِ ، فأخَذْتُ بيدِه . والَّذِي نفسِي بيَدِه ، إنَّ يَدَهُ فِي يَدِي معَ أيدِيهِمَا».

ثُمَّ ذَكَرَ رسولُ الله ﷺ اسْمَ اللهِ علَى الطَّعامِ وأكَلَ .[مسلم] .

---

حَرَّمَ الله علَى المُؤمِنينَ شُربَ الخَمرِ أوِ التَّداوِي بها؛ قالَ تعالَى :﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [المائدة ٩٠]

# خۆراك دز

هاوەڵان (ڕەزای خوایان لی بێت) کاتێ لە خزمەت پێغەمبەرﷺ دادەنیشتن بۆ نان خواردن، هەرگیز پێش ئەو دەستیان بە خواردن نە دەکرد.

جارێك، لە خزمەت پێغەمبەرﷺ و لە دەوری خواردنێك دانیشتبوون کچێکی بچوك هات، دەستی بۆ خواردنەکە درێژ کرد، پێغەمبەرﷺ دەستی گرت و نەیهێشت، پاشان دەشتەکیەك هات و دەستی بۆ خواردنەکە درێژ کرد پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ دەستی بۆ ببات، ئەم جارەش پێغەمبەرﷺ دەستی کابرای گرت، پاشان فەرمووی: هەر خواردنێك ناوی خوای لەسەر نەهێنرێت شەیتان بۆ خۆی حەلاَل دەکات، ئەو منالَەی هێنا تا خواردنەکەی پێ حەلاَلْ بکات، منیش دەستیم گرت و نەمهێشت ئینجا ئەو کابرایەی هێنا تا خواردنەکەی پێ حەلاَلْ بکات دەستیم گرت سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، دەستی شەیتان لەگەلْ دەستی ئەودوانەدا لە دەستی مندا بوو پاشان پێغەمبەرﷺ (بسم اللّٰه) ی کرد و دەستی بە خواردن کرد (المسلم).

---

خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەسەر بڕواداران خواردنەوەی عارەق بە بیانوی چارەسەر، خوای گەورە دەفەرموێت: (بێگومان عارەق و قومار و گۆشتی حالاَتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا و بورج و حەرام و حەلالْ زانین بەهۆی هەلْدانی زاراوە پیسن و کاری شەیتانن)

# كَيفَ أشرَبُ؟

نَهَى النَّبيُّ ﷺ الصحابةَ عنِ النَّفخِ فِي الشَّرابِ الحَارِّ، لِمَا فِي ذلكَ مِنْ ضَرَرٍ علَى صِحَّةِ الإنسانِ، فاستَجابَ الصحَابةُ لنَهْيِ النَّبيِّ ﷺ.

وذاتَ يومٍ، جاء رَجُلٌ مِنَ الأَعرابِ إلى النَّبيِّ ﷺ وقالَ لَهُ: يا رسولَ الله! القَذَاة (ما يقعُ فِي الماءِ مِنْ تُرابٍ وغيرِ ذلك) أرَاهَا فِي الإِناء؟

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «أهْرِقْهَا» (اِرمِ الماءَ الَّذِي به هذِهِ القذاةَ).

ثُمَّ سألَهُ الرَّجُلُ مَرَّةً أُخرَى، فقالَ: فإنِّي لا أرْوَى مِنْ نَفَسٍ واحدٍ.

فقالَ ﷺ: «فأبِنِ القَدَحَ إذاً عَنْ فِيكَ (أي: أَبْعِدْهُ عَنْ فَمك) [الترمذي].

وهكذَا كانَ رسولُ الله ﷺ يُعلِّمُ أصحابَهُ رضي الله عنهم فِي رِفقٍ ولِينٍ آدابَ الإسلامِ.

---

قالَ ﷺ: «لا تَشرَبُوا واحداً كشُرْبِ البَعيرِ، ولكنِ اشرَبُوا مَثْنَى وثُلاث، وسَمُّوا إذا أنتم شَرِبْتُمْ، واحْمدُوا إذا أنْتُم رفَعتُم» [الترمذي].

# چۆن بخۆمەوە ؟

پیغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە هاوەڵانی لە فـوو بـە خواردنـەوەی گەرمـدا
ـتەن. چونکە ئەوە زیانی هەیە بـۆ تەندروسـتی مـرۆڤ، هـاوەڵانیش وەڵامـی ئـەو
قەدەغە کردنەیان دایەوە کەپێغەمبەر فەرمووی: ڕۆژێك پیاوێکی دەشتەکی هاتـە
حرمەت پێغەمبەرﷺ پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەو ئاوەی کە تۆزو خۆڵ و
شتی تر دەکەوێتە ناو چی پێ بکەم ؟

پیغەمبەرﷺ فەرمووی: بیرێژە پاشان کابرا جارێکی تر پرسی: من بەیەك جـار
تێر نابم فەرمووی: جامەکە لە دەمت دوور بخەرەوە (واتـە کاتێـك هەناسـە
دەدەیت) (الترمزی)

بەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ بە نەرم و نیانی هاوەڵانی فێری ئادابـە ئیسـلامیەکان
دەکرد.

---

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەیەکجار مەخۆنەوە وەك خواردنەوەی ووشتر، بـەڵکو
بە دووجار و بە سێجار بخۆنەوە، بسم اللە بکەن کاتێك ئاو دەخۆنـەوە کـە تـەواو
بوون سوپاسی خوا بکەن (الترمزی)

# قَصْعَةُ الرَّسولِ ﷺ

كان النَّبي ﷺ يملكُ قَصْعَةً، يُقالُ لَها: (الغَـرَّاءُ)، وكانَـتْ كبيرةَ الحجمِ، لا يستَطيعُ أنْ يَحمِلَها أقلُّ مِنْ أربعةِ رِجالٍ.

وذاتَ يومٍ، دعَا النَّبيُّ ﷺ أصحابَهُ إلَى الأكلِ مِنْهَا.

وبعدَ صلاة الضُّـحى، أحضَـرَ الـنَّبيُّ ﷺ القَصْـعَةَ، وقـدِ امتَلأَتْ بالثَّرِيدِ.

ثُمَّ دعَا النَّبيُّ ﷺ أصحابَهُ ليـأكُلُوا مـنَ القَصْـعَة، فجَـاءُوا جميعاً، ثُمَّ جلَسُوا حولَها حتَّـى ضَـاقَ بِهِـمُ المَكـانُ، فجلَـس النَّبيُّ ﷺ علَى رُكْبَتَيْهِ.

فقالَ أعرابِيٌّ ما هذِهِ الْجِلْسَةُ؟

فقالَ رسولُ الله ﷺ: «إنَّ الله جعلَنِـي عَبـداً كَريمـاً، ولَـمْ يجعلْنِي جبَّاراً عنيداً»

ثُمَّ قالَ ﷺ للصَّحابةِ: «كُلُوا مِنْ جَوانِبِهَا، ودَعُـوا ذِرْوَتَهَـا يُبَارَكْ لكُمْ فِيها» [أبو داود].

---

لا يجوزُ الأكلُ أو الشُّربُ فِي الآنيةِ المَصنوعَةِ منَ الـذَهبِ أو الفِضَّـةِ؛ قالَ رسولُ الله ﷺ «إنَّ الَّذي يأكلُ أو يشرَبُ فِي آنيةِ الذَهبِ أو الفِضَّةِ إنَّما يُجَرْجِرُ فِي بطنه نارَ جَهَنَّم» [مسلم].

# تەشتەکەی پێغەمبەرﷺ

پێغەمبەرﷺ تەشتێک (لەگەنی گەورە)ی هەبوو، پێیان دەوت: (الغراء) زۆر گـەورە بـوو، چـوار کـەس کـەمتر نـەیان دەتـوانی هـەڵیبگرن، ڕۆژێـک پێغەمبـەرﷺ هـاوەڵانی بـانگ کـرد بـۆ خـواردن لـە دوای نوێـژی چێشـتەنگاو، پێغەمبەرﷺ ئەو تەشتەی هێنا کە پڕ بوو لە تریت، پاشان هاوەڵانی فەرموو کرد بۆ خواردنی نانەکە، هەموویان هاتن لە دەوری دانیشتن تا جێگەیان تەسک بـۆوە پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەژنۆی دانیشـت، کابرایەکی دەشتەکی ووتی: ئەم دانیشـتنە چییە ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوای گەورە منی کردووە بە بەندەیەکی ڕێزدارو بەڕێز، نەیکردووم بە کەسێکی سەرکەش و توند، پاشان بە هاوەڵانی فەرموو: لە لا تەنیشتەکانی بخۆن (قەراغەکانی) ناوەڕاسـتەکەی واز لـێ بهێـنن خـوای گـەورە بەرەکەت و فەڕ دەڕژێتە ناوی (ابو داود)

---

دروست نیە خواردن و خواردنـەوە لـە قـاپی دروسـت کـراو لـە ئـاڵتون و زێـز پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوەی لە نێـو قـاپی ئـاڵتون و زیـو دەخـواو دەخواتـەوە، بێگومان ئاگری دۆزەخ لەناو سکیدا کڵپە دەسێنێ (مسلم)

# عاقبةُ العِصْيَانِ

كانَ رسولُ الله ﷺ يأكلُ بيمينهِ. وكانَ يَدعُو الصَّحابَةَ للأكلِ بأيمانِهم. وعلَّمهُمْ أنَّ استعمالَ اليَدِ اليُمنَى فِي الأكلِ وفِي غيرِهِ يَجلُبُ البَرَكةَ. كمَا أنَّ فِيه طاعةً للهِ ورَسولِهِ يَنالُ المُسلمُ بِهَا أجراً كبيراً

وذاتَ يومٍ، رأى النَّبيُّ ﷺ رجُلاً يأكُلُ بيدهِ اليُسْرَى. فأرادَ النَّبيُّ ﷺ أنْ يُذكِّرَهُ بآدابِ الطَّعامِ. فقالَ لَهُ ﷺ «كُلْ بيمينكَ».

فاستكبَرَ الرَّجُلُ، ولَمْ يلتَزِمْ بأمرِ الرَّسولِ ﷺ، وقالَ: لا أستَطيعُ.

وهنَا أدركَ النَّبيُّ ﷺ أنَّ الرَّجُلَ لا يُريدُ الامتثالَ لأمْرِهِ، ورَفضَ أنْ يأكُلَ بيدِهِ اليُمنَى استِكباراً. فقالَ لَهُ النَّبيُّ ﷺ: «لا استَطَعْتَ».

فاستَجابَ اللهُ لنَبيِّهِ ﷺ، فَشُلَّتْ يَدُ الرَّجُلِ، ولَمْ يَسْتَطعْ أنْ يرْفَعَهَا إلَى فَمِهِ بعدَ ذلكَ. [مسلم].

---

مِنَ السُّنَّةِ أنْ يكون ساقِيَ القَومِ آخرُ مَنْ يَشرَبُ؛ قالَ النَّبيُّ ﷺ: «سَاقِي القومِ آخِرُهُمْ شُرْباً» [الترمذي].

# سەرەنجامی سەرپێچی

پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ڕاست دەیخـوارد هاوەڵانیشـی فێـر دەکـرد کـە بـە دەستی ڕاست بخۆن، وە فێری دەکردن کە بـە کـار هێنـانی دەسـتی ڕاسـت لـە خواردن و جگە لە خواردنیش دەبێتە مایەی پیرۆزی و پیـت و بەرەکـەت، لەگـەل ئەوەشدا بـە گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبـەرﷺ موسـڵمان توشـی پاداشـتی گـەورە دەبێت.

ڕۆژێک، پێغەمبەرﷺ پیاوێکی بینی بە دەستی چەپ نان دەخوات پێغەمبەر ﷺ ویستی فێری ئادابی خواردنی بکات پێی فەرموو: بە دەستی ڕاتست بخۆ

کـابرا خـۆی بـە گـەورە دەزانـی و فیـزی نوانـد و پابەنـدی فەرمانەکـەی پێغەمبەرﷺ نەبوو ووتی: ناتوانم !

لێرەدا پێغەمبەرﷺ زانی کـابرا مەبەسـتی ئەوەیـە فەرمانەکـەی جـێ بـە جـێ نەکات و بەرپەرچی دایەوە کە بە دەستی ڕاست نانەکە بخوات

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر نەتوانیت.

خوای گەورە وەڵامی پێغەمبەرەکەی دایەوە دەستی کـابرا لـە کـار کـەوت و لـە دوای ئەوە نەیتوانی دەست بۆ دەمی بەرز بکاتەوە (مسلم)

---

سوننەت وایە ئاوگێڕ دوای هەمووان ئاو بخواتـەوە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێت (ئاوگێڕ کۆتا کەس ئاو دەخواتەوە) (الترمزی).

# لَحْمُ الوَلِيمَةِ

ذاتَ يَومٍ، كانَ خالدُ بنُ الوَليدِ رضي الله عنه معَ الرَّسولِ ﷺ عندَ السَّيِّدةِ مَيمونَةَ ـ رضي الله عنها ـ ، فأُهْدِيَ إليْهِمْ ضَبٌّ (حيوانٌ مِنَ الحَيواناتِ الزَّاحفَةِ) فصَنَعَتْ مِنْهُ طَعَاماً، وقدَّمَتْهُ لرسُولِ الله ﷺ وخَالدٍ رضي الله عنه.

فلمَّا هَمَّ النَّبيُّ ﷺ بالأكلِ، قالَتْ إحْدَى النِّسَاءِ: يا رسولَ الله! إنَّ هذَا الطَّعامَ صُنِعَ مِنْ لَحْمِ الضَّبِّ.

فرَفَعَ النَّبيُّ ﷺ يَدَهُ عنِ الطَّعامِ.

فقالَ خالدٌ رضي الله عنه: أحَرَامٌ الضَّبُّ يا رسولَ الله؟

فقالَ: «لا، ولكِنَّهُ لا يَكُونُ بأرضِ قَومِي، فأجِدُنِي أعَافُهُ» (لاَ أتقبَّلُهُ).

فمَدَّ خالدٌ رضي الله عنه يَدَهُ إلَى الطَّعامِ، وأكَلَ مِنْ لَحْمِ الضَّبِّ. [البخاري].

---

المُسلِمُ لا يَعِيبُ الطَّعامَ الحَلالَ. فقدْ كانَ النَّبيُّ ﷺ لا يَعِيبُ طَعاماً أبداً، إنِ اشتَهاهُ أكلَهُ، وإنْ كَرِهَهُ تَركَه. [متفقٌ عليه].

# گۆشتی دیاری (شایی)

ڕۆژێک (خالید کوڕی وەلید) ﷺ لە خزمەت پێغەمبەرﷺ دا لەلای خاتوو مەیمونە بوون ڕەزای خوای لێبێت

گیانداریکی (خشۆک) یان بە دیاری بۆ هێنان کە پێی دەڵێچن: بزن مژەئەویش خواردنێکی لێ دروست کردو هێنای بۆ پێغەمبەرﷺ و خالید کاتێک پێغەمبەرﷺ ویستی بخوات ئافرەتێک ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو خواردنە، لە گۆشتی گیانداری بزن مژە) دروست کراوە، پێغەمبەرﷺ دەستی بەرز کردنەوە لە خواردنەکە و نەیخوارد.

خالید ووتی: ئایا گۆشتی (بزن مذة) حەرامە ئەی پێغەبەری خوا ؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام لای خاکی ئێمە نییە، منیش قێزم لێ کردەوە و پێم نەخورا، ئیتر خالید دەستی ڕاکێشا بۆ خواردنەکە و لە.گۆشتەکەی خوارد (البخاري)

---

موسڵمان، پێغەمبەرﷺ هەرگیز نارەزایی لە خواردن دەرنەبڕیوە ئەگەر حەزی لێکردبێت خواردوویەتی، ئەگەر لای ناخۆش بوو بێت وازی لێهێناوە. (متفق علیه)

# الإيْثارُ بالطَّعامِ

جاء رجلٌ إلى النَّبي ﷺ وقالَ يا رسولَ الله، أصابَنِي الجَهْدُ والجُوعُ ولَمْ يكُنْ عندَ رسولِ الله ﷺ طعامٌ، فقالَ ﷺ: «ألاَ رجلٌ يُضِيفهُ اللَّيلةَ يَرْحَمُهُ الله».

فقالَ أحَدُ الأنصارِ أنَا يا رسولَ الله! ثُمَّ أخَذَهُ إلى بَيتِه، وقالَ لامرأته هذَا ضَيفُ رسولِ الله ﷺ، أحْضِرِي لَهُ طعاماً. فقالَتِ المرأةُ. ليس عندِي إلاَّ طَعامُ الأطفالِ.

فقالَ لَها اشْغَلِي الأطفالَ حتَّى يَنامُوا، وأطفِئي السراجَ إذَا جَلَستُ مَعَهُ لِتَناوُلِ الطَّعامِ. فَفَعَلَتِ المَرأةُ ذلِكَ. وجَلَسَ الأنصَارِيُّ مَعَ الضَّيفِ؛ لكِنَّهُ لَمْ يَأكُلْ، وأكَلَ الضَّيفُ حتَّى شَبِع، وباتَ أهلُ البَيتِ جَوْعَى.

فلَمَّا عَلِم النَّبيُّ ﷺ بِذلكَ قالَ «لقَدْ عَجِبَ الله عزَّ وجلَّ مِنْ فُلانٍ وفُلانَة» [البخاري]. وأنزَلَ الله تعالَى فيهِمَا قولَهُ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ [الحشر: ٩].

---

مِنْ آدابِ الطَّعامِ عدَمُ الأكلِ مِنْ وَسْطِ الإناء؛ قالَ ﷺ: «البَركَةُ تَنزِلُ فِي وَسْطِ الطَّعَامِ، فَكُلُوا مِنْ حَافَّتَيْهِ ولا تَأكُلُوا مِنْ وَسْطِهِ» [الترمذي].

# لە خۆ بوردن لە خواردندا

ـوێک هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەرخوا ﷺ ماندوو برسیم: ـغەمبەرﷺ خواردنی لا نەبوو بۆیە فەرمووی چ پیاوێک ئەمشەو لەگەڵ خۆیدا ـەبتەوە و میوانداری دەکات خوای گەورە رەحمی پێ بکات، یەکێک لە ـستیوانلن ووتی: من ئەی پێغەمبەرﷺ، پاشان کابرای بردەوە بۆ ماڵەوە، بە ـوسەرەکەی ووت: ئەوە میوانی پێغەمبەری خوایەﷺ خواردنی بۆ ئامادە بکە،

ئافرەتەکە ووتی: جگە لە خواردنی منالەکانمان هیچمان نییە!!

میردەکەی پێی ووت: منالەکان سەرقاڵ بکە تا خەویان لێ دەکەوێت چراکە ـوش بکە لەو کاتەدا لە گەڵی دادەنیشم بۆ خواردن، ئافرەتەکە ئەو کارەی ـرد. کابرای ئەنصاری لە تەنشت میوانەکە دانیشت، بەڵام نەیخوارد، تا میوانەکە تێری خوارد، ئەو شەوە خاوەن ماڵ بە برسێتی مانەوە، کاتێک ـغەمبەرﷺ ئاگاداری ئەو هەڵوێستە بوو فەرمووی: خوای گەورە سەر سام بوو ـە فلان ژن و مێرد (البخاری) خوای گەورە ئایەتی دەربارەیان ناردە خوارەوە ـەرمووی: (لە مافی خۆیان دەبورن هەرچەندە خۆشیان پێویستیان پێی هەیە، ـەڵام دەیبەخشن بە براکەیان)

---

یەکێک لە ئادابی خواردن ئەوەیە لە ناوەڕاستی قاپەکە نەخورێت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت پیت و بەرەکەت دەڕژێتە ناوەڕاستی قاپ ئێوە لە قەراغەکانی بخۆن. لە ناوەڕاستی مەخۆن (الترمذی)

بۆ ئەوەی تا کۆتایی پیت و بەرەکەتەکە بمێنێتەوە).

# الطَّعَامُ الْحَرَامُ

كانَ لأَبي بكرٍ الصِّديقِ رضي الله عنه غُلامٌ يَخرُجُ كُلَّ يَـومٍ لِلعَملِ، فيَأتِي بجُزْءٍ مِنْ أجْرِهِ، فيَأخُذُه أبو بكرٍ رضي الله عنه.

وذاتَ يومٍ، جاء الغُلامُ بِطَعامٍ، فأكَلَ مِنْهُ أبو بكرٍ

فقالَ لهُ الغُلامُ أتَدْرِي كيفَ حصَلتُ علَى هذَا الطَّعامِ؟

فقالَ أبُو بكرٍ لا من أيْنَ جَاءَ؟

قالَ الغُلامُ: تكَهَّنْتُ لِرَجلٍ (تَنَبَّأتُ لـه) فِـي الجَاهِلِيَّـةِ، فقابَلَني الآنَ وأعطاني هذَا الطَّعامَ الَّذي أكلْتَ مِنْهُ.

وهُنَا استَشْعَرَ أبو بكرٍ حُرْمَةَ ما فَعَلَهُ هـذَا الغُـلامُ، فأسـرَعَ وأدْخَلَ يَدَهُ فِي فَمِهِ فاستَقاءَ مَا فِي بَطْنِهِ. [البخارِي].

وهكَذَا كانَ أبو بكرٍ رضي الله عنه يَتَحرَّى ألاَّ يأكُلَ إلاَّ مِنَ الطَّعَامِ الحَلاَلِ، عمَلاً بِقَولِ النَّبيِّ ﷺ: «أطِـبْ مَطْعَمَـكَ تَكُـنْ مُسْتَجابَ الدَّعْوةِ» [ابنُ مَرْدُوَيْهْ].

---

المُسلِمُ يَجلِسُ عندَ طَعامِهِ علَى القَدمِ اليُسْرَى، ويَنْصِبُ رِجلَهُ اليُمنَى، أو يَجلِسُ علَى رُكبَتيْهِ، كمَا كانَ يَفعَلُ النَّبيُّ ﷺ.

# خواردنی حەرام (قەدەغە)

ئەبو بەکر﷛ خزمەت کارێکی هەبوو هەموو ڕۆژێـک بـۆ کـارکردن دەڕۆیشـتە دەرەوە هەنـدێ لـە کرێکـەی دەهێنـا بـۆ ئـەبو بـەکر﷛ ئـەویش لێـی وەر دەگرت. ڕۆژێک ئـەو خزمـەت کـارە خـواردنێکی هێنـا، ئـەبو بـەکر لێـی خـوارد، خزمەت کارەکە ووتی: دەزانیت ئەو خواردنەم چۆن دەست کەوت ؟ ئەبو بـەکر ووتی: نەخێر....چۆن دەستت کەوت ؟

ووتی: لەسەردەمی نەزانیدا پێشبینیم بۆ کابرایـەک کـرد واتـە: (قـاوەگرەوە) ئەمڕۆ پێم گەیشت و ئەم خواردنەی لە بری ئەو کارە پێدام کە تۆ لێت خوارد!!

لێرەدا ئەبو بەکر هەستی بـە حـەرامی ئـەو کـارە کـرد کـە ئـەو خزمـەتکارەی ئەنجامی داوە خێرا دەستی کرد بە دەمیدا و خۆی ڕشاندەوە (البخاری)

بەم شێوەیە ئەبو بەکر﷛ هەوڵی دەدا لە حەلاڵ نەبێت نەیخوات لەمەشدا بـە گوێی فەرمایشتی پێغەمبەری دەکرد کە دەفـەرموێت: خواردنـت حـەلاڵ و پـاک بێت، دوعاو پاڕانەوەت وەر گیراو دەبێت (أبن مردویە)

---

سوننەتە موسڵمان لە کاتی خواردندا لە سەر قاچی چەپ دا دەنیشـێت و قاچـی ڕاستی ڕاست ڕابگرێت، یان لە سـەر هـەر دوو ئـەژنۆی دادەنیشـێت هـەروەک پێغەمبەرﷺ کردوویەتی.

# قِصَصُ آدابِ الطَّعامِ والشَّرابِ

الطَّعامُ والشَّرَابُ نعمَتانِ مِنْ نِعَمِ اللهِ، الَّتي سَخَّرَها للإنسان، وجَعَلَهُ يَتذوَّقُ حلاوتَها ولَذَّتَها، مَعَ اختلافِ الشَّكلِ والطَّعمِ، قالَ تعالَى: ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِي ٱلْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ [الرعد: ٤].

والمُسلِمُ دائماً يَبحَثُ عنِ الطَّعامِ الحَلالِ ويَبتَعِدُ عنِ الحَرامِ؛ يَقولُ تعالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ [البقرة:١٧٢]. وحينَ يأكُلُ المُسلِمُ أو يَشرَبُ فَهُوَ يَنْوِي بِذَلكَ أنْ يَتقوَّى علَى طاعَةِ اللهِ، فيَستَطِيعُ القِيامَ بأداءِ دَورِهِ فِي الحَياةِ.

ولِلطَّعامِ آدَابٌ قَبْلَ الأكلِ، وأثناءَ تَناوُلِه، وعِندَ الانتِهاءِ مِنهُ، كمَا أنَّ لِلشَّرابِ آداباً كذلكَ، فيَنبغِي علَى المُسلِمِ أنْ يَلتَزِمَ بِها؛ حتَّى يَفُوزَ بِرِضَا اللهِ تعالَى.

وهذَا الكتابُ، قدَّمَ لنَا بعضَ هذهِ الآدابِ؛ مِنْ خِلالِ القِصَصِ الطَّرِيفَةِ والحِكاياتِ الجميلةِ.

# چیرۆکی ئادابەکانی خواردن و خواردنەوە

خواردن و خواردنەوە دوو بەخششی خوای گەورەن، کە بۆ مرۆڤ بـە دیهێنـاوە و چێژی لی وەردەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە شێوازو تامدا جیاوازن.

خوای گەورە دەفەرموێـت: لەسەر ڕوکاری زەوی پارچەی جۆراو جـۆر هەیـە لـە پـاڵ یەکـدا، هـەروەها بـاخی ڕەزو تـریێ، کشـتوکاڵی هەمـە جـۆر لـە دانەوێڵـەو بیستانەکاندا، دار خورمای یەک قەدوو دوو قەد، هـەموو ئەمانـە بـە یـەک ئـاو ئاودێر دەکرێن و لە یەک جۆر ئاو دەخۆنەوە و هەندێکیانمان لە هەندێکی تـر بـۆ خۆراکی ئادەمیزاد نازدار تر و پەسەند تر کردووە، بە ڕاستی ئـا لـەو شتانەشـدا بەڵگـەو نیشـانەی زۆر هـەن بـۆ کەسـانێک عـەقڵ و ژیـری خۆیـان بخونـە کـار سورەتی الرعد /٤

موسڵمان هەمیشە بە شوێن خۆراکی پاک و حەڵاڵ دەگەڕێت و خۆ لـە حـەرام و قەدەغە کراو دەپارێزێـت خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە لـەو خواردنـە پاکانـە بخـۆن کـە کردومانـە بـە ڕۆزی ئێـوە (سـورەتی البقرە/١٧٢).

کاتێک موسڵمان دەخوات و دەخواتەوە مەبەستی ئەوەیە بە هێز بێـت و توانـای پەرستنی خواو بەندایەتی هەبێت و بە ئەرکی خۆی لە ژیاندا هەستێت.

پێش خـواردن کۆمـەلێک ئـاداب هەیـە، لـە کـاتی خـواردن و تـەواو بـوونیش هەروەها خواردنەوەش ئادابی هەیە، پێویستە موسڵمان پابەند بێـت پێیانـەوە تـا ڕەزامەندی خوای دەست گیر بێـ ئـەم پـەڕاوە هەنـدێ لـەو ئادابانـەی لـە خـۆ گرتووە و لە ڕێگەی کورتە چیرۆک و بە سەر هاتی جوانەوە فێرمان دەکات.

# ئادابی یاری و گاڵتە

نوسینی: شعبان مصطفی قزامل

وەرگێڕانی: م. ناصح محمد شارباژێری

# الفِتْيَانُ العُرَاةُ

ذاتَ يَومٍ، خَلَع بعضُ فتيانِ مكَّةَ مَلابِسَهم، وجَعَلُوهَا كالحِبَالِ يَتبادَلُون بِهَا الضَّرْب.

وبَيْنَمَا الفتيانُ كذلك، مر عليهمُ اثنانِ مِنْ صحابةِ رَسولِ الله ﷺ فاستَهزَأ الفتْيانُ بِهِما، وظَلُّوا يَلْعَبونَ وَهُمْ لا يُبَالونَ ولاَ يحتَرِمُون السَّاتِرِين

ثُمَّ مر رسولُ الله ﷺ بهِم، فلَمَّا رأَوْهُ تَفَرَّقُوا، ورجَعَ الرَّسولُ ﷺ إلى بَيتِه غاضِباً، وهوَ يَقُولُ عَنْهُم: «سُبحانَ الله، لا مِنَ اللهِ استَحْيُوا، ولاَ منْ رسولِه استَتَرُوا». فقالَتْ لَهُ أمُّ أيمنَ: اِستَغفِرْ لَهُم يا رسول الله. وألَحَّتْ عَلَيهِ لكي يستغفِرَ لَهُم، فلَمْ يَستغفِرْ لَهُمُ النَّبيُّ ﷺ.[أحمد والطبراني].

وأرادَ النَّبيُّ ﷺ بذلكَ أنْ يُلْفتَ نظَرَ المُسلمينَ إلَى وُجُوبِ سَتْرِ العَوْرَةِ، والتزامِ الآدابِ العامَّة أثناء مُمارَسةِ اللَّعبِ، فلا عُرْيَ ولا اسْتِهْزَاء بالنَّاسِ

---

اللَّعبُ هوَ نَشاطٌ يَقُومُ بِه الإنسان بِغَرَضِ تَجديدِ حَيَويَّتِهِ ونَشاطهِ والتَّرويحِ عنِ نَفسِهِ، وتَنْمِيةِ بعضِ مهاراته.

# لاوە بێ پۆشاکەکان

رۆژێک کۆمەڵێک گەنجی مەککە پۆشاکەکانی بەریان داکەندبوو وەک حەبل ـولیان کردبوو، بەیەکتریاندا دەکێشا. لەو کاتەدا ئەوان ئەو کارەیان دەکرد، دوو هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بەلایاندا رۆشتن، گەنجەکان گاڵتەیان پێکردن‌و باکیان نەبوو، هیچ رێزیان بۆ ئەو کەسانە دانەدەنا کە بەلایاندا دەرۆشتن.پاشان پیغەمبەرﷺ بەلایاندا رۆشت، کاتێک پێغەمبەریان بینی بلاّوەیان لێکرد، پیغەمبەرﷺ بە تورەیی گەرایەوە بۆ ماڵ دەربارەی ئەو گەنجانە دەیفەرموو: سبحان اللّٰه شەرم لە خوا ناکەن و لەبەردەم پێغەمبەری خواشدا خۆیان داناپۆشن.

ئوم ئەیمەن رضي الله عنها پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبونیان بۆ بکە. وە زۆر جەختی لێ کردەوە تا داوایان بۆ بکات. بەلاّم پێغەمبەرﷺ داوای لیخۆشبونی بۆ نەکردن(احمد والطبراني).

پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەبوو کە موسوڵمانان ئاگادار بکاتەوە کە داپۆشینی عەورەت پێویستە، وە دەبێت لەکاتی گاڵتەو یاریدا بە ئادابە گشتیەکانەوە پابەند بین. خۆ رووتکردنەوەو گاڵتە بە خەڵک کردنی تیا نەبێت.

---

یاری کردن چالاکیەکە مرۆڤ ئەنجامی دەدات بە مەبەستی چالاکی‌و تەندروستی و خۆراهێنان‌و گەشەدان بە تواناکانی مرۆڤ.

# المِزَاحُ الحَرَامُ

فِي إحدَى غَزَواتِ المُسلمينَ، أوقَدَ المُسلمونَ ناراً، وكانَ عبدُ الله بنُ حُذَافَةَ أميراً علَى الجَيشِ، فقالَ للمُسلمينَ: أليس لِي علَيكُمُ السَّمْعُ والطَّاعةُ؟ قالُوا: بلَى.

فأمَرَ عبدُ الله الجُنودَ المُسلمينَ أنْ يُلْقُوا بأنفُسهم فِي النَّارِ. فقامَ ناسٌ لِيُلقُوا أنفُسَهم في النَّارِ؛ فمَنَعَهُم آخَرُونَ. فلَمَّا رأى عبدُ الله إصرَارَهم، قالَ: لا تَفعَلُوا، فإنَّما كنتُ أمزَحُ مَعكُمْ.

وعندمَا عادَ الجَيشُ، ذكَرَ المُسلمونَ تلكَ القصَّةَ لرسولِ الله ﷺ فقال: «مَنْ أمَركُم مِنْهُم بِمَعْصيةِ اللهِ فلاَ تُطِيعُوهُ» [ابن ماجه]

وبِذلكَ نبَّهَ النَّبيُّ ﷺ المُسلمينَ إلى المُزَاحِ الحَلالِ والمُزَاحِ غيرِ المَرغوبِ فيه، فالمُزَاحُ الَّذي يَتَجاوَزُ الحُدودَ، ويُبْنَى علَى معصيةِ الله مُحَرَّمٌ علَى المُسلمينَ.

---

المُزَاحُ قَولٌ أو فِعلٌ يصْدُرُ عنِ الإنسانِ بقَصْدِ المُلاَطَفة والمُدَاعبة وإزالَة الفُتُورِ والمَلَلِ والرَّتَابة.

# گاڵتەی حەرام

لە یەکێک لە غەزاکاندا، موسوڵمانان ئاگرێکیان کردەوە (عبداللە کوڕی حوزافە) فەرماندەی ئەو سوپایە بوو، بە موسوڵمانەکانی ووت: ئایا پێویست نیە کە ئێوە گوێڕایەڵی من بکەن؟ وتیان: بەڵێ. ئینجا عبداللە فەرمانی بە سەربازە موسوڵمانەکانی کرد خۆیان بخەنە ناو ئاگرەکەوە، هەندێ کەس هەستان تا خۆیان فڕێ بدەنە ناو ئاگرەکەوە، هەندێکی تریان ڕێیان لێگرتن‌و نەیان هێشت، کاتی عبداللە بینی ئەوان سورن لەسەر گوێڕایەڵی، وتی: وامەکەن، من گاڵتەم لەگەڵدا کردن. کاتێ سوپاکە گەڕایەوە. موسوڵمانان ئەم بەسەرهاتەیان بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: هەرکەسێک فەرمانی بە ئێوە کرد بە شتێ کە سەرپێچی خوای تیا بوو، گوێڕایەڵی مەکەن(ابن ماجە).

بەمەش پێغەمبەرﷺ هۆشیاری دا بە موسوڵمانان دەربارەی گاڵتەی دروست‌و گاڵتەیەک کە شیاو نیە، ئەو گاڵتەی تیایدا سنورەکان دەبەزێنرێن‌و لەسەر بێ فەرمانی خوا بنیات دەنرێت لەسەر موسوڵمانان قەدەغەکراوە.

---

گاڵتەکردن: گوفتار یان کردارێکە کە مرۆڤ بە مەبەستی یاری‌و خۆشی‌و ڕەواندنەوەی بێزاری‌و خەفەت‌و ناهەمواری ئەنجامی دەدات.

# مِزَاحُ النَّبيِّ ﷺ

في يومٍ من الأيَّامِ، رأى النَّبيُّ ﷺ زاهِر بنَ حرَامٍ الأَشْجَعِيَّ رضي الله عنه وهُوَ يَبِيعُ تجَارَتَهُ، فاحتَضَنَهُ مِنْ خَلْفِه، وزَاهِرٌ لا يَرَاهُ ويَقُولُ: اترُكْنِي.. مَنْ هَذَا؟

ثُمَّ التفَتَ زاهِرٌ، فعرَفَ أنَّهُ النَّبيُّ ﷺ، فَلَصَقَ زاهِرٌ ظَهْرَهُ بِصَدْرِ النَّبيِّ ﷺ، والنَّبيُّ ﷺ يَمْزَحُ معَهُ، ويَقولُ: «مَنْ يَشْتَرِي العَبْدَ؟»

فقالَ زاهِرٌ يا رسولَ الله.. إذَنْ ـ واللهِ ـ تَجِدُنِي كاسِداً (أي: لَنْ تَجِدَ مَنْ يَشتَرِينِي». فقَالَ لَهُ الرَّسولُ ﷺ: «لكِنْ عندَ الله لَستَ بِكَاسِدٍ» [أحمد].

وهكذَا كانَ النَّبيُّ ﷺ يَستَمِيلُ قُلوبَ أصحابِهِ بِمُزاحِهِ الطَّيِّبِ، ويَبُثُّ فِيهِم رُوح الدُّعابَةِ والمرَحِ، حتَّى لا يَنْفَضُّونَ مِنْ حَوْلِهِ ولاَ يَرْهَبُونَهُ، فَيُجَافُونَهُ ويَخافُونَ مِنْه كما يَخَافُ الفُرْسُ والرُّومُ منْ زُعَمائِهِم وقَادَتِهِم.

---

المُسلمُ لا يَكذِبُ فِي مُزَاحِه، فقَدْ قالَ الصَّحابَةُ للنَّبيِّ ﷺ: يا رَسولَ الله إنَّكَ تُداعِبُنَا، فقال: «إنِّي وإنْ داعَبْتُكُم لا أَقُولُ إلاَّ حَقًّا» [الترمذي].

# گاڵتەکردنی پێغەمبەرﷺ

رۆژێک لە ڕۆژان، پێغەمبەرﷺ زاهیر کوڕی حەڕامی ئەشجەعی رضي الله عنه بینی کە ـرر‌گانی دەکات، لە پشتەوە باوەشی پێداکردو لە ئامێزی گرت(زاهیر ـیغەمبەری نەبینی، بۆیە دەیوت: وازم لێ بهێنە، بەرمبدە!.. ئەمە کێ یە؟!

باشان لای کردەوە. ئینجا زانی کە پێغەمبەرەﷺ بۆیە پشتی لکاند بە سنگی ـیغەمبەرەوە و پێغەمبەریش گاڵتەی لەگەڵ کردو دەیفەرموو: کێ ئەم بەندەیە دەکڕێت؟ زاهیر وتی: ئەوەتا ئەی پێغەمبەر ﷺ دەبینی من لاوازم و ڕوتو رەجاڵم و کەس منی ناوێت و کەس نامکڕێت! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەلاَم لای خوای گەورە ڕوتو رەجاڵ نیت (أحمد).

بەم شێوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە گاڵتەی پاکو شیاو دڵی هاوەڵانی کەمەندکێش دەکردو گیانی یاریو سوعبەتی تیا دەچاندن، تا ئەوانیش لە دەوری بلاَوە نەکەنو لێی نەترسن، ئەگەر ئەو ساردو سڕ بوایە لەگەڵیان ئەوانیش لێی دەترسان هەروەک چۆن فارسو ڕۆمەکان لەسەر کردەکانیان دەترسان.

---

موسوڵمان لە کاتی گاڵتەشدا درۆ ناکات، هاوەڵان بە پێغەمبەریان ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆش گاڵتەمان لەگەڵ دەکەیت؟ فەرموی: من هەرچەندە گاڵتەتان لەگەڵ دەکەم، بەلاَم جگە لە ڕاستی شتی تر ناڵێم. (ترمذي).

# الهَدَفُ

فِي يَومٍ مِن الأيَّـامِ.. مَـر عبـدُ الله بـنُ عُمَـرَ بـنِ الخَطَّـابِ - رَضي اللهُ عنهما - بفِتْيانٍ مِنْ قُرَيشٍ، قَـدْ وَضَـعُوا طـائراً فِـي مَكانٍ وجَعَلُوهُ هَدَفاً يُصَـوِّبُونَ نَحْـوهُ سِـهامَهُم، وأخَـذَ الفِتيـانُ يَرْمُونَ الطَّائرَ بالسِّهامِ، وجَعَلُوا لصاحِبِ الطَّائرِ كُلَّ السَّهامِ الَّتِي لا تُصيبُ الطَّائرَ.

فلَمَّا رأى الفتْيانُ ابْنَ عُمَرَ سائراً نَحْوَهُم، خافُوا وتَفرَّقُوا، فقَالَ ابنُ عُمَرَ مَنْ فَعَل هذَا؟ لَعَنَ اللهُ مَنْ فَعَلَ هذَا. إنَّ رَسـولَ الله ﷺ لعَنَ مَنِ اتَّخـذَ شـيئاً فِيـه الـرُّوحُ غَرَضـاً (هَـدَفاً لِلرِّمايَـةِ). [مسلم].

ومِنْ هذه القصَّةِ نَستَفِيدُ دَرساً عَظِيمـاً، وهُـوَ أنَّ الإسـلامَ دِينُ رحمةٍ لِجَمِيعِ المَخلوقاتِ، لاَ يَرْضَى أنْ يَتأذَّى كائِنٌ حَـيٌّ أو يَتألَّمَ، وأنَّهُ دِيْنٌ يُوَجِّهُ أصحابَهُ إلَى طَرِيقِ الخَيرِ زَارِعـاً فِـي نُفُوسِـهِمْ بُـذُورَ الرَّحمـة والشَّـفَقة، فالطَّـائرُ أوِ الحَيَـوانُ يتَـألَّمُ ويُعانِي مِنَ الألَمِ كمَا يُعانِي الإنسـانُ تَماماً.

---

مِنْ آدابِ اللَّعبِ: عدَمُ اتّخاذ شَيءٍ فيه الرُّوحُ هَدَفاً لِلرِّمايَةِ؛ قالَ رَسولُ الله ﷺ: «لا تَتَّخذُوا شيئاً فيه الرُّوحُ غَرَضاً» [مسلم].

# نیشانە

رۆژێک لە رۆژان، عبدالله کوڕی عومەری کوڕی خەتاب﷠ بەلای کۆمەڵێک میرد منداڵی قورەیشیدا رۆشت، ئەوان باڵندەیەکیان کردبووە نیشانەو تیریان بۆ دەهاویشت، بڕیاریان دابوو هەر تیرێک باڵندەکە نەپێکێت، ئەوە ئەو تیرە دەبێتە مافی خاوەن باڵندەکە، کاتێ منداڵەکان (عبدالله کوڕی عومەر)یان بینی کە بەرەو لای ئەوان دەچێت ترسان و بڵاوەیان لێکرد.

عبدالله فەرمووی: ئەوە کێ ئەو کارەی کردووە؟ نەفرینی خوا لەو کەسە بێت ئاوا کارێک دەکات!! بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لە ئەو کەسانەی گیانلەبەر دەکەنە نیشانەو تیری تێدەگرن.(مسلم).

لەم چیرۆکەوە وانەیەکی گەورە فێر دەبین، ئەویش ئەوەیە کە ئیسلام پەیامی بەزەیی و سۆزە بۆ هەموو دروست کراوان، هەرگیز رازی نابێت بونەوەرێکی زیندو ئازار بدرێت جاهەر شتێک بێت. بەڕاستی ئیسلام پەیامێکە شوێنکەوتوانی بۆ رێگەی چاکە هاندەدات، تۆوی بەزەیی و میهرەبانی و سۆز لە دەرونیاندا دەچێنێ چونکە باڵندەو زیندەوەرانی تریش هەروەک مرۆڤ ئازار دەچەژن و هەست بە ئازار دەکەن.

---

ئادابی یاریکردن: نابێت شتێک کە گیانی هەیە بکرێتە نیشانە و ئامانج. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هیچ شتێک کە گیانی تیایە مەکەنە ئامانج و نیشانە.(مسلم).

# العَجُوزُ والجَنَّةُ

جاءَت امرأةٌ عَجُوزٌ إلَى رسول الله ﷺ، وقالَتْ لَهُ: يا رسولَ الله، أُدْعُ اللهَ أنْ يُدْخِلَنِي الجنَّةَ. فقالَ لَهَا النَّبيُّ ﷺ مُدَاعِباً: «يا أُمَّ فُلان؛ إنَّ الجنَّةَ لاَ يَدْخُلُها عَجُوزٌ»، فحَزِنَت المرأةُ وخَافَتْ، فقالَ لَهَا النَّبيُّ ﷺ: «إنَّكِ تَعُودِينَ إلى صُورةِ الشَّبابِ فِي الجنَّة» [البيهقي].

يَقولُ الله تعالَى ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ (٣٥) فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا﴾ [الواقعة: ٣٥ ـ ٣٦].

فَفَرِحَت المرأةُ بِبشَارةِ النَّبي ﷺ، وعَرَفَتْ أنَّ النَّبيَّ ﷺ قالَ لَهَا ما قالَ لِيُدَاعِبَها ويرْسُمَ الابتسامةَ علَى وجهِهَا، ويَبُثَّ الأَمَل فِي نَفسِهَا.. إذْ كيف يَتَمتَّعُ الإنسانُ بالجنَّة وهُوَ عَجوزٌ أو شَيخٌ كَبيرٌ؟ أمَّا الشَّبابُ فتُمَيِّزُه الصحَّةُ والقُوَّةُ والقُدْرةُ علَى مُمارَسة شُؤُون الحياة، والاضْطِلاعُ بمسؤُوليَّاتها. وهكذَا نَتعلَّمُ مِنْ رَسولِ الله ﷺ الابتسامةَ في وجه الحياة فَلاَ نَتَجَهَّمُ لها أو نُعاندُهَا يائسينَ مِنْهَا، إنَّمَا نَقِفُ صَامِدِينَ أمامَ مُشكلاتِهَا..

---

المُسلمُ يُفرِّقُ بينَ أوقات المُزَاحِ والجدِّ، ولاَ يَخْلُطُ بينَهُمَا؛ قالَ ﷺ: «لَو تَعْلَمُونَ ما أَعلَمُ لَبكَيتُم كثيراً ولَضَحكتُم قَليلاً» [متفقٌ عليه].

# پیرەژن و بەهەشت

ڕۆژێک ئافرەتێکی بەساڵاچوو هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا، داواو دوعام بۆ بکە بچمە بەهەشت؟ پێغەمبەر ﷺ بە گاڵتەوە پێی فەرموو: بێگومان بەهەشت کەسی پیری ناچێتە ناو! ئافرەتەکە زۆر خەمبارو بێتاقەت بوو، وە زۆر ترسا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمری: تۆ دەگەڕێیتەوە سەر شێوازی گەنجی‌و لاوی لە بەهەشتدا(البیهقی).

خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە جارێکی تر دروستیان دەکەینەوەو دەیانخەینەوە سەر کاتی گەنجی‌و چواردە ساڵی.(الواقعه ٣٥).

ئیتر پیرەژنەکە بەم مژدەی پێغەمبەر ﷺ شادومان بوو، وە زانی کە بەگاڵتەوە وای فەرموو، خەندەو پێکەنین کەوتە دەم‌و چاوی و هیواو ئامانجی بۆ گەڕایەوە.

چونکە بیری کردەوە ئایا مرۆڤ بە پیری چ خۆشییەک لە بەهەشت دەبینی؟ کە گەنج‌و لاو بوو لەش ساغ‌و بەهێزو توانایە لەسەر ژیان‌و هەڵسوڕانی کاروبارەکان، وە دەتوانێ ئەرکی سەرشانی ئەنجام بدات. بەم شێوە لە پێغەمبەر ﷺ وە فێر دەبین خەندە بخەینە ڕوی ژیان‌و نائومێد نەبین، بەڵکو هەمیشە دامەزراوو خۆڕاگر بین لە بەرامبەر گرفت‌و نارەحەتیەکاندا.

---

موسوڵمان جیاوازی دەخاتە نێوان کاتەکانی گاڵتەکردن‌و کاتی کارکردن وە ئەو دووانە تێکەڵ ناکات.پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوەش بتانزانیایە زۆر دەگریان‌و کەم پێدەکەنین.(متفق علیه).

# المُصارَعةُ

كانَ فِي مكَّةَ رجل قَويٌّ، يُسمَّى: رُكَانَةُ، لاَ يَستَطِيعُ أحَـدٌ أنْ يَغلبَهُ فِي المُصارَعة. وذاتَ يَومٍ طَلَبَ رُكَانَةُ مِنَ النَّبيِّ ﷺ أنْ يُصارِعَهُ، ووَعَدَهُ أنْ يُعطِيَه شَاةً إذا غلَبَـهُ، فصـارَعَهُ الـنَّبيُّ ﷺ فغَلَبَهُ، وأخَذَ الشَّاة. فقال رُكَانَةُ: عَاوِدْ فِي أُخرَى. فصَرَعَهُ النَّبيُّ ﷺ مَرَّةً أُخرَى، وأخَذَ شاةً ثانيةً. فقالَ: عَاوِدْني. فصَرَعَهُ الـنَّبيُّ ﷺ وأخَذَ شاةً ثالثةً. فقال رُكَانَةُ: ماذا أَقولُ لأَهلِي؟ شـاةٌ أكَلَهـا الذئبُ، وشاةٌ هربتْ، فما أقُولُ فِي الثَّالثة؟

فقــالَ الــنَّبيُّ ﷺ: «مــا كُنَّــا لنَجْمَــعَ علَيــكَ أنْ نَصْــرَعَكَ ونُغَرِّمَكَ.. خُذْ غَنَمَكَ» [أبو داود].

وكانَ النَّبيُّ ﷺ يَهـدفُ مـنْ وَراء هـذه المُصـارَعة إلى أنْ يُلَقنَ رُكَانَةَ دَرْساً، يجعَلهُ يَنْسى تَكبُّرَهُ وعنادَهُ، ويَتذكَّرُ أنَّ هناكَ منْ هوَ أقْوى منْهُ، فعَلَيهِ أنْ يَتَواضَـع، ولاَ يَسـتَعْرِض عضَـلاتِه على غَيرِه مِن النَّاسِ.

---

على المُسلِم أنْ يكُونَ مُتَواضعا لله تعالَى، فلاَ يَغْتَرَّ بِمَـا أَنعَـمَ اللهُ علَيـهِ من نِعْمة الصِّحَّة، وعليهِ أنْ يُسخِّرَهَا فِيما يُرْضِي اللهَ عزَّ وجلَّ.

# زۆرانبازی

لە شاری مەککەدا پیاوێکی بەهێزو بە توانا هەبوو ناوی(روکانە) بوو کەس لە زۆرانبازیدا نەیدەتوانی زال ببێت بەسەریدا. ڕۆژێک (روکانە) داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد تا زۆرانبازی لەگەڵ ئەنجام بدات وە بڕیاریدا ئەگەر لێی بردەوە بەرانێک ببەخشێ بە پێغەمبەرﷺ. پێغەمبەرﷺ زۆرانبازی لەگەڵ کردو بەسەریدا زاڵ بوو، وە بەرانەکەی بردەوە. روکانە وتی: با دووبارەی بکەینەوە؟ ئەمجارەش پێغەمبەرﷺ زاڵ بوو بەسەریداو مەڕێکی تری وەرگرت، جاری سێ هەمیش داوای زۆرانبازی کردو ئەمجارەش دۆڕاو پێغەمبەرﷺ مەڕی سێ هەمی بردەوە. روکانە وتی: جا چی بە کەس وکارم بڵێم؟ مەڕێک گورگ خواردی و یەکێک ڕای کردو، ئەی سێ هەم بڵێم چی؟! پێغەمبەرﷺ فەرموی: نامانەوێت لە زۆرانبازیدا زاڵ بین بەسەرتداو قەرزارباریشت بکەم. بڕۆ مەڕەکانت ببەرەوە بۆ خۆت(ابو داود).

پێغەمبەرﷺ لەم زۆرانبازیەدا مەبەستی بوو وانەیەک فێری روکانە بکات و فیزو خۆ بەگەورەزانینی بشکێنێت، وە بزانێت کەلەخۆی بەهێزتر هەیە، بۆیە دەبێت خاکی و کەسێکی سادە بێت، بازووی بەسەر خەڵکدا نیشان نەدات.

---

پێویستە موسوڵمان سادەو مل کەچی خوا بێت و بەو شتەی کە خوا پێی بەخشیوە غەڕڕاو لەخۆ گۆڕاو نەبێت، بەڵکو دەبێت لەش ساغی و هەموو نیعمەتەکان لە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوادا بەکاربهێنێ.

# السِّبَاقُ

كَانَ هناكَ صحَابِيٌّ مِنَ الأنصارِ مَشْهورٌ بِسُرعَتِه فِي الجَرْيِ، وفِي أثناءِ رُجوعِ المُسلمينَ مِنْ إحْدَى الغَزَواتِ، أخَذَ يُنادِي ويَقولُ هلْ مِنْ مُسابقٍ إلى المَدينةِ؟ وظَلَّ يُعِيدُ النِّداءَ ويُكَرِّرُهُ. فلَمَّا سمعَهُ سَلَمَةُ بنُ الأكوَعِ رضي الله عنه، قالَ لَهُ أمَا تُكْرِمُ كَرِيماً ولاَ تَهَابُ شَرِيفاً؟ قالَ الرَّجلُ لا، إلاَّ أنْ يَكُونَ رسولَ الله ﷺ.

فطَلَبَ سَلَمةُ مِنْ رسولِ الله أنْ يَأْذَنَ لَهُ فِي التَّسابُقِ مَعَ ذلكَ الرَّجلِ. فأذِنَ لَهُ النَّبيُّ ﷺ قائلاً لهُ «إنْ شِئتَ».

فتَرَكَ سَلَمةُ الرَّجُل يجْرِي أوَّلاً، وبعدَ قليلٍ بدأ سَلَمةُ يَعْدُو وراءَهُ حتَّى لَحقَ بِهِ، وسَبَقَهُ. [مسلم].

وهكَذَا لَمْ يَكْتَفِ سَلَمةُ بأَنْ سابَقَ الرَّجُلَ، بَلْ طَلَبَ منْهُ فِي بِدَايةِ السِّباقِ أنْ يَتَقدَّمَهُ فِي العَدْوِ، ثم عَدَا وراءَهُ، وسَبَقَهُ، لِيُعْطِيَهُ دَرْساً بَلِيغاً فِيما يَجِبُ أنْ يَتَحلَّى بِهِ الرَّجلُ الرِّياضِيُّ مِنَ الأَخْلاقِ.

---

يَنْبَغِي أنْ يكُونَ البَطَلُ الرِّياضِيُّ مُتَواضِعاً، فلاَ تكَبُّر ولاَ خُيَلاء علَى مُنَافسِيهِ. وقدْ قيل تَواضعْ عندَ النَّصرِ؛ وابتَسِمْ عندَ الهَزِيمَة.

# پێشبڕکێ

هاوەڵێکی ئەنساری هەبوو، بە خێرایی لە ڕاکردندا ناسرابوو، لەکاتی گەڕانەوەی موسوڵمانان لە یەکێک لە غەزاکاندا، هاواری کردو وتی: کەس هەیە ڕاکردنو پێشبڕکێم لەگەڵدا بکات تا مەدینە؟ بەم شێوەیە بانگەوازەکەی دووبارەو دووبارە دەکردەوە، کاتێک (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع) بیستی. پێی ووت:ئەوە ڕێز لە بەڕێز ناگریت، لە شەریفـو خانەدان ناترسی؟! پیاوەکە وتی: نەخێر ناترسم. مەگەر پێغەمبەری خواﷺ بێت!! سەلەمە داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد تا مۆڵەتی بدات، پێشبڕکێکی لەگەڵدا بکات پێغەمبەرﷺ مۆڵەتیدا و فەرموی: (ئەگەر خۆت بتەوێ).

سەلەمە وازی لە کابرا هێنا تا ماوەیەک ڕابکات پێش ئەو، پاش کەمێک سەلەمە شوێنی کەوت تا گەشتەوە بە کابرا، دواتر بە تەواوی پێشی کەوت(مسلم).

بەم شێوەیە سەلەمە هەر بەوەندە ڕازی نەبوو کە پێشبڕکێ لەگەڵ کابرادا بکات بەڵکو وازی لێهێنا تا پێش بکەوێت پاشان خۆی لە دوای ئەو دەستی بە ڕاکردن کردو پێشی دایەوە. بۆ ئەوەی وانەیەکی کاریگەری فێر بکات کە دەبێت مرۆڤی وەرزشەوان خۆی پێ ڕەوشتدارو جوان بکات.

---

دەبێت پاڵەوانی بواری وەرزش کەسێکی سادەو خاکی بێت، خۆی بە گەورە نەزانێت و فیز بەسەر بەرامبەرەکانیدا نەکات.

وتراوە: لە کاتی سەرکەوتندا سادەو خاکی و بێ فیزبە، لە کاتی شکستدا دەم بە زەردەخەنەبە.

# الحَبْلُ

كـانَ الصـحَابةُ يَسـيرونَ مَـعَ الـنَّبيِّ ﷺ، وفِـي الطَّريـق، جَلَسُوا يَستريحُونَ، فنَامَ رجلٌ منْهم، فأَخَذَ صـاحِبٌ لَـهُ حَـبْلاً كانَ معَهُ وأخْفَاهُ. فلَمَّا استَيقَظَ الرَّجلُ لَمْ يَجِـد الحَبْـلَ، فَفَـزِعَ واضْطَّرَب، وظَنَّ أنَّهُ فقَدَ الحَبْلَ

فأخْبَرَ النَّبيُّ ﷺ أصحابَهُ أنَّ مِثلَ هذه الأشـياء لا يَجُـوزُ فيهـا المُزَاحُ أوِ اللَّهْوُ؛ لمَا تُحْدثُهُ مِنَ الخَوفِ والفَزَعِ والضِّيْقِ فِي نُفُوسِ الآخَرينَ، فقالَ «لا يَحِلُّ لمُسلمٍ أنْ يُرَوِّعَ مُسلماً» [أبو داود].

ومِنْ هذه القصَّة نَسـتفِيدُ أنَّ المُـزَاحَ يَكُـونُ مُباحـاً إذَا لَـمْ يَترتَّبْ عليهِ ضَرَرٌ بالآخَرين، فالمُسلمُ الحَقيقِيُّ لا يكتَمِلُ إيمانُهُ إلاَّ إذَا سَلِمَ المُسلمونَ منْ لِسانه ويَدِهِ، فلاَ يَشـتُمُ ولاَ يَسُـبُّ، ولاَ يُؤْذِي أحَداً بِيَده، إنّمَا يَنْبَغِي عليـهِ أنْ يكُـونَ صُـورةً طَيِّبـةً للإنسانِ الصَّالِحِ المُسالِمِ، لكَـيْ يَطمـئِنَّ إليـه النَّـاسُ ويُحِبُّونَـهُ ويُشارِكُونَهُ فِي الحياة.

فالإسلامُ دِينُ رحمةٍ وتَسامُحٍ وإخَاء وإنسَانيَّةٍ.

---

قالَ النَّبيُّ ﷺ: «لاَ يَأْخُذَنَّ أحَدُكُم مَتَاعَ أخيهِ لاعِباً ولاَ جَادَّاً، ومَنْ أخَذَ عَصَا أخيهِ فَلْيَرُدَّهَا». [أبو داود والترمذي].

# پەت

هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەرﷺ دا دەڕۆشتن، لە ڕێگەدا لایاندا بۆ پشودان، پیاوێک لەوان خەوی لێکەوت، هاوەڵێکی پەتێکی هەڵگرت‌و براکەی پێ ترساند کاتی خەبەری بۆوەو پەتەکەی نەدۆزییەوە؛ ترساو ڕاپەڕی‌و وای زانی پەتەکەی لێ وون بووە.

پێغەمبەرﷺ ئاگاداری هاوەڵانی کردەوە کە ئەو جۆرە کارانە دروست نیە گاڵتەی لە بارەوە بکرێت، چونکە ترس‌و دڵە ڕاوکە دروست دەکات.

فەرموی:(دروست نیە موسوڵمان موسوڵمانێکی تر بترسێنێ)ابو داود.

لەم چیرۆکەوە فێردەبین کە گاڵتەکردن دروستە ئەگەر نەبێتە مایەی ترس‌و خەم بۆ خەڵکی تر؛ موسوڵمانی تەواو باوەڕەکەی تەواو نابێت مەگەر کاتێک موسوڵمانان لە دەست‌و زوبانی پارێزراوبن بە شێوەیەک نابێت قسەی ناشایستەو جوێن بدات، نابێت بە دەستی ئازاریان بدات، بەڵکو دەبێت وێنەی مرۆڤێکی چاکەخوازو بی زیان بێت. تا خەڵکی لە بەرامبەریدا دڵ ئارام بن‌و خۆشیان بوێت‌و لە ژیانیاندا بەشداری بکەن، چونکە ئیسلام پەیامی سۆزو لیبوردن‌و برایەتی‌و مرۆڤ دۆستیە.

---

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: با کەس لە ئێوە شت‌و مەکی براکەی بە ناوی سوعبەت‌و گاڵتەوە، یان بە ڕاستی نەبات. هەرکەس گۆچانی براکەشی برد با بۆی بگێڕێتەوە (ابو داود و ترمزی).

# اللّعِبُ بِالعَرَائسِ

كانَ للسيِّدة عائشة ـ رضيَ اللّه عنها ـ دُمًى (لعَبُ أطفالٍ على شكلِ عرائسٍ) تَلعَبُ بِهَا. فلَمَّا تزوَّجهَا النَّبيُّ ﷺ رأى تِلكَ العَرائس عنْدَهَا، فسأَلَهَا: «ما هذَا يا عائشةُ؟». قالَتْ: بَناتِي (عَرائِسِي).

ورأى النَّبيُّ ﷺ بين الدُّمَى فَرَساً لَهُ جَنَاحَانِ، فقالَ: «ما هذَا الَّذِي أرَى وسْطَهُنَّ؟» قالَتْ: فَرَس.

قالَ ﷺ «وما هذَا الَّذِي علَيهِ؟». قالَتْ: جَنَاحَانِ.

قالَ: «فرَسٌ لَهُ جَناحَانِ؟».

قالَتْ: أمَا سمعتَ أنَّ لِسُلَيمانَ عليه السلام خَيْلاً لها أجنحَةٌ؟! فضَحكَ النَّبي ﷺ. [أبُو داود].

وهكَذَا لَمْ يَمنَعِ النَّبيُّ ﷺ السَّيِّدةَ عائشةَ منْ أنْ تَلْعَبَ بالعَرائسِ، بَلِ ابتَسَمَ لَهَا، ومازَحَها مُزاحاً طَيِّباً؛ لِيَخْلُقَ فِي بَيتِهِ جَوّاً منَ الحُبِّ والابتِسامة، ولَمْ يَتَجَهَّمْ أو يَرفُضْ أنْ تُمَارِس السَّيِّدةُ عائِشةُ اللَّعبَ مع عرائِسِهَا.

---

كانَت السَّيِّدةُ عائشةُ ـ رضي اللهُ عنها ـ تَلعَبُ بِالدُّمَى والعَرائسِ مع صَواحِبِهَا، وهِي عندَ رسولِ اللهِ ﷺ، فيتركُهَا تَلْعَبُ معَهُنَّ، ولاَ يَنْهَاهَا. [البخارِي].

# یاری کردن بە بووك

خاتوو عائیشە ﵂ یاریەکی هەبوو کە دوو بوکەڵە بوو یاری پێدەکردن، کاتێك پێغەمبەر ﷺ خواستی (عائیشە: ئەو دوو بوکەڵەی لەگەڵ خۆیدا برد) پێغەمبەر ﷺ لای عائیشە﵂ بینینی، پرسیاری لێکرد: عائیشە ئەوانە چین؟ عائیشە﵂ فەرموی: کچەکانم (بوکەڵەکانم) هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە نێوان ئەو دوو بوکەدا ئەسپێکی بینی کە دوو باڵی هەبوو، فەرموی: ئەی ئەو شتە چیە لە نێوان دوو بوکەڵەکەدا؟ عائیشە﵂ فەرموی: ئەوە ئەسپە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەی ئەوە چیە لەسەر پشتی؟ فەرموی: ئەوە دوو باڵەکەیەتی -

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەسپو باڵی هەیە؟!عائیشە﵂ فەرموی: ئەی نەتبیستووە کە سولەیمان ﵇ ئەسپێکی هەبوو کە باڵی هەبووە؟! پێغەمبەر ﷺ پێکەنی (ابو داود).

بەم شێوە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی لە عائیشە نەگرت کە یاری بە بوکەکانی بکات بەڵکو ڕوی خۆش‌و بۆی پێکەنی‌و گاڵتەی لەگەڵ کرد.بۆ ئەوەی کەش‌و هەوایەکی پڕ لە پێکەنین‌و خۆشەویستی دروست بکات، ڕوی گرژ نەکردو بەرپەرچی یاری کردنەکەی عائیشەی نەدایەوە.

---

خاتوو عائیشە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا یاری بە بوک دەکرد، لە کاتێکدا لەلای پێغەمبەر ﷺ بوو، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی دەداو ڕێگەی لێ نەدەگرت. (البخاري).

# الرِّمَايةُ

مَرَّ النَّبي ﷺ ذات يَومٍ علَى جَماعة مِنَ المُسلمينَ، وهُم يَتَسابَقُونَ فِي الرَّمْي بالنِّبال؛ فقالَ لهم «ارْمُوا بَنِي إِسماعِيلَ، فإنَّ أباكُمْ كانَ رامياً، ارْمُوا وأنا مَعَ بَنِي فُلانٍ».

فتَوَقَّفَ أَحَدُ الفَرِيْقينِ عنِ الرَّمْيِ، فقالَ ﷺ: «ما لَكُم لاَ تَرْمُونَ؟». قالُوا كيف نرمِي وأنْتَ معهُم؟

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «ارْمُوا فَأنَا معكُمْ كُلُّكُم» [البخارِي].

وهكَذا شَجَّعَهُمُ النَّبيُّ ﷺ على الرَّمْيِ؛ لِيُتقنُوا التَّصْويب علَى الهدَف، ولِيَعرِفُوا أنَّ الدِّين لَمْ يَمْنَعْهُم مِنْ مُمارَسة هواياتِهم وألعابِهِمُ الَّتِي تَتْرُكُ أَثَراً طَيِّباً علَيهم، فَهِيَ تُقَوِّي عضَلاَتِهم وأجسامَهم، وبها يَتَقرَّبُونَ مِنْ بعْضِهِمُ البَعْض، فتَتَوثَّقُ صِلاتُهُم وتَتَوحَّدُ أهدَافُهم، فيَستَطِيعُونَ الدِّفاعَ عَنْ أرضِهم والتَّخطيطَ لمُستَقْبَلِهِم

---

المُسلمُ يَبدأُ أعمالَهُ كُلَّهَا بِنيَّةٍ صَالحَةٍ، وهُوَ فِي بِدايةِ كلِّ لُعبَةٍ يَنْوِي أنْ يُقَوِّيَ بَدَنَهُ لِيُؤَدِّي فُرُوض دِيْنِه منْ صَلاةٍ وَصِيَامٍ وجِهَادٍ.

# تیرەندازی ( تیروەشاندن )

رۆژێک پێغەمبەرﷺ بەلای کۆمەڵێک لە موسوڵماناندا ڕۆیشت، ئەوان سەرقاڵی پێشبڕکێی تیرئەندازی بوون بە ڕمەکانیان، پێی فەرمون: ئەی نەوەکانی ئیسماعیل بهاوێژن، چونکە باوکی ئێوە تیرەندازێکی باش بووە، بهاوێژن منیش لەگەڵ نەوەی فلاندام.

یەکێک لەو دوو کۆمەڵە لە وەشاندنی تیر ڕاوەستان، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەوە چی یە بۆ تیر ناهاوێژن؟ وتیان: چۆن تیر بهاوێژن لە کاتێکدا تۆ لەگەڵ ئەواندایت؟! ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: دەی بهاوێژن، من لەگەڵ هەموتانم (بخاری).

بەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ هانیدان، بۆ ئەوەی چاک فێری نیشانە پێکان ببن، وە بۆ ئەوەی بزانن کە دین ڕێگەی فیربون‌و بەدەست هێنانی هیواو ئاواتەکانیان ناگریت. ئەو یاری‌و ئاواتانەی شوێنەواری چاک‌و پاک دروست دەکات. زوبان‌و لەشەیان بەتوانا دەکات، وە لەیەکتر نزیک دەبنەوە و پەیوەندیەکانیان گەرم‌و گوڕ دەبێت‌و دەبنە کەسانێک کە ئامانجیان یەک بێت، ئیتر دەتوانن بەرگری لە خاک‌و زێدی خۆیان بکەن‌و بەرنامەی دوا ڕۆژ بۆ خۆیان دابڕێژن.

---

موسوڵمان کردارەکانی بە مەبەستێکی (نیەتێکی) پاک دەست پێدەکات، لە سەرەتای هەموو یاریەکدا مەبەستی هەیە کە لاشەی پێ بەهێز دەکات، بۆ ئەوەی بە جوانی ئەرکی سەرشانی بەرامبەر دینەکەی، وە واجباتی نوێژو ڕۆژوو تێکۆشان بەجێ بهێنێت.

# أخلاقُ المُتَسابِقِ

عَرَفَ الصَّحابةُ سِباقَ الخَيلِ والجِمَالِ، فأقَامُوا العَدِيدَ مِنَ السِّباقات تَدرِيباً لِخُيُولِهم وجِمَالهم علَى خَوضِ المَعَارك.

وكانَ للنَّبي ﷺ ناقة لا تُسْبَقُ، اسمُهَا (العَضْبَاءُ)، فجَاءَ أعْرَابي علَى جَمَلٍ، ودَخل سِباقاً معَ النَّبيِّ ﷺ فسَبَقَ العَضْباء، فتَألَّمَ لذلكَ المُسلمونَ، وقالُوا وهُمْ مُنْدَهِشُونَ سُبِقَتِ العَضْباءُ.

فقال لَهُم رَسولُ الله ﷺ: «إنَّ حَقَّاً علَى الله أنْ لا يَرْفَعَ شيئاً منَ الدُّنْيَا إلاَّ وضَعَهُ» [متفقٌ عليه].

وهَذه هِي حالُ الدُّنيا، فكُلُّ كائنٍ حَيٍّ يَنْمُو ويَمُرُّ بِمَراحِلَ عدَّة، وتَكُونُ مَرْحلَةُ الشَّبابِ هِي مَرْحلَةُ القُوَّةِ والنَّشَاطِ، والانتصَارات الرِّياضيَّةِ، ثُمَّ تأتِي مَرْحَلَةُ الشَّيْخُوخَةِ؛ مَرْحَلَةُ الضَّعف والانكسَار، فلاَ يغتَرَّ الإنسانُ بِقُوَّته أثناءَ شَبَابِه، ولْيُؤمِنْ أنَّهُ سوف يأتِي علَيهِ يومٌ يكُونُ فِيهِ ضَعيفاً لا يَقْوَى علَى عمَلِ شَيءٍ.

---

الرِّياضَةُ تُعَوِّدُ الإنسانَ تَحَمّل المَشَاقِّ والصَّبْر علَيهَا، وتُدَرِّبُهُ علَى حُسْنِ الْخُلُقِ. والرِّياضِيُّ الحَقيقِيُّ رَجلٌ فِي كُلِّ المواقِف، فلاَ يُعانِدُ ولاَ يَتكَبَّرُ

# ئاکارو ڕەوشتی کەسێك پێشبڕکێ دەکات

هاوەڵان خۆیان فێری پێشبڕکێی ئەسپ سواریو ووشتر دەکرد، چەندین پیشبڕکێیان ساز دەکرد وەك ڕاهێنانی ئەسپو وشترەکانیان تا لە گۆڕەپانی جەنگدا سەرکەون.

پیغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی هەبوو، هیچ وشترێك پێشی نەدەکەوت، ناوی عەضباء" بوو.

کابرایەك بە سواری وشترێکەوە هات، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کەوتە پێشبڕکێ، سەرەنجام پێشی وشرەکەی پێغەمبەری دایەوە، موسوڵمانان پێیان ناخۆش بوو، رور بە سەرسامی وتیان: چۆن ئەو وشترە پێشی وشترەکەی پێغەمبەرﷺ کەوت!!

پیغەمبەرﷺ پێی فەرمون: خوای گەورە بڕیاری داوە لە دنیادا هەرشتێك بەرزبکاتەوە، ڕۆژێك دێت نزمی دەکاتەوە(متفق علیه).

ئەمە سروشتی کاروباری ژیانی دنیایە، هەموو زیندەوەرێك گەشە دەکاتو بەچەند قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕ دەکات، قۆناغی گەنجیو لاوی ئەو قۆناغەیە کە ناسراوە بە بەهێزیو چالاکیو سەرکەوتن لە بواری وەرزشدا، پاشان قۆناغی پیربون دێت، کە ئەویش قۆناغی لاوازیو تێکشکانە، کەواتە با مرۆڤ بەهێزو چالاکی کاتی لاوی لە خۆی نەگۆڕێت، دڵنیابێت کە ڕۆژێك دێت لاواز دەبێتو توانای هیچ کارێکی نامێنێت.

---

وەرزشکردن مرۆڤ ڕادەهێنێ لەسەر ئارامگرتنو خۆڕاگرتن لەسەر ناهەمواریو سەختیەکان، لەسەر ڕەوشتی جوان ڕادێت، مرۆڤی وەرزشەوانی ڕاست لە هەموو هەڵوێستێکدا مەردەو فیزو خۆبەگەورە زانینی نیە.

# اللَّهْوُ بالْحِرَابِ

كانَ بَعضُ المُسلمين مِنْ بلاد الحَبَشَةِ (إثْيُوبيَا حاليًّا) يَلْعبونَ في المَسجد، ويَلْهُونَ بِحَرابِهِم ودُرُوعِهِمْ، فدَخَلَ عُمَرُ ابنُ الخَطَّابِ ـ رضي الله عنه ـ علَيهِم، فرآهُمْ يَلعبُونَ، فأمْسَكَ قَبْضَة مِنْ الحَصى، ورماهُمْ بِها حتَّى يَنصرِفُوا، ويَتَوقَّفُوا عَنْ لَعِبِهِم ولَهْوِهِمْ، فمنَعَهُ النَّبيُّ ﷺ ، وقالَ لَهُ: «دَعْهُم يا عُمَرُ».

ومَرَّةً أُخرَى، كان الأَحباشُ يَلعَبُونَ فِي يوم عِيد، فدَعَا النَّبيُّ ﷺ السَّيِّدةَ عائشةَ ـ رضي الله عنها ـ إِلَى مُشاهَدَةِ لَعِبِهِمْ، فأوْقَفَهَا وراءَهُ، فظَلَّتْ تُشاهدُ ألعابَهُم حتَّى مَلَّتْ. [البخاري].

وهذَا هُوَ شأنُ الدِّينِ الإسلامِي مع مُختَلَفِ الأَلعابِ الَّتِي تُساعدُ علَى بِناء جسم الإنسانِ، إِذْ يُشَجِّعُ الدِّينُ علَى مُمَارستِهَا؛ لأنَّ فِي ذلكَ فائدةً للإنسانِ تَعُودُ عليه بالخَيرِ، وتُبعِد عنْهُ المَلَلَ واليَأسَ، فالإِنسانُ فِي حاجَةٍ إِلَى مُمَارَسَةِ هوَاياتِهِ وألعَابِه.

---

اختيارُ الألعابِ المُفيدة من الأُمُورِ الَّتِي يَحْرِصُ عليهَا المُسلمُ عندمَا يعزُمُ علَى مُمارَسة الرِّياضة، فهُنَاكَ لَعبٌ مُفيدٌ؛ ولَعبٌ مُضِر

# یاری کردن بە شمشێرو خەنجەر

هەندێک لە موسوڵمانانی وڵاتی حەبەشە کە (ئەثیوبیای ئێستا دەکات) لە مزگەوت یارییان دەکرد، گاڵتەیان بە قەڵغان‌و شیرەکانیان دەکرد، پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هاتە ژور بینی وا ئەوان یاری دەکەن، مشتێ وردە بەردی هەڵگرت‌و بۆی هەڵدان تا بڵاوەی لێبکەن‌و واز لە یاری‌و گاڵتەکردن بهێنن، پێغەمبەرﷺ ڕێگەی لێگرت‌و فەرموی: ئەی عومەر وازیان لێ بهێنە.

جارێکی تر، حەبەشیەکان لە ڕۆژی جەژندا یاریان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ بانگی عائیشەﷺ ی کرد بۆ بینینی یاریەکەیان، لە پشتی خۆیەوە وەستاندی، هەتا ماندو بوو سەیری یاریەکانی کردن (البخاري). ئەمە هەڵوێستی دینی ئیسلامە لەگەل یاریە جۆراو جۆرەکانی کە یارمەتی بەهێزبونی لاشەی مرۆڤ دەدەن، دین مرۆڤ هاندەدات کە ئەنجامی بدات: چونکە سودی مرۆڤی تیایە سەرەنجام دەبێتە خێرو چاکە بۆ خاوەنەکەی، وە لە بێتاقەتی‌و نا ئومێدی دووری دەخاتەوە.چونکە مرۆڤ پێویستی بە ئەنجامدانی یاری‌و بەدیهێنانی ئاواتەکانی هەیە.

---

کاتێک موسوڵمان دەیەوێت وەرزشێک ئەنجام بدات، ئیسلام هانی دەدات یاریەکی بەسود هەڵبژێرێت چونکە یاری بەسود هەیە، یاری زیان بەخش هەیە.

# هذهِ بتِلْكَ

فِي إحدَى المرَّات، تأخَّرَ النَّبيُّ ﷺ وزَوجَتُهُ السَّيِّدةُ عائشةُ ـ رضيَ اللهُ عنها ـ عنْ قافلة المُسلمينَ، فطَلَبَ النَّبيُّ ﷺ مِنْ زَوجَتِه ـ رضي اللهُ عنها ـ أَنْ تُسابِقَهُ فِي الجرْيِ، فأسْرَعَتْ وسبَقَتِ النَّبيَّ ﷺ.

وبَعْدَ مُدَّةٍ من الزَّمان، ثَقُلَ وَزْنُ السَّيِّدةِ عائشةَ ـ رضيَ اللهُ عنها ـ، ولَمْ تَعُدْ خفيفةَ الحركة كما كانَتْ.

فطلَبَ منْهَا النَّبيُّ ﷺ أنْ تُسَابِقَهُ، ولكِنْ فِي هذه المَرَّة سبَقَها النَّبيُّ ﷺ، فذَكَّرَهَا بالمَرَّةِ السَّابقةِ، وقالَ لها مُداعباً، ومُطَيِّباً لنَفْسِهَا: «هذه بِتلكَ» [أبو داود والنسائي].

وذلكَ حتَّى لا تَحْزَنَ أو تَغْضَبَ لأنَّهَا لَمْ تَفُزْ فِي السِّباقِ، وهذه هِي أخلاقُ الرِّياضَةِ وآدابُ مُمَارَستِهَا، ولنَا فِي رَسول الله ﷺ قُدْوَةٌ حَسَنَةٌ، فعندمَا انهزَمَ فِي المَرَّة الأُولَى لَمْ يَغْضَبْ ولَمْ يَحزَنْ، بَلِ انتَظَرَ حتَّى أُتيحَتْ لَهُ الفُرْصةُ، ففَازَ فِي المرَّة الثَّانيةِ، ولَمْ يَغْتَرَّ بِفَوزِهِ مثلمَا يَفعَلُ بَعضُ النَّاسِ فِي الوَقتِ الحالِيِّ.

---

الرِّياضَةُ المُفيدَةُ وسِيلةٌ لتَطِييبِ النُّفُوسِ، وتَقْوِيَةِ الصِّلَةِ بينَ النَّاسِ، ولَيْستِ الرِّياضَةُ ساحَةً للقتالِ أو مَيْداناً للحَرْبِ.

# ئەم جارە بەجارەکەی تر

جارێک، پێغەمبەر(ﷺ) وخاتوو عائشەی هاوسەری رضي الله عنها لە کاروانی موسوڵمانان دواکەوتن، پێغەمبەرﷺ داوای لە عائیشە رضي الله عنها کرد بۆ ئەنجامدانی پێشبڕکێی راکردن، عائیشە رضي الله عنها پێشی پێغەمبەری دایەوەو بردیەوە، پاش تێپەڕبونی ماوەیەک، خاتوو عائیشە رضي الله عنها لاشەی قورس بوو ئەو لەش سوکیەی نەما کە پێشتر هەیبو، پێغەمبەرﷺ داوای پێشبڕکیی لێکردەوە، بەڵام ئەمجارە پێغەمبەرﷺ پێشی دایەوە، بۆیە بیری جاری پێشوی خستەوەو بە گاڵتەوە فەرموی: ئەمجارە بە جارەکەی تر کەتۆ پێش کەوتیت (ابو داود والنسائی). ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە خەمبارو تورە نەبێت چونکە لە پێشبڕکێکە براوە نەبووە، ئەوە بەڕاستی ڕەوشتی وەرزشیو ئادابی وەرزشەوانە پێغەمبەرﷺ پێشەوای جوانی ئێمەیە.

کاتێک لە جاری یەکەمدا براوە نەبوو، هیچ تورە نەبوو، وە خەمباریش نەبوو، بەڵکو چاوەڕوانی هەلێکی کرد، تا لە جاری دووەمدا توانی پێشی بکەوێتو براوە بیت، لەو کاتەشدا لە خۆی نەگۆڕا وەک هەندێک خەڵک.

---

وەرزشی بە سود هۆکارێکە بۆ دڵ ئارامیو خۆشی دەرونو بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان خەڵک، وەرزش گۆڕەپانی جەنگو شەڕ نیە.

# العِقَابُ

كانَ الخَليفةُ العبَّاسِيُّ أبُو جَعفَرٍ المَنصورُ جالساً ذاتَ يومٍ، فجاء رجلٌ وطلَب أنْ يستَعرِض مَهاراته وألعابَهُ أمَامَ الخَليفَـة، فأحْضَرَ عدَداً من الأطبَاقِ، وبـدأ يَتَقاذَفُهَـا فِـي الهـواءِ دُون أنْ يقَع شَيءٌ منْهَا علَى الأرضِ.

فقالَ لهُ أبو جَعْفرٍ ثُمَّ ماذَا؟

فأخْرَجَ الرَّجلُ عدداً كبيراً من العصِيِّ، فِي طَرَفِ كُل منْهَا ثقْبٌ لتَركيبِ عصا أُخرَى، ثم رمى العَصَا الأُولَى فَرَشَـقَتْ فـي الجِدارِ، فرَمَى الثَّانيةَ فدَخَلَت فِي ثقْبِ الأُولَى، وفَعَلَ هذا فِـي باقِي العِصِي دُونَ أنْ يَقَع منْها شَيءٌ علَى الأرضِ.

ولَمَّا أنْهَى الرَّجلُ ألعابَهُ، توقَّـع أنْ يُكافئَـهُ الخَليفـةُ علَـى مَهَارَتِه.

وكانَت المُفاجأةُ أنَّ الخَليفةَ أمَرَ بِجَلْدِهِ؛ لأنَّهُ ضَـيَّعَ وَقْـتَ المُسلِمينَ فيمَا لا يُفِيدُهُمْ.

---

المُسلمُ يَبتَعدُ عنِ الألعابِ الَّتي تُضيِّعُ الوَقتَ أو تَضرُّ بالصَّحَّة، قـالَ ﷺ: «نعْمَتَان مَغْبُـونٌ (مخـدُوعٌ) فيهِمـا كَـثيرٌ مـنَ النَّـاسِ: الصـحَّةُ والفَـراغُ» [البخاري].

# سزا

(ئەبو جەعفەری مەنصور) خەلیفەی عەبباسی، ڕۆژێک دانیشتبوو پیاوێک هات‌و داوای کرد تواناو لێهاتووی خۆی لەبەردەم خەلیفەدا نیشان بدات، چەند پارچەیەک خواردنی هێنا، هەڵیدەدا بە هەوادا بە بێ ئەوەی هیچیان بکەونە سەر ڕەوی ئەبو جەعفەر وتی: پاشان چیتر؟! کابرا کۆمەڵێک گۆچانی زۆری هێنا، لەهەر دانەیەکیاندا کونێک هەبوو بۆ گۆچانەکەی تر، گۆچانی یەکەمی هەڵدا لە دیوارەکەدا چەقی، پاشان گۆچانی دووەمی هەڵداو کەوتە کونی گۆچانی یەکەم، هەموو گۆچانەکانی تریش بەهەمان شێوە کەوتنە ناو یەک‌و هیچیان نەکەوتنە سەر زەوی. کاتێک کابرا یاریەکانی تەواو کرد، چاوەڕێی پاداشتی لە خەلیفە دەکرد لەسەر تواناکانی بەڵام کت‌وپڕ خەلیفە فەرمانیدا کە داری لێبدەن، چونکە کاتی موسوڵمانانی لە شتی بێ سوددا بەسەر بردووە.

---

موسوڵمان لەو وەرزشە دوور دەکەوێتەوە کە کات بە فیڕۆ دەدات‌و زیان بە تەندروستی دەگەیەنێت. پێغەمبەرﷺ فەرموی: دوو بەخشش هەن زۆربەی خەڵک تیایدا خەڵەتاوو زیانمەندن: لەش ساغی‌و بەتاڵییە.(البخاری).

# آدَابُ اللَّعِبِ والمُزَاحِ

دَعَا الإسلامُ إلَى مُمَارَسَةِ الرِّياضة؛ لأنَّها مُهِمَّةٌ فِي بناءِ جسمِ الإنسانِ. ووَضَعَ آداباً لِمُمارَستِهَا.

ولَمْ يَمنَعِ الإسلامُ المُزَاحَ، وإنَّمَا وَضَعَ لهُ آداباً سامِيةً، كَي تَتَحقَّقَ سَعادةُ الإنسانِ، وتَتَوثَّقَ علاَقاتُهُ بِغَيرِهِ مِنَ البَشَرِ.

ولقَدْ كانَ المُسلمونَ علَى عَهدِ النَّبيِّ ﷺ يَتمازَحُونَ، والإيمانُ فِي قُلوبِهِمْ كالجِبالِ. كما كانُوا يُمارِسونَ أنواعاً عَديدةً مِنَ الألعابِ الرِّياضيَّةِ المُفِيدَةِ، مثلَ: الرِّمايةِ، أوِ السباحةِ، وركوبِ الخَيلِ، والمُصارَعةِ ، والعَدْوِ.

كمَا حَرَصُوا علَى تَعليمِ أولادِهِمُ الرِّياضَاتِ، الَّتي تَبْنِي الجِسمَ، وتُنَمِّي العَضَلات، ولكِنَّهم كانُوا حَريصينَ علَى البُعْدِ عنِ التَّمادِي فِي اللَّعِبِ والمُزَاحِ فِيما يُغْضِبُ الله عزَّ وجلَّ ويُغْضِبُ أو يُثيرُ الآخَرينَ.

فَمِنَ اللَّعبِ والمُزَاحِ ما هُوَ مُضِرٌّ، ومِنْهُ ما هوَ مُفِيدٌ، ولا بأس باللَّعبِ والمُزاحِ مَا لَمْ يكُنْ حرَاماً، أو مُسَبِّباً أذَى للآخَرينَ.

والمُسلِمُ يُحْسِنُ نيَّتَهُ في لَعِبِهِ ومُزاحِهِ، فيأْجُرُهُ اللهُ علَيهِ بالثَّوابِ والحَسَناتِ.

* * * * *

# ئادابی گاڵتە و یاری کردن

ئیسلام داوا دەکات مرۆڤ مومارەسەی یاریو وەرزش بکات، چونکە گرنگە بۆ بنیاتنانی لاشەی مرۆڤ، بۆ ئەمەش چەند ئادابێکی داناوە.

ئیسلام گاڵتەی قەدەغە نەکردووە، بەڵکو کۆمەڵێک ئادابی جوانو بەرزی بۆ داناوە بۆ ئەوەی بەختەوەری مرۆڤ بەدەست بهێنێ، وە پەیوەندی بەهێز بکات، موسوڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەرﷺدا گاڵتەیان دەکرد، باوەڕیش لە دڵیاندا وەك شاخو چیا دامەزراو بوو، هەروەها مومارەسەی چەند جۆر وەرزشیان دەکرد کە سودی هەبوو وەك: تیرئەندازی، مەلەوانی، ئەسپ سواریو سوار چاکی، زۆرانبازیو پێشبڕکێ.

هەروەها سوربوون لەسەر فێرکردنی مناڵەکانیان بەو وەرزشانە، کە لاشە دروست دەکاتو بازوو بەهێز دەکات، بەڵام زۆر دوور بوون لەوەی کە ڕۆبچنو زیادە ڕەوی بکەن لە یاریو گاڵتەیەکدا لە شتانێکدا لە خوای گەورە توڕە ببێت، یان خەڵکی تر بێزار بکات. چونکە هەندێ یاریو گاڵتە هەیە زیان بەخشن، وە هەشیانە سودمەندە، یاریو گاڵتە ئەگەر حەرام نەبێت هیچ خراپیەکی تیا نیە، بە مەرجێك حەرام نەبێتو نەبێتە مایەی زیان بەخەڵکی تر. موسوڵمان لە کاتی یاریو گاڵتەشدا نیەتی پاکە بۆیە خوای گەورەش پاداشتی دەداتەوە.

# ئادابی ناو مزگەوت

نوسینی: منصور علی عرابی

وەرگێڕانی: م. فاتح شاربازێڕی

# تَحيَّةُ المَسجدِ

جلسَ رسـولُ اللهِ ﷺ مـعَ أصـحابِهِ ـ رَضِـيَ اللهُ عَـنْهُمْ ـ في المَسجدِ يوماً لِيُعلِّمَهُمْ أمورَ دينِهِمْ.

وَفي أثناءِ ذلكَ، دخَلَ أبـو قَتَـادةَ رضـي الله عنـه المَسـجدَ، فَرأى رسولَ اللهِ ﷺ جَالساً مع أصحابِهِ يُعلِّمُهُمْ، فذهَبَ أبـو قَتَـادةَ إلى النَّبيِّ ﷺ، ثمَّ جلسَ مَعَهُمْ.

فَقالَ لهُ النَّبيُّ ﷺ: «مَا منَعَكَ أنْ تَركَعَ (تُصلِّي) ركعـتَينِ قبـلَ أنْ تَجلِسَ»؟.

فَقالَ أبو قَتَادةَ: يَا رسولَ اللهِ، رَأيتُكَ جَالساً والنَّاسُ جُلوسٌ.

فَقالَ ﷺ: «إذَا دَخَلَ أحدُكُمُ المَسجدَ فَليَركَعْ ركعَتينِ قبـلَ أنْ يَجلِسَ» [مسلم].

فمِنْ آدابِ المسَاجدِ، أنَّ المُسلِمَ إذَا دخَلَ المَسجِدَ لا بُـدَّ أنْ يُصلِّي ركعتَينِ أوَّلاً قبلَ أنْ يَجلِسَ، وهَاتـانِ الركعتَـانِ هُمَـا تَحيَّـةُ المَسجدِ.

---

الأرضُ كلُّهَا مَسجِدٌ، فأينمَا أدركَتِ المُسلِمَ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ. قَالَ الـنَّبيُّ ﷺ : «جُعِلَتْ لنَا الأرضُ كلُّهَا مَسجِداً، وجُعِلَتْ تُربَتُهَا لنَـا طَهُـوراً إذَا لَمْ نَجِدِ الماءَ» [مسلم].

# سلاوی مزگەوت

رۆژێکیان پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵان دانیشتبوو لەناو مزگەوت دا هەتا فێری ئاینیان بکات،لەو کاتەدا ئەبو قەتادە -رضي الله عنه- هاتە ناو مزگەوت،بینی پێغەمبەری خواﷺ دانیشتووە لەگەڵ هاوەڵان وەباسی دینیان بۆ دەکات، -ئەبو قەتادە رۆیشت بۆلای پێغەمبەرﷺ دانیشت لایان.پێغەمبەرﷺ فەرمووی (چی رێی لێ گرتیت دوو رکات نوێژ بکەیت پێش ئەوەی دابنیشیت)؟ ئەبو قەتادە ووتی:ئەی پێغەمبەری خواﷺ دیم بەرێزتان دانیشتوون وخەڵکەکەش دانیشتوون، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:(ئەگەر یەکێکتان هاتە مزگەوتەوە بادانەنیشێت تا دوو رکات نوێژ دەکات)(مسلم)

-یەکێ لەئادابی مزگەوت ئەوەیە هەرکاتێك موسوڵمانێك چووە مزگەوتەوە پێویستە پێش دانیشتن دوو رکات نوێژ بکات، وە ئەو دوو رکات نوێژە پێ دەوترێت سلاوی مزگەوت.

---

-سەر زەوی هەموو شوێنی نوێژە، لەهەر شوێن و جێگەیەك بوویت، برای موسوڵمان نوێژ بکە،پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت:(خوای گەورە هەموو سەر زەوی بۆ ئێمە گێراوە بە شوێنی نوێژ،وە خۆڵەکەشی پاك راگرتووە بۆمان هەرکات ئاو نەبوو دەتوانین بە خۆڵ تەیمووم بکەین)(مسلم).

# الجَمَلُ المَفْقودُ

كانَ أحَدُ الأعرابِ يَملكُ جَمَلاً أحمَرَ، فَقَدَهُ ذاتَ يَومٍ، فظَلَّ يَبحَثُ عنْهُ طوَالَ اللَّيلِ؛ لكنَّهُ لَمْ يَجِدْهُ.

وَفي صَلاةِ الفَجرِ، ذَهبَ الأعرابيُّ إلى المَسجدِ، وبعدَ أنْ أنهَى النَّبيُّ ﷺ صَلاتَهُ بالنَّاسِ، قامَ الأعرابيُّ يَسألُ النَّاسَ عنْ جمَلِهِ، ويَقولُ بصَوتٍ مُرتَفعٍ: مَنْ دَعَا إلى الجمَلِ الأحمَرِ (أي: مَنْ وَجَدَ ضَالَّتِي التِي فَقَدْتُهَا؛ وَهيَ الجمَلُ الأحمَرُ، فَدَعاني إليه)؟

فلَمَّا رآهُ النَّبيُّ ﷺ يفعَلُ ذلكَ غضِبَ ﷺ، وقالَ لهُ: «لا وَجَدْتَ، إنَّما بُنِيَتِ المساجدُ لِمَا بُنِيَتْ لهُ» [مسلم].

ثمَّ بيَّنَ النَّبيُّ ﷺ لصحابَتِهِ كَراهيةَ السُّؤالِ عَنِ الأشياءِ المَفْقُودَةِ وَالإعلانِ عنْهَا في المسجدِ، فَقالَ ﷺ: «مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنشُدُ (يَسألُ عَنْ) ضَالَّتِه في المَسجدِ، فَلْيَقُلْ: لا رَدَّهَا اللهُ عليكَ. فإنَّ المساجِدَ لَمْ تُبْنَ لهذَا» [مسلم].

---

لا يَجُوزُ أنْ نَبيعَ أو نَشتَرِيَ في المَساجِدِ، قَالَ النَّبيُّ ﷺ: «إذَا رأيتُمْ مَنْ يَبيعُ أو يَبْتَاعُ (يشتَرِي) في المَسجدِ، فقُولُوا: لاَ أَرْبَحَ اللهُ تجارَتَكَ» [الترمذي].

# وشتری ونبوو.

کابرایەکی دەشتەکی وشترێکی سوری کڕیبوو،ڕۆژێکیان لێ ی ون دەبێ،ئەو ڕۆژە زۆر دەگەڕێ هەتا تاریکایی شەو دادێ بەڵام نایدۆزێتەوە،لەنوێژی بەیانیدا کابرای دەشتەکی ڕۆیشت بەرەو مزگەوت چووە ناو مزگەوت لەدوای ئەوەی پێغەمبەرﷺ نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد،کابرای دەشتەکی کەوتە پرسیار کردن لەخەڵکی، ئاخۆ وشترەکەیان نەدیوە.پاشان بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد،هەرکەسێک وشترێکی سوری لەو شێوەی دۆزییەوە کە لێم ون بووە بائاگادارم بکاتەوە؟

-پێغەمبەرﷺ کەکابرای دی بەو شێوەیە هاوار دەکات، تورە بوو، فەرموی:(دەك نەی دۆزییەوە، مزگەوتمان دروست کردووە بۆ خواپەرستی نەك بۆ بانگەواز کردن بۆ شتی ونبوو.)

-پاشان پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی ڕوون کردەوە لەبارەی پرسیار کردن وبانگەواز کردن بۆ شتی ونبوو لەناو مزگەوتدا،فەرمووی:(ئەوەی گوێی لێ بوو پیاوێك بانگەواز بۆ شتی ونبوو دەکات، بابڵێت خوا بۆت نەگێڕێتەوە)چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون.

---

دروست نی یە کڕین و فرۆشتن لەناو مزگەوتدا بکرێت، پێغەمبەرﷺدەفەرمووێت:(ئەگەر بینیتان خەڵکی لەناو مزگەوتدا کڕین وفرۆشتن دەکەن،ئەوا پێیان بڵێن:یاخوا ئەم مامەڵەتان هیچ خێر نەکات)

# الشَّجَرةُ الكَرِيهَةُ

فِي طريقِ عَودةِ المُسلمينَ مِنْ غَزْوَةِ خَيْبَرَ، مَرُّوا على أرضٍ بِهَا بَصَلٌ، وثومٌ، وكانُوا جَائِعينَ، فَأكلَ بعضُهُمْ حتَّى شَبِعُوا، ولَمْ يَأكُلِ البَعضُ الآخَرُ، ثُمَّ ذهَبُوا إلى المَسجدِ.

وَفِي المَسجدِ نادَى رسولُ اللهِ ﷺ مَنْ لَمْ يَأكلُوا، لِيُصَلُّوا معَهُ، وأَخَّرَ الذينَ أكَلُوا حتَّى تذهَبَ رائحةُ البصَلِ والثُّومِ مِنْ أفواهِهِمْ.

وبعدَ انتهاءِ الصَّلاةِ قالَ النَّبيُّ ﷺ: «مَنْ أكَلَ مِنْ هذهِ الشَّجرةِ الخَبيثةِ (ذاتِ الرَّائحةِ الكَريهَةِ) شَيْئاً فَلاَ يَقرَبَنَا في المَسجدِ».

فلَمَّا سَمعَ النَّاسُ ذلكَ قالَ بعضُهُمْ: حُرِّمَتْ، حُرِّمَتْ (أي: حُرِّمَ أكلُ البصَلِ والثُّومِ).

وبلَغَ النَّبيُّ ﷺ مَا قالَهُ الناسُ، فَقالَ لَهُمْ: «أَيُّهَا النَّاسُ! إنَّهُ ليسَ لِي تَحريمُ مَا أحَلَّ اللهُ لِي، ولكنَّهَا شَجَرةٌ أكرَهُ رِيحَهَا» [مسلم].

---

المُسلِمُ يَحرُصُ على نظافةِ بدَنِهِ وملاَبسِهِ، خاصَّةً عندَ ذهابِهِ إلى المَسجدِ، قَالَ اللهُ تعالَى: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ [الأعراف:٣١].

# درەختی بۆن ناخۆش.

کاتێک مسوڵمانان لەغەزوەی خەیبەر گەڕانەوە، دایان بەلای زەوی یەکا کەپیازو سیری تیابوو،موسوڵمانەکان زۆر برسیان بوو دەستیان کرد بەخواردنی سیرو پیاز هەتا تێر بوون، وەهەندێکیان نەیان خوارد، پاشان گەڕانەوەو ڕۆشتن بەرەو مزگەوت، لە ناو مزگەوتدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:(ئەوەی سیرو پیازی نەخواردووە با نوێژ بکات لەگەڵمان،ئەوانەی خواردبوویان دووربخستنەوە هەتا بۆنەکەی بڕا، لەدوای نوێژ پێغەمبەرﷺ فەرمووی:(هەرکەس لەو دوو درەختە بۆن ناخۆشەی خوارد با نزیکمان نەکەوێتەوە لە مزگەوت). کاتێک خەڵکەکە گوێیان لەم فەرمایشتە بوو هەندێکیان ووتیان: قەدەغەبوو،قەدەغەبوو، واتە:خواردنی سیرو پیاز حەرام بوو.

-ئەم هەواڵ و قسانەیان گەیاند بە پێغەمبەرﷺ ئەویش فەرمووی:(ئەی خەڵکینە!من ناتوانم شتێ حەرام بکەم لەکاتێکدا خوای گەورە حەڵاڵی کردووە،بەڵکو ئەم درەختە بۆنێکی ناخۆشی هەیە بۆنەکەیم لا ناخۆشە) (مسلم).

---

پێویستە کەسی موسوڵمان هەمیشە داکۆکی بکات لەسەر پاک و خاوێنی، پاک و خاوێنی لاشە و جل و بەرگی بەتایبەت، کاتێک کەبەرەو مزگەوت دەچێت.بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت:(ئەی نەوەی ئادەم خۆتان برازێننەوە بە پۆشاک لەبەر کردن وپاک و خاوێنی پۆشاکتان لەکاتی هەموو نوێژو چوونە ناو مزگەوتێکدا.

# الشِّعرُ في المَسجدِ

طلَبَ النَّبيُّ ﷺ من حَسَّانَ بنِ ثابتٍ رضي الله عنه أنْ يُدَافِعَ عنْهُ وعَنِ الإسلامِ بالشِّعرِ، وأقامَ لهُ مِنْبَراً في المَسجدِ، فكانَ حسَّانُ يَقِفُ عليهِ ويَهْجُو الكُفَّارَ. ولَمَّا أصبَحَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه أميراً للمُؤمنينَ، دخَلَ المَسجدَ يَوماً، فَوجَدَ حسَّاناً يُنشِدُ الشِّعرَ، فَأشارَ إليهِ بأَنْ يَسكُتَ. فَقالَ لهُ حسَّانُ: قَدْ كنتُ أُنشِدُ وفيهِ مَن هُوَ خَيرٌ مِنْكَ.

وأرادَ حسَّانُ رضي الله عنه أنْ يُؤكِّدَ لأميرِ المُؤمنينَ صِدْقَ ما يَقُولُهُ، فَاستَدْعَى أَبَا هُرَيْرةَ رضي الله عنه وقَالَ لَهُ: أَسَمِعتَ رسولَ اللهِ ﷺ يقولُ: «أَجِبْ عَنِّي (دَافِعْ عنِّي؛ رَدّاً على هجاءِ الكُفَّارِ وَسَبِّهِم)، اللَّهمَّ أيِّدْهُ (قَوِّهِ) بِرُوحِ القُدُسِ (وهُوَ جِبريلُ عليه السلام)»؟

فَقالَ أبو هُرَيرةَ: نَعَمْ. [متفق عليه].

---

يَجُوزُ إنشادُ الشِّعرِ في المَسجدِ إذَا كانَ شِعراً يَحُثُّ على مكَارمِ الأخلاقِ، أمَّا إذَا كانَ الشِّعرُ كلاماً لا خَيْرَ فيهِ فلاَ يَصِحُّ إنشادُهُ في المَسجدِ.

# وتنی هۆنراوە لە مزگەوتدا.

پێغەمبەرﷺداوای لە حەسانی کوڕی ثابت کرد ﷺ بەهۆنراوەکانی پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا ﷺو ئاینی ئیسلام بکات. وەشوێنێکیان بۆ دروست کرد لەناو مزگەوتدا تا هۆنراوەی لێ بخوێنێتەوە، حەسان- ئەچووە ئەو شوێنەو هێرشی دەکردە سەر بێباوەڕان بەهۆنراوە جوانەکانی.

-کاتێک عومەری کوڕی خەتابﷺ کرایە گەورەی موسوڵمانان ڕۆژێک ڕۆشتە مزگەوت بینی —حەسان-هۆنراوە دەخوێنێتەوە،عومەریﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە بیدەنگ بێت،حەسان ووتی:خۆت باش دەزانی من هۆنراوەم وتووە لەکاتێکا لەتۆ باشتر لەناو ئەم مزگەوتەدا ئامادەبووە،(مەبەستی پێغەمبەری خوا بوو)،حەسان ویستی بەم کارە ڕاستی خۆی بۆ ئەمیری موسڵمانان دەرخا وە ڕێگەی پێ بدا هۆنراوە بخوێنێتەوە،بۆ راستی قسەکانی حەسان أبو هریرەﷺ وتی: ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا نەبووە کە دەیفەرموو(پارێزگاری بکە لەمن حەسان بە هۆنراوەکانت وەوەڵامی بێ باوەڕان بدەرەوە لە کاتێکا ئەوان جنێومان پێ دەدەن،دەیفەرموو:خوایە کۆمەکی (حەسان)بکە بە هۆی جبریلەوە.

ئەبو هرەیرە فەرموی:بەڵێ (متفق علیه)

---

دروستە هۆنراوە بخوێنرێتەوە لە ناو مزگەوتدا بەمەرجێ ئەو هۆنراوەیە باس لە ڕەوشتە جوان وشتە باشەکان بکات،بەڵام ئەگەر هۆنراوەکە جۆرە قسانێک بوو کە هیچ خێرێکی تیا نەبوو ئەوە ڕێگەی پێ نادرێ لە ناو مزگەوتا بخوێنرێتەوە.

# جِلْسَةُ الشَّيطانِ

كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ حَريصاً علَى تَعليمِ أصحابِهِ الأشياءَ الطَّيِّبَةَ، وحَريصاً على أنْ يُبعِدَهُمْ عنِ التَّشَبُّهِ بالشَّيطانِ في أفعالِه جَميعاً، كمَا كانَ ﷺ يحرُصُ على احترامِ المساجدِ، فكانَ يُعلِّمُ أصحابَهُ كيفيَّةَ الجُلوسِ في المَسجدِ.

وذاتَ يومٍ كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يَوماً معَ بعضِ أصحابِهِ، فَدخَلُوا المَسجِدَ النَّبويَّ، فإذَا بِرَجُلٍ جَالسٍ في وسَطِ المَسجِدِ، وقَدْ ضَمَّ رجلَيهِ إلى بَطنِه بِيَديهِ، وشبَّكَ أصابِعَهُ بعضَهَا في بعضٍ.

فلَمَّا رآهُ رسولُ اللهِ ﷺ أشارَ إليهِ كَي يَفُكَّ أصابِعَهُ، ولكنَّ الرَّجُلَ لَمْ يَفْهَمْ تلكَ الإشارةَ، وظَلَّ مُشبكاً أصابِعَهُ. فَقالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «إذَا كانَ أحَدُكُمْ في المَسجدِ فَلا يُشَبِّكَنَّ، فإنَّ التَّشبيكَ مِنَ الشَّيطانِ، وإنَّ أحَدكُمْ لاَ يَزَالُ في صلاةٍ مَا كانَ في المَسجدِ حتَّى يَخرُجَ منْهُ» [أحمد].

---

المُسلمُ يَقتدِي بالنَّبيِّ ﷺ عندَ ذهابِهِ إلى المَسجدِ، قَالَ ﷺ: «إذَا تَوضَّأَ أحَدُكُمْ ثُمَّ خرَجَ عَامِداً (مُتَّجِهاً) إلى الصَّلاةِ، فَلا يُشَبِّكَنَّ بينَ يدَيهِ؛ فإنَّهُ في صَلاةٍ» [أحمد].

# دانیشتنی شەیتانانە.

پێغەمبەرﷺبەردەوام لە هەوڵی ئەوەدابوو کە هاوەڵانی پەروەردە بکا لەسەر شتی پاک و جوان و باش،وەئامۆژگاری دەکردن کەخۆیان دور بگرن لە هەڵسووکەوتی شەیتانی لە وتەو کاریاندا،وە بەردەوام ئامۆژگاری موسوڵمانانی دەکرد کە زۆر ڕێزی مزگەوت بگرن، فێری دەکردن کە چۆن لەمزگەوتا دانیشن، ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ لەگەڵ چەند هاوەڵێکی بەڕێزیدا چوونە ناو مزگەوتەوە،بینی وا پیاوێک لە ناوەڕاستی مزگەوتدا دانیشتووە، و قاچەکانی توند لکاندووە بە سکیەوە، وە پەنجەکانی کردووە بەناو یەکتریدا خەریکی پەنجە تەقاندنە،پێغەمبەری خواﷺ کەئەم پیاوەی بەم شێوەیە بینی ئاماژەی بۆ کرد کەدەست لەو کارە هەڵگرێ، بەڵام کابرا حاڵی نەبوو لە پێغەمبەری خواﷺ و بەردەوام بوو لە پەنجە تەقاندن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەگەر هاتنە ناو مزگەوتەوە پەنجە مەتەقێنن،چونکە پەنجە تەقاندن کاری شەیتانە،ئێوە لە مزگەوتا بەردەوام وان لە نوێژدا هەتا ئەو کاتەی لە مزگەوت دەردەچن)(رواه احمد).

---

مرۆڤی موسوڵمان دەبێ شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەوێ لە هەموو کاروبارێکی ژیانیدا بەتایبەت لە چونی بەرەو مزگەوت و مانەوەی لەناو مزگەوتدا،پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(هەرکاتێک دەست نوێژتان شۆردو چون بەرەو مزگەوت وان لە نوێژدا بەردەوام،نەکەن خەریکی پەنجە تەقاندن بن،چونکە ئێوە وان لە نوێژدا)(رواه احمد)

# رَفعُ الصَّوتِ في المَسجدِ

حذَّرَ أميرُ المؤمنينَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه المُسلمينَ مِنْ رَفعِ أصواتِهِمْ فِي المَسجدِ النَّبويِّ، ونَهَاهُمْ عن ذلكَ بقولِهِ: اجتَنِبُوا اللَّغْوَ في المَسجدِ. إنَّ مَسجدَنَا هذَا لا تُرْفَعُ فيهِ الأصواتُ.

وَذاتَ يومٍ، دخلَ عُمَرُ رضي الله عنه المَسجدَ فوجَدَ رَجُلَينِ لا يَعرِفُهُمَا؛ يتحدَّثَانِ بصَوتٍ مُرتَفعٍ.

وكانَ السَّائبُ بنُ يَزيدٍ رضي الله عنه نَائماً في المَسجدِ، فرَمَاهُ عُمَرُ بِبَعضِ الحَصَى، فَالتَفَتَ السَّائبُ إلى مَنْ يَرميهِ، فَرأَى عُمَرَ، فَنَادَاهُ عُمَرُ وقَالَ لهُ: اذهَبْ فأْتِني بِهذَيْنِ. فَذهَبَ إلى الرَّجُلينِ، وَأخبَرَهُمَا أنَّ أميرَ المؤمنينَ يَطلُبُهُمَا، فلَمَّا حضَرَا إليهِ سأَلَهُمَا: مَنْ أنتُمَا؟ قَالاَ: فُلانٌ وفُلانٌ؛ مِنْ أهلِ الطَّائفِ.

فَعَلِمَ عُمَرُ رضي الله عنه أنَّهُمَا لَمْ يَعرِفَا بِتحذيرِهِ، فَقالَ لَهمَا: لَو كُنتُمَا مِنْ أهلِ [البلَدِ] لأَوجعتُكُمَا (أي: ضَربتُكُمَا ضَرباً شَديداً)؛ تَرفَعانِ أصواتَكُمَا في مسجدِ رسولِ الله ﷺ؟! [البخاري].

---

المُسلِمُ يكونُ في المَسجدِ خاشعَ القلبِ، ولاَ يتحَدَّثُ بكلامٍ فاحِشٍ ولا بذيءٍ، ويَذكُرُ اللهَ بصوتٍ مُنخَفضٍ، حتَّى لا يَشغَلَ المُصلِّينَ والذَّاكرينَ عن عِبادتِهِم.

# دەنگ بەرز کردنەوە لە مزگەوتدا.

عومەری کوڕی خەتاب پێشەوای موسوڵمانان ﷺ ئاگاداری دایە موسوڵمانان کە دەنگیان بەرز نەکەنەوە لە ناو مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ .وە قەدەغەی کرد لەسەریان بەم وتە جوانە فەرموی: خۆتان بە دوور بگرن لەقسەی بێ کەڵک وبێ سود لە ناو مزگەوتدا، چونکە مزگەوت نابێ دەنگی تیا بەرز بکرێتەوە،

ڕۆژێکیان*عومەری کوڕی خەتاب ﷺ چووە ناو مزگەوت دوو پیاوی بینی نەیدەناسین زۆر بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد،(سائبی کوڕی زەید)ﷺ خەوتبوو لەناو مزگەوتا،پێشەوا عومەر چەند بەردێکی هەڵدا بۆ(سائب)یەکێ لەبەردەکانی بەرکەوت وبەخەبەرهات و پێشەوا عومەری ﷺ چاو پێکەوت، ئەویش بانگی (سائبی)کردو فەرموی: بچۆ ئەو دوو پیاوەم بۆ بهێنە.(سائب) ڕۆشت بۆ لایان وهەواڵی پێدان کە عومەری کوڕی خەتاب پێشەوای ئیمانداران داواتان دەکات. کاتێک هاتن.پێشەوا عومەر فەرموی: ئێوە کێن؟ وتیان:فلان وفلان لە خەڵکی طائف،پێشەوا عومەر ﷺ حاڵی بوو لەوە کەئەمانە ئاگاداری ئەو بڕیارەی ئەم نین. فەرموی:ئەگەر ئەهلی مەدینە بونایە ئەوا لێدانێکی باش لێم ئەدان چونکە دەنگتان لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بەرز کردۆتەوە.(بوخاری).

---

-کەسی موسوڵمان دەبێ لە مزگەوتدا زۆر لەسەر خۆو هێمن و ئارام بێت،نابێت بە هیچ شێوەیەک قسەی خراپ و دونیایی بکات، وەلەکاتی ذکرەکانیشدا وا باشە بەشێوەی لەسەرخۆو هێمن وەبەدەنگی نزم بکرێ.بۆ ئەوەی نوێژ کەران مەشغوڵ نەبن وخواپەرستیان لێ تێک نەچێ.

# طَهارةُ المَسجدِ

ذاتَ يومٍ كانَ رسولُ اللهِ ﷺ جالِساً في المَسجدِ ومعَهُ بعضُ أصحابِه.

وأثناءَ ذلكَ دخلَ رَجلٌ أعرابيٌّ، واتَّجهَ إلى ناحيةٍ مِنْ نَواحِي المَسجدِ، ثُمَّ وقفَ يَتَبوَّلُ.

فلَمَّا رأى الصَّحابةُ ـ رَضِيَ اللهُ عَنهُم ـ ذَلِكَ صَاحُوا بالرَّجُلِ وَزجَرُوهُ، وقَامُوا إليهِ ليَمنَعُوهُ، فأمَرَهُمُ الرَّسولُ ﷺ أنْ يتركُوهُ.

فلَمَّا انتَهَى الرَّجلُ مِنْ بَولِه ناداهُ النَّبيُّ ﷺ، وقَالَ لهُ: «إنَّ هذهِ المَساجِدَ لاَ تَصلُحُ لِشيءٍ مِنْ هذَا البَولِ ولاَ القَذَرِ، إنَّما هِيَ لِذِكْرِ اللهِ عزَّ وجلَّ والصَّلاةِ، وقِراءةِ القُرآنِ».

ثمَّ أمَرَ النَّبيُّ ﷺ بِدَلوٍ مِنَ الماءِ، فَصُبَّ على مكانِ البَولِ. [متفق عليه].

وهكذَا يُعلِّمُنَا النَّبيُّ ﷺ ضَرورةَ طهَارةِ المَكانِ الذِي يُصلِّي فيهِ المُسلِمُ.

---

أمَرَ النَّبيُّ ﷺ بطَهارةِ المَساجدِ، فَلا يَجوزُ التَّبوُّلُ في المَسجدِ أوِ البَصْقُ أو مِثلُ ذلِكَ، قالَ ﷺ: «البُصَاقُ في المَسجدِ خَطِيئةٌ، وكفَّارَتُها دَفنُهَا» [مسلم].

# پاککردنەوەی مزگەوت.

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هەندی لە هاوەڵان دانیشتبوون لە مزگەوت، لەوکاتەدا کابرایەکی دەشتەکی هات و ڕوی کردە سوچێکی مزگەوتەکەوە ودەستی کرد بەمیز کردن. کەهاوەڵان ئەم کارەیان لە کابرای دەشتەکی بینی. هاواریان لیٚ کرد وهەستانەوە بۆی تارێگری لیٚ بکەن، بەلاٚم پێغەمبەرﷺ فەرموی: وازی لیٚ بێنن با میزەکەی تەواو بکات!!!

-کاتیٚ کابرا لەمیز کردن تەواو بوو پێغەمبەرﷺ بانگی لێکردو فەرموی: (ئەمە مزگەوتە بۆ ئەم کارە دەست نادا ئاوا میزی لێبکریٚ، بەڵکو مزگەوت شوێنی یادی خواو بەجیٚ هێنانی نوێژو خوێندنی قورئانی پیرۆزە) پاشان پێغەمبەرﷺ فەرموی: (سەتڵێک ئاو بهێنن بیکەن بەو شوێنەدا کە کابرا میزەکەی لێکردووە تا پاک بێتەوە) (متفق علیه)

بەم شێوەیە پێغەمبەر خوا ﷺ فێری گرنگی پاک ڕاگرتنی ئەو شوێنانەمان بۆ دەکا کە نوێژی لیٚ دەکەین.

---

بەو شێوەیە پێغەمبەرﷺ فەرمانمان پی دەکات بەپاک ڕاگرتنی مزگەوتەکان، دروست نی یە میزو پیسایی لەناو مزگەوتدا بکریٚ یان تف ڕۆکردن وە یان هەر شتێکی پیسی تر دروست نی یە لە ناو مزگەوتدا، بۆیە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (تف ڕۆکردن لە مزگەوتدا گوناهە کەفارەتی ئەو گوناهەش داپۆشینی و پاک کردنەوەیەتی) (مسلم)

# تَنظِيفُ المَسجدِ

فِي عَهدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ كانَتْ هنـاكَ امـرأةٌ تَقُـومُ بتَنظيـفِ المَسجدِ ورِعايتهِ.

وكانَ النَّبيُّ ﷺ يَعطُفُ عَليهَا، ويَسألُ عن حالِهَا؛ تَعظِيمـاً لشَأْنِهَا، وشُكراً لهَا على عمَلِهَا.

وذاتَ يَومٍ، دخَلَ النَّبيُّ ﷺ المَسجدَ فَلَمْ يَجِـدْهَا، فسـألَ عنْهَا، فقالُوا: مَاتَتْ. وأَخبَرُوهُ أنَّهُـمْ قـامُوا بتَغسـيلِهَا والصَّـلاةِ عَليهَا ودَفْنِهَا. فقالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «أفَلاَ كُنْـتُمْ آذَنْتُمُـونِي (أي: أعلَمتُمُونِي قبلَ دَفنِهَا)؟».

ثُمَّ قالَ ﷺ: «إنَّ هذهِ القُبورَ مَملوءَةٌ ظُلْمـةً علـى أهلِهـا، وإِنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يُنوِّرُهَا لَهُمْ بصَلاَتِي عَليهِمْ» [مسلم].

وقَدْ فعَلَ النَّبيُّ ﷺ ذلكَ معَ هذهِ المَرأةِ لأنَّهَا كَانَـتْ تَقُـومُ بعَملٍ عَظيمٍ، وهُوَ نظافَةُ المَسجدِ ورَعَايَتُهُ.

---

حَثَّ النَّبيُّ على بناءِ المَساجدِ، وتَطْيِيبِهَا وتَنظيفِهَا، والقيامِ على أمرِهَا. فقالَ ﷺ: «ابنُوا المساجدَ، وأخرِجُوا القُمَامةَ مِنْهَا» [الطبرانِي].

# خاوێن کردنەوەی مزگەوت.

لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتێک هەڵدەستا بە پاک کردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ وە چاودێری تەواوی دەکرد، پێغەمبەری خوا سۆزی هەبوو بۆی وپرسیاری دەکرد لەحاڵ وگوزەرانی، کارەکەی بەگەورە سەیر دەکردو زۆر سوپاسی دەکرد لە سەر کارەکەی، ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ چووە مزگەوتەوەو ئافرەتەکەی نەبینی، پرسیاری کرد، ئەو ئافرەتە لەکوێیە؟ووتیان: قوربان مردووە!!وە هەواڵیان دایە کە شۆراوە ونوێژیان لەسەر کردووە و ئەسپەردەی خاکیان کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ پێش ناشتنی ئاگادارتان نەکردم؟ پاشان فەرموی: (ئەم گۆڕانە تاریکە بۆ خاوەنەکەی. بەلام خوای گەورە ڕوناکی دەکاتەوە،بە هۆی ئەوەی کە نوێژیان لەسەر دەکەم (مسلم).

پێغەمبەری خوا بەم شێوەیە مامەلەی لەگەل ئەم دایکە بەڕێزەدا کرد چونکە ئەم ئافرەتە خاوەنی کارێکی گەورەبوو ئەویش پاک کردنەوەی مزگەوت وچاودێری کردنی.

---

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر داکۆکی دەکرد لەسەر دروست کردنی مزگەوت وە بۆن خۆش وپاک کردنەوەی وە ڕێکخستنی کار و بارەکانی مزگەوت، دەفەرموێ: (مزگەوت دروست بکەن، وەپیسی لێ دووربخەنەوە) ( الطبراني )

# الثَّوابُ العظيمُ

كَانَ رَجلٌ منَ الأنصارِ يَسكُنُ بَعيداً جِدّاً عَنِ المَسجدِ، ومعَ ذلكَ فكانَ يَحرَصُ على الصَّلاةِ خَلْفَ رسُولِ اللهِ ﷺ، وَلا يتَخَلَّفُ عَن حُضورِ الجمَاعةِ في كُلِّ وَقتٍ، مِمَّا جعَلَ النَّاسَ يُشفِقُونَ عليه.

فَعرَضَ عَليهِ أُبَيُّ بنُ كَعبٍ رضي الله عنه أَنْ يَشتَرِيَ حِماراً يَرْكَبُهُ، لِيَقِيْهِ السَّيرَ في الحَرِّ الشَّديدِ على الرِّمالِ.

فَقَالَ الرَّجلُ: مَا يَسُرُّنِي أنَّ مَنزِلِي إلى جَنْبِ المَسجدِ، إنِّي أُرِيدُ أن يُكْتَبَ لِي مَمْشَايَ إلى المَسجدِ ورُجُوعِي إذَا رَجَعتُ إلى أهلِي (أَي: يَكتُبُ اللهُ لِي ثوابَ كلِّ ذلكَ).

فأخبَرَ النَّاسُ رسُولَ اللهِ ﷺ بمَا يَقولُ، فَقالَ لهُ النَّبيُّ ﷺ: «قَدْ جمعَ اللهُ لكَ ذلِكَ كلَّهُ (ثوابَ كلِّ ذلكَ)» [مسلم].

---

المُسلِمُ يَدخُلُ المَسجِدَ برِجْلِه اليُمنَى، ويَقولُ: «اللَّهمَّ افتَحْ لِي أبوابَ رحمَتِك». ويَخرُجُ برِجْلِهِ اليُسرَى، ويَقولُ: «اللَّهمَّ إنِّي أسأَلُكَ مِنْ فَضلِكَ» [مسلم].

# پاداشتی گەورە

پیاوێکی ئەنصاریماڵیان زۆر لە مزگەوتەوە دوور بـوو، و لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر هەوڵی دەدا نوێژەکانی بەجەماعەت لە دوای پێغەمبەرەوەﷺ بکـات، بۆیـە هـیچ کات لە جەماعەت دوا نەدەکەوت وەهاوەڵان زۆر بوی بەپـەرۆش بـوون، (ئوبـەی کوڕی کەعب) ﷺپێشنیاری بۆ کرد کەئەمەوێـ گویٚ درێژێکت بۆ بکرِم تا هـات و چۆی پێ بکەیت؟ چونکە بەناو ئەو لمە گەرمەدا هات و چۆ دەکەی زۆر مانـدوو دەبیت، پیاوەکە وتی:نا براکەم من زۆر دڵخۆش نـیم لـە نزیـک مزگەوتـەوە بم! ئومێدم وایە خوای گەورە بە هاتنم بۆ مزگـەوت وە گەڕانـەوەم بـۆ مـاڵ(ئـەجرو پاداشتی تەواوم بـە نسـیب بکـات)کاتێـک ئـەم هەواڵـەیان دا بـە پێغەمبـەر ﷺ فـــەرموی:(داواکـــارم خـــوای گـــەورە پاداشـــتی ئـــەو هـــات و چـــۆیەی بـــۆ کۆبکاتەوەوپاداشتی بداتەوە)مسلم.

---

مرۆڤی موسوڵمان کاتێک دەچێتە ناو مزگـەوت قاچـی ڕاسـتی پـێش دەخـات و دەڵێ:(بە ناوی خـوا، خوایـە دەرگـای لێخـۆش بـوون و بـەزەیی خـۆت بـە ڕومـا بکەرەوە)وە کە دێتە دەرەوە قاچـی چـەپی پـێش دەخـات و دەڵـێ:(خوایـە داوای فەزڵ و بەرەکەت و قبوڵ بوونی نوێژت لێدەکەم)

# وَقتُ الصَّلاةِ

كانَ النَّبيُّ ﷺ يَحْرِصُ على أصحابِهِ حِرْصاً شَديداً، ويَحُثُّهُمْ على الأفعالِ الطَّيِّبةِ، والبُعدِ عن مَداخِلِ الشَّيطانِ، لِذَا أمَرَ النَّبيُّ ﷺ أصحابَهُ بِأَنْ لاَ يَخرُجَ أحَدُهُمْ مِنَ المَسجِدِ إذَا مَا أذَّنَ المُؤذِّنُ للصَّلاةِ إلاَّ بعدَ أنْ يُؤَدِّيَ الصَّلاةَ التي حانَ وَقتُهَا.

وذاتَ يومٍ، كانَ أبو هُرَيْرةَ رضي الله عنه جَالِساً في المَسجدِ النَّبويِّ.

وكانَ في المَسجدِ مَجموعةٌ مِنَ الصَّحابةِ وَالتَّابِعينَ، فحانَ وقتُ الصَّلاةِ، فأذَّنَ المُؤذِّنُ.

وَفي أثناءِ الأذَانِ، قامَ رَجلٌ لِيَخرُجَ مِنَ المَسجدِ، فأخَذَ أبو هُرَيْرةَ رضي الله عنه[يقولُ] وهُوَ يُشيرُ إليهِ: أمَّا هذَا فَقَدْ عَصَى أبَا القاسِمِ ﷺ. [مسلم].

---

إذَا كانَ الإنسانُ في المَسجدِ، وحَضَرَتِ الصَّلاةُ، وأذَّنَ المُؤَذِّنُ، فمِنَ السُّنَّةِ أنْ يَنتَظِرَ، ولاَ يَخرُجَ مِنَ المَسجدِ إلاَّ بعدَ أداءِ الصَّلاةِ.

# کاتی نوێژ

پێغەمبەر ﷺ بەردەوام هاوەڵانی هـان دەدا بـۆ کـاری بـاش، ئامۆژگـاری دەکـردن خۆیـان بـە دوور بگـرن لـە دەروازەکـانی شـەیتان، لـەو بـارەوە ئامۆژگاری دەکردن کە کاتێک لە مزگەوت بوون و بانگی نوێژ درا نابێت لـە مزگەوت دەربچن تا نوێژەکەیان ئەنجام دەدەن.

-ڕۆژێکیان ئەبو هرەیرە رضي الله عنه دانیشتبوو لە مزگەوتەکـەی پێغەمبـەردا ﷺ و کۆمەڵێک لە هـاوەڵان و شـوێن کـەوتوان گوێیـان لـەبانگ بوو،لەسـەرەتای بانگەوە پیاوێک ویستی بڕواتـە دەرەوەی مزگـەوت، ئـەبو هرەیـرە کـابرای توند گرت و فەرموی:(پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لـەم کـارە کـردووە، ئەگـەر وا بکەیت بێ فەرمانی پێغەمبەرە)(مسلم).

---

-هەرکاتێک کەسێک لەناو مزگەوتا بوو، وەکاتی نوێژ بوو،وەگوێی لە بانگ بوو ئەوا سوننەت وەهایە چاوەڕێی بکات تانوێژ دەکات،وەنەچێتە دەرەوە لـە مزگەوت هەتا نوێژەکەی بەجێ ئەهێنێ (مەگەر کاتێک بەهانەیەکی شـەرعی هەبێت)

# مَسجِدُ المُنافِقينَ

كانَ أَبو عَامرٍ الرَّاهِبُ مِنْ أشَدِّ النَّاسِ عداوةً لِلرَّسولِ ﷺ، فلَمَّا انتَشَرَ الإِسلامُ، هرَبَ إلى بلادِ الرُّومِ وأرسَلَ إلى بَعضِ أعوانِهِ مِنَ المُنافِقينَ يُخبِرُهُمْ بأَنْ يتَّخِذُوا مَقراً لَهُمْ، وبِأنَّهُ سَوفَ يأتِي بجَيشٍ مِنَ الرُّومِ يُقاتِلُ بِهِ مُحمَّداً، وَيخرِجُهُ مِنَ المَدينةِ.

فقامَ المُنافِقُونَ ببناءِ مَسجدٍ؛ لِيكُونَ مَقراً يُدبِّرُونَ فيهِ مكائدَهُمْ، ثُمَّ ذهَبُوا إلى النَّبيِّ ﷺ وَطلَبُوا مِنْهُ أن يُصلِّيَ فيهِ، ولكنَّ النَّبيَّ ﷺ كانَ خَارِجاً إلى غَزوةِ تَبُوكَ، فأجَّلَ الذَّهابَ إليهِمْ حتَّى يَعودَ.

وَأخبَرَ اللهُ عزَّ وجلَّ نبيَّهُ ﷺ بما عزَمَ عليهِ المُنافِقُونَ، قَالَ تَعالَى: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾[البقرة:١٠٧] التوبة

فَاستجابَ النَّبيُّ ﷺ لأمرِ اللهِ، وَأمرَ بهَدمِ المَسجدِ وإحراقِهِ.

---

يُكرَهُ التَّباهِي وَالتَّفاخُرُ في بناءِ المساجدِ وتَشييدِهَا، قَالَ رسُولُ ﷺ: «مِن أشراطِ السَّاعةِ (علاماتِ قُربِهَا) أَنْ يَتَباهَى النَّاسُ في المساجدِ» [أبو داود].

# مزگەوتی دووڕووەکان.

(ئەبو عامری راهب) یەکێ بوو لەو کەسانەی کـە زۆر دژایـەتی پێغەمبـەری ﷺ دەکـرد، کاتێک ئیسلام بلاو بۆوە بەناوچەکاندا، (ئەبو عامر) ڕایکرد بۆ وڵاتی ڕۆم،وەنامـەی نـارد بـۆ شوێن کەوتوانی لە دوڕوەکـان کـە شـوێنێک دروسـت بکـەن وەک بنکـەو بارەگایـەک بـۆ خۆمان،بەم زووانە بە سوپایەکی گەورەی ڕۆمەوە دێمەوە و دەجەنگێین لەگـەڵ موحەمـەد و لەشاری مەدینە دەری دەکەین.

- دوو ڕووەکانیش مزگەوتێکیان دروست کرد، تا ببێتە بنکەو جێگـای تـەگبیرو بەرنامـەی خراپ دارشتن. ڕۆیشـتن بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ داوایـان لێکـرد کەبچـێتە ئـەو مزگەوتـەو نوێژێکی تیا بکا، بەڵام لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ ئەڕۆشت بۆ غەزوەی تـەبووک، بۆیـە دوای خست بۆ پاش گەڕانەوەی.

*خوای گەورە هـەواڵی دا بـە پێغەمبـەر ﷺ کەئـەم کـارە دووڕووەکـان کردوویانـە، وە فـەرموی:(ئـەو دووڕووانـەی کـە مزگـەوتێکیان دروسـت کـرد لەبـەر زەرەردان و بـڵاو کردنەوەی بێ باوەڕی ودوو بەرەکی بەرپاکردن لە نێوان باوەڕداراندا و بۆ چـاوەڕوان کردنـی هاتنی ئەو کەسانەی کە پێشتر دوژمنایـەتی و جـەنگیان دژی خـواو پێغەمبەرەکـەی دەکـرد، بێگومان سوێند دەخۆن کە ئێمە تەنها مەبەستمان چاکە بووە لـە کاتێکـدا خـوایش شـایەتی دەدات کە بە ڕاستی ئەوانە درۆزنن)ئایەتی ١٠٧ سورەتی (التوبە).

*پێغەمبـەر ﷺ وەڵامـی فـەرمانی پـەروەردگاری دایـەوە وفـەرمانی دا بـە تێـک دان و سوتاندنی ئەو مزگەوتە.

---

کارێکی ناباشە زۆر زیادە مەسرەفیی لە مزگەوتـدا لـە ڕازاندنـەوەو هەنـدێ شـتدا،بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:(یەکێ لە نیشانەی هاتنی قیامـەت زۆر ڕازاندنـەوەی مزگەوتـە و ئەوەیە خەڵک بە مزگەوت شانازی بەسەر یەکدا دەکەن)ابوداود.

# المَشْيُ إلى المَسجدِ

كَانَ بنُو سَلَمةَ يَسكنُونَ في دِيارٍ بعيدةٍ جداً عَنِ المَسجدِ النّبويِّ. فكانُوا يُعَانُونَ مِنْ كثرةِ المَشيِ عندَ ذَهابِهِمْ إلى المَسجدِ؛ أو عَودتِهِمْ منْهُ.

وذاتَ يَومٍ، أرادَ بنُو سَلَمةَ [أَنْ] يَبيعُوا دِيارَهُمْ ويَنتَقلُوا إلى جِوَارِ المَسجدِ، فبَلَغَ ذلكَ رسُولَ اللهِ ﷺ، فَدَعَاهُمْ، وقَالَ لَهُمْ: «إنَّهُ قَدْ بلغَني أنّكُمْ تُريدُونَ أنْ تَنتَقِلُوا إلى المَسجدِ». قَالُوا: نَعَم يَا رسولَ الله. قَدْ أردْنَا ذلكَ.

فَقالَ لَهُمْ رسُولُ اللهِ ﷺ: «يَا بَني سَلَمةَ؛ دِيَاركُمْ تُكتَبْ آثارُكُمْ» (أي: أبقُوا في دِيارِكُمْ يكتُبُ اللهُ لكُمْ ثوابَ ذَهابِكُمْ وَعَوْدَتِكُم)، وكرَّرَهَا النّبيُّ ﷺ مَرّتينِ أو ثلاثةً.

ثُمَّ قالَ لَهُمْ أيضاً: «إنَّ لَكُمْ بِكُلِّ خُطْوةٍ دَرَجةً».

فَرَضيَ بنُو سَلَمةَ، وظلُّوا فِي دِيارِهِمْ، وكَانُوا يَقولُونَ: مَا كانَ يَسُرُّنا أنّا كنّا تَحوَّلْنَا. [مسلم].

---

المَشْيُ إلى المَسجدِ له فَضلٌ كبيرٌ عندَ اللهِ عزَّ وجلَّ، قَالَ ﷺ: «حينَ يَخرُجُ الرَّجُلُ مِنْ بَيتِهِ إلى مَسجدِهِ، فَرِجْلٌ تَكتبُ حسَنةً، ورِجلٌ تَمحُو سَيِّئةً» [النسائي].

# ڕۆشتن بەرەو مزگەوت.

(بەنو سەلەمە) ماڵیان زۆر دوور بوو لەمزگەوتەوە، بەردەوام باسی دەکرد وە بەکێشەیەکی گەورە تەماشای دەکرد وە نارەحەت دەبوو بەهاتن و گەڕانەوە،ڕۆژێکیان بەنو سەلەمە ویستی خانووەکەی بفرۆشێت وە خۆی نزیک بکاتەوە لە مزگەوت و ببێتە دراوسێی مزگەوت، پێغەمبەر ﷺ بەم باسەی زانی و ناردی بە شوێنیدا فەرموی:(بیستومە ئەتەوێ بارکەیت و خۆت نزیکی مزگەوت بخەیتەوە؟)بەنو سەلەمە وتی:بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ویستێکی ئاوام هەیە،پێغەمبەرﷺ فەرموی:(ئەی بەنی سەلەمە ئاسەواری ڕۆشتن و چونت لای خوا تۆمار دەکرێت و دەبێتە شاهید بۆت)بمێنەرەوە لە شوێنی خۆت با بەردەوام خێری هاتن و ڕۆشتنت بۆ بنوسرێ،پێغەمبەری خوا دوو سێ جار ئەم وتەی فەرموو،پاشان فەرموی:(تۆ بە هەموو هەنگاوێ کە دەینێیت بەرەو مزگەوت خوا پلەیەک بەرزت دەکاتەوە)بەنو سەلەمە ڕازی بوو وەخۆی هێشتەوە لەو دوورییە بەو هیوایەی بەردەوام ئەو پاداشتەی بۆ بنوسرێ،دەیفەرموو:(مادام ئاوایە قەت ئەم شوێنە ناگۆڕم)مسلم.

---

-بەپێ ڕۆشتن بۆ مزگەوت پاداشتی گەورەی هەیە لەلای پەروەردگار،چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:(کاتێک بەندەی خوا لە ماڵ دەردەچێ و بەرەو مزگەوت دەکەوێتە ڕێ،بە هەنگاوێکی خوا چاکەی بۆ دەنوسێ، بە هەنگاوەکەی تری گوناهێکی لەسەر دەسڕێتەوە)النسائی.

# ذِكْرُ اللهِ

دَخَلَ مُعاويةُ بنُ أبي سُفيانَ رضي الله عنه المَسجِدَ، فوجَدَ فيهِ جماعةً منَ النَّاسِ جالسينَ على شكلِ حَلقَةٍ، فَسألَهُمْ: مَا أجلَسكُمْ؟ قَالُوا: جلَسْنَا نَذكرُ اللهَ. فَقالَ لَهُمْ: آللهِ؛ مَا أَجْلَسَكُمْ إلاَّ ذاكَ؟ قَالُوا: وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إلاَّ ذَاكَ. فَقالَ مُعاويةُ: أمَا إنِّي لَمْ أستحْلِفْكُمْ تُهمَةً لَكُمْ، ولَكنْ بَلَغَنِي أنَّ رسُولَ الله ﷺ دخَلَ المسجِدَ يَوماً، فوجَدَ مَجموعةً مِنْ أصحابِهِ جَالسِينَ يَذْكُرُونَ اللهَ، فَقالَ لَهُمْ: «مَا أجلَسكُمْ؟». قَالُوا: جَلَسْنَا نذكُرُ اللهَ ونَحمَدُهُ على مَا هَدَانَا للإسلامِ ومَنَّ بهِ عَلينَا. فَقالَ ﷺ : «آللهِ مَا أجلَسَكُمْ إلاَّ ذاكَ؟» قَالُوا: وَاللهِ مَا أجلَسَنَا إلاَّ ذَاكَ. فَقالَ ﷺ : «أمَا إنِّي لَمْ أستحْلِفْكُمْ تُهمَةً لَكُمْ، ولَكِنَّهُ أتَانِي جِبريلُ فأخبَرَنِي أنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يُبَاهِ بِكُمُ المَلائكةَ» [مسلم].

فَاللهُ عزَّ وجلَّ يُبَاهِي الملائكةَ بِالعَبدِ المسلمِ الذِي يَجلِسُ فِي المَسجدِ؛ يَذكُرُ اللهَ، وَيَتعلَّمُ أمُورَ الدِّينِ.

---

خَصَّ اللهُ ثلاثةَ مساجدَ في الأرضِ بالفَضلِ العَظيمِ، قَالَ ﷺ: «لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاَّ إلى ثلاثةِ مساجدَ: مسجدِ الحرَامِ، ومسجدِي هذَا، ومسجدِ الأقصى» [متفق عليه].

# یادی خوا

موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕۆشتە مزگەوتەوە،بینی وا کۆمەڵێ خەڵك دانیشتوون بە شێوەی بازنەیی، پرسیاری لێکردن: بۆچی ئاوا دانیشتوون؟وتیان:دانیشتووین و یادی خوا دەکەین،معاویە وتی:سوێندتان دەدەم تەنها بۆ ئەوە دانیشتوون؟وتیان:سوێند بەخوا تەنها بۆ ئەوە دانیشتووین.معاویە وتی:من کە سوێندم دان وە نەبێ تۆمەت بخەمە پاڵتان، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک کۆمەڵێك لەیارانی بینی، فەرمووی:(بۆچی دانیشتون)؟وتیان:دانیشتووین یادی خوا دەکەین و سوپاسی دەکەین لەسەر ئەوەی کە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام بەهۆی ئەوەوە منەتی کردووە بەسەرماندا،

فەرمووی:سوێندتان دەدەم ئایا تەنها لەبەر ئەوە دانیشتوون؟وتیان:سوێند بەخوا تەنها لەبەر ئەوە دانیشتووین!فەرمووی:من تۆمەت ناخەمە پاڵتان و لەبەر ئەوەش سوێندم نەدان، بەڵام جوبرەئیل هاتە لام و هەواڵی پێدام کە:(بەڕاستی خوای گەورە شانازی دەکات بە ئێوەوە لەلای فریشتەکان)مسلم.

خوای گەورە شانازی دەکات بەبەندە موسوڵمانەکانی لەلای فریشتەکان،ئەو بەندانەی لە مزگەوتەکانا دەمێننەوەو سەرگەرمی یادی خوان و خۆیان شارەزا دەکەن لە ئایینەکەیان.

---

خوای گەورە فەزڵی سێ مزگەوتی زیاتر کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (پشتێن توند ناکرێ بە مەبەستی سەفەر کردن مەگەر بۆ سێ مزگەوت نەبێت، مزگەوتی حەرام، ئەم مزگەوتەی من، مزگەوتی ئەقصا) متفق علیه

# مِيراثُ النَّبيِّ ﷺ

لاحَظَ أَبو هُرَيرةَ رضي الله عنه أنَّ النَّاسَ قَد انشَغَلُوا بالبَيعِ وَالتِّجارةِ، وَتركُوا حَلَقاتِ العِلْمِ في المَسجِدِ، وذلكَ بعدَ وَفـاةِ الرَّسولِ ﷺ، فحَزِنَ أبو هُرَيرةَ حُزْناً شَديداً.

وفِي يَومٍ مِنَ الأيَّامِ، مَرَّ أَبو هُرَيرةَ رضي الله عنه بِالسُّوقِ، فنادَى بأعلَى صوتِه: يَا أهلَ السُّوقِ؛ ذَاكَ ميراثُ رَسولِ الله ﷺ يُقَسَّمُ وَأَنْتُمْ هَهُنَا؟! ألاَ تذهَبُونَ فتأخُذُونَ نَصِيبكُمْ مِنْهُ؟ فَقـالُوا: وَأينَ هُـوَ؟ قَـالَ: في المَسـجد. فَأسـرَعَ النَّـاسُ إلى المَسـجدِ، وَوَقَفَ أبو هُرَيْرةَ يَنتظِرُهُمْ.

وبعدَ قَليلٍ، عادَ النَّاسُ إليه، وقَالُوا: يَا أَبا هُرَيْرةَ؛ قَدْ أَتَينَا المَسجدَ، فلَمَّا دَخَلْنَاهُ لَمْ نَرَ شَيْئاً يُقَسَّـمُ. فَسـأَلَهُمْ: ومَـا رأيـتُمْ أحَداً في المَسجد؟ قَالُوا: وَجَدْنَا قَوماً يُصَلُّونَ، وقَوماً يقـرَؤُونَ القُرآنَ، وقَوماً يتذَاكَرُونَ الحلالَ والحرامَ. فقالَ أَبو هُرَيْرةَ: ذاكَ مِيراثُ مُحمَّدٍ ﷺ. [الطبراني].

---

لاَ يَجوزُ لأحدٍ أنْ يتَّخذَ المسـجدَ طَريقـاً للعُبـورِ؛ إلاَّ لِضَـرورةٍ. قـالَ رسُـولُ الله ﷺ: «لا تَتَّخِـذُوا المسـاجِدَ طُرُقـاً إلاَّ لِـذِكْرٍ أو صـلاةٍ» [الطبراني].

# میراتی پێغەمبەر ﷺ.

ئەبو هورەیرە ﷺ کە بینی خەڵك بە تەواوی سەرقاڵ بوون بە کڕین و فرۆشتنەوەو وازیان هێناوە لە کۆڕی زانست و دەرس و دەور لە مزگەوتدا لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ئەبو هورەیرە زۆر بێتاقەت بوو بەم حاڵەتە.ڕۆژێکیان رویشت بەبازاڕدا و بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد:ئەی خەڵکی بازاڕ!وا لە مزگەوتدا میراتی پێغەمبەر ﷺ دابەش دەکری و ئێوەش لێرەن؟ بڕۆن فریاکەون بابەشی خۆتان دەست بکەوێ!

وتیان: لەکوێ یە؟ فەرموی: وا لەمزگەوتە. خەڵکەکە زۆر بەخێرایی ڕۆشتن بەرەو مزگەوت، ئەبو هورەیرە وەستا لە شوێنی خۆیا چاوەڕوانی دەکردن.دوای کەمێك، خەڵکەکە گەڕانەوە بۆ لای ئەبو هورەیرە،ووتیان: ئەی ئەبو هورەیرە!ڕۆیشتین بۆ مزگەوت، بەڵام کەچوینە ژوورەوە هیچمان نەدی دابەش بکرێ.پرسی: کەستان نەدی لەناو مزگەوتدا؟ ووتیان: هەندێك خەڵکمان دی نوێژیان دەکرد وە کۆمەڵێکیان قورئانیان دەخوێند وە هەندێکیان تاو توێو باسی حەڵاڵ و حەرامیان دەکرد.

ئەبو هورەیرە:فەرموی: (بەڵێ ئەوەیە میراتی موحەممەد ﷺ) (الطبرانی)

---

دروست نی یە کەس مزگەوت بەکار بهێنێت وەك ڕێگای هات و چۆ تەنها بۆ پێویست نەبێ. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (نەکەن مزگەوت بەکار بهێنن بۆ ڕێگە و هاتوچۆ، مەگەر بۆ یادی خواو نوێژ کردن) (الطبرانی).

# قَصَصُ آدابِ المسَاجدِ

المَساجدُ بُيوتُ اللهِ، وَهي خَيرُ بقاعِ الأرضِ، فِيهَا تَنزِلُ الرَّحمةُ والسَّكِينةُ، ويَعمرُهَا المؤمنونَ، قَالَ تَعالَى: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ [التوبة:١٨].

وقَدْ أَعَدَّ اللهُ لزُوَّارِ المساجدِ أجراً عَظيماً، قَالَ النَّبيُّ ﷺ: «مَنْ غدَا (ذهبَ) إلى المسَجدِ أو رَاحَ (عادَ منهُ)، أَعَدَّ اللهُ لَهُ في الجنَّةِ نُزُلاً (مَكاناً جَميلاً) كلَّمَا غَدَا أو رَاحَ» [متفق عليه].

وللمساجدِ في المجتمعِ الإسلاميِّ أهميَّةٌ كبيرةٌ، وَوظَائفُ عَظيمةٌ؛ فَهِيَ أماكِنُ العِبادةِ، وتَلَقِّي العُلومِ. وَالإسلامُ يَحرَصُ على أن تظَلَّ مكانةُ المَسجِدِ سَاميةً، ولهذَا فَقَدْ وضَعَ آداباً وسلُوكيَّاتٍ لكُلِّ مَن يدخُلُ المسجِدَ، مِنْهَا: الهُدوءُ والسَّكِينةُ، وَالخُشوعُ، وتَنظِيفُ المسجِدِ، وتطيِيبُهُ.. وَغيرُ ذلكَ.

وَهذِهِ القِصصُ ـ التي قرأناهَا ـ تجمَعُ لنَا الكثيرَ مِنَ الآدابِ الإسلاميَّةِ التي يَجِبُ أَنْ يتَحلَّى بهَا المُسلِمُ داخِلَ المسجِدِ، ويَلتزِمَ بهَا.

* * * * *

# چیرۆكەكانی ئادابی مزگەوت.

مزگەوت ماڵی خوایە،وە پیرۆزترین شوێنی سەر زەوین، لەمزگەوتدا بەزەیی و سارامی دادەبەزێ، موسوڵمانان بینای مزگەوت دەكەن.خوای گەورە دەفەرموێت:(ئەوانەی مزگەوت دروست دەكەن ئەوانەن كەباوەڕیان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە)التوبە ١٨

-خوای گەورە پاداشتی گەورەی داناوە بۆ ئەو كەسانەی كە بەردەوام سەردانی مزگەوت دەكەن.پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(هەركەسێك بچێت بۆ مزگەوت و بگەڕێتەوە، خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا شوێنێكی جوان و خۆشی بۆ ئامادە دەكات بە هۆی ئەو هاتوو چۆیەی كەبۆ مزگەوتی دەكرد)(متفق علیە).

-لە كۆمەڵگای موسوڵماندا مزگەوت دەورێكی گەورەی هەیە، وە كارێكی گەورەی هەیە.وەشوێنێكە بۆ بەندایەتی و خواپەرستی، شوێنی فێربوونی زانستەكانە. ئیسلام زۆر داكۆكی دەكات لەسەر ئەوەی كە دەبێت مزگەوت ڕێزو مەكانەتی پارێزراو بێت.هەر بۆیە كۆمەڵێك ئاداب و سلوكیاتی داناوە بۆ ئەو كەسانەی هات و چۆی مزگەوت دەكەن و دەچنە ناو مزگەوتەوە، لەوانە:لەسەر خۆیی و ئارامی و مل كەچی وپاك ڕاگرتنی مزگەوت وە بۆنخۆش كردن و چەندەها شتی تر.ئەم چیرۆكانەی كە خوێندمانەوە فێرمان دەكا كاتێك ڕودەنێینە ناو مزگەوتەكان بە ئادابێكی جوان بچینە ناو مزگەوت وە پەیوەست بین پێوەی،كەسێكیش دڵی وابەستەی مزگەوت بێت لە قیامەتدا لە ژێر سێبەری عەرشی خوادایە.

# مَشَقَّةُ العمَلِ

تزوَّجَ عليٌّ بنُ أبِي طالبٍ ـ رضيَ اللهُ عنه ـ السَّيِّدةَ فاطمةَ بنتَ رسولِ اللهِ ﷺ، فكانتْ تطحَنُ بالرَّحَى فِي بيتِ زوجِهَا حتَّى تعبَتْ تعباً شديداً، فأشارَ عليها عليٌّ ـ رضيَ اللهُ عنه ـ أنْ تذْهبَ إلى أبيهَا رسولِ اللهِ ﷺ، وتطلُبَ منْهُ خادِماً يُساعِدُهَا فِي أعمالِ المنزلِ. فَذَهَبتْ فاطمةُ إلى رسولِ الله ﷺ، لكنَّها استَحْيَتْ أنْ تَطلُبَ منْهُ شيئاً، ورجَعَتْ.

ثمَّ عادَتْ هِي وزوجُها عَلِيٌّ ـ رضيَ اللهُ عنهمَا ـ إلى رسولِ الله ﷺ مرَّةً أخرَى، واشتَكَيَا إليه كثرةَ العمَلِ، وشِدَّةِ التَّعَبِ، وطلَبَا منْهُ أنْ يُعطِيَهُمَا خادماً.

فقالَ لهمَا النَّبيُّ ﷺ: «ألا أخبِرُكُمَا بخيرٍ مِمَّا سألْتُمَانِي؟». قالاَ: بَلَى، فقالَ: «كَلِماتٌ عَلَّمنِيهنَّ جبريلُ عليه السلام، فقالَ: تُسبِّحانِ فِي دُبُرِ (بَعْدَ) كُلِّ صلاةٍ عَشْراً، وتَحْمَدانِ عَشْراً، وتُكبِّرانِ عَشْراً، وإذا أوَيتُمَا إلى فراشِكُمَا فسبِّحَا ثلاثاً وثلاثينَ، واحمَدَا ثلاثاً وثلاثينَ، وكبِّرَا أربعاً وثلاثينَ» [أحمد].

---

بيَّنَ النَّبيُّ ﷺ لأصحابِهِ فَضْلَ التَّكسُّبِ مِنْ عمَلِ اليَدِ، فقالَ: «مَنْ أمسَى كالاًّ (مُتْعَباً) مِنْ عملِ يَدِهِ، أمْسَى مَغْفُوراً لَهُ» [الطبرانيّ].

# نارەحەتی ئیش

(علی کوڕی ئەبو طالب) ﷺ خاتوو فاتیمەی کچی پێغەمبەری خواست، لەماڵەوە ئیش و کاریان زۆر بوو وە زۆر ماندو دەبوون بە هۆی هاڕینی گەنم بە دەستاڕ، علی ﷺ داوای لە فاتیمە کرد کە بچێت بۆلای باوکی کە پێغەمبەرە ﷺ وە داوای لێبکات کە خزمەتکارێکی بداتێ تا یارمەتی بدات بۆ کاروبارەکانی ماڵەوە،خاتوو فاتیمە ڕۆشت بۆ خزمەت باوکی بەڵام شەرمی کرد ئەو داوایە لە باوکی بکات وە بەدەستی خاڵی گەڕایەوە،

-ئەم جارە لەگەڵ عەلی هاوسەری چون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە باسی ماندویی و نارەحەتی خۆیان کرد بە دەست ئیشی زۆرو کاری گرانەوە، داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە خزمەتکارێکیان بداتێ، پێغەمبەر ﷺ ڕوی تێکردن و فەرموی: (هەواڵتان بدەمێ بە شتێ کەلەوە باشترە کە ئێوە داوای دەکەن؟وتیان: بەڵێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی:چەند وشەیەکتان پێ دەڵێم کە جوبرەئیل منی فێر کردووە،فەرموی:(لە دوای هەموو نوێژێک دە جار (سبحان اللە) بکەن،وە دە جار (الحمد للە)بکەن، وە دە جار (اللە اکبر)بکەن، وەئەگەر چوونە سەر جێگای نوستن سی و سێ جار (سبحان اللە)بکەن و سی و سێ جار (الحمد للە) بکەن و سی و چوار جار (اللە اکبر)بکەن)رواە احمد.

---

-پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر هانی هاوەڵانی ئەدا کە نانی دەستی خۆیان بخۆن و کار بکەن.دەفەرموێ:(هەرکەسێ شەو دابێ بەسەریا ماندو بەهۆی کاری ڕۆژیەوە ئەوا خوا لەو شەوەدا لێ ی خۆش دەبێ)الطبرانی.

# أدَبُ الفتاتَينِ

كَانَ هُنَاكَ شيخٌ كبيرُ السِّنِّ، ليسَ لَهُ سِوَى ابنتَينِ، وكَانَ الشَّيخُ ضعيفاً لا يَقْدِرُ على العمَلِ، فكانتِ الفتاتانِ تعمَلانِ بِرَعْيِ أغنامِ أبيهِمَا خِلالَ ساعاتِ النَّهارِ. وقُبَيْلَ الغُروبِ تَعُودانِ وقَدِ امتَلأَتْ بُطونُ الأغنامِ بالعُشْبِ والماءِ.

وفِي يومٍ مِنَ الأيَّامِ، عادَتِ الفتَاتانِ مِنْ رَعْيِ الغَنَمِ قبلَ مَوعِدِهمَا، فسأَلَهُمَا أبوهُمَا عنِ السَّبَبِ، فقالَتْ إحداهُمَا: بينما كنَّا نَقِفُ بأغنامِنَا عندَ البِئْرِ بعيداً عنِ النَّاسِ، نَنْتَظِرُ حتَّى ينتَهُوا مِنْ سَقْيِ أغنَامِهم، أتَى إلينَا رَجلٌ فسألَنَا عَنْ أمرِنَا، فحكَيْنَا لَهُ قِصَّتَنَا؛ فسَقَى لنَا الأغنامَ.

وكَانَ هذَا الرَّجلُ هو نَبيُّ اللهِ مُوسَى عليه السلام، فقَدْ رأى أدَبَ الفتاتَينِ ووَقارَهُمَا، فأعَانَهُمَا علَى أداءِ عمَلِهِمَا، وسَقَى لَهمَا الأغنَامَ.

---

المُسلمةُ تَخرُجُ للكَسْبِ إذا احتاجَتْ إلى العَمَلِ، أوِ احتَاجَ المُجتَمعُ إلَى تخَصُّصِهَا وكفاءَتِهَا فِي أحَدِ المَجَالاتِ.

# ئەدەبی دوو کچ

پیاوێکی پیری بەساڵا چوو هەبوو تەنها دوو کچی هەبوو،ئەم پیاوە توانای کارکردنی نەمابوو کچەکانی لە جیاتی باوکیان کاریان دەکرد، ڕۆژانە چەند سەعاتی خەریکی مەڕ لەوەڕاندن بوون،لە نزیک خۆرئاوابوون دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە.ڕۆژێکیان ئەم دوو کچە زووتر لە ڕۆژان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، باوکیان پرسی چی وای کردووە ئەمڕۆ ئاوا زوو بێنەوە؟

یەکێکیان ووتی: ئێمە لەگەڵ مەڕەکانمان لە دووری بیرە ئاوەکە وەستا بووین چاوەڕێمان دەکرد تا ئەو خەڵکە لە ئاودانی مەڕەکانیان تەواو بن،پیاوێک هات و پرسی بۆ ئاوا دوور دانیشتوون؟ئێمەش حیکایەت و بەسەرهاتی خۆمان بۆ باس کرد، ئەویش مەڕەکانی پێش خۆی داو بۆی ئاو دایەوو ئێمەیش زوو گەڕاینەوە.(ئەو پیاوە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بوو،کەبینی ئەم دوو کچە ئەوەندە بەشەرم و حەیاو ویقارن،هەستا یارمەتی دان و مەڕەکانی بۆ ئاو دان.

---

ئافرەتی موسوڵمانیش ئەگەر پێویستی کرد دەبێ ئیش بکات،یان کۆمەڵگا پێویستی بە تواناو لێهاتوویی ئەو بوو لەهەر بوارێکدا بێت.

# مَهْرُ الفتَاةِ

اسْتَمَعَ أبو الفتَاتَينِ إلى حِكايةِ مُوسَى عليه السلام الذي سَقَى الأغنَامَ لابنتَيْهِ، فأرسَلَ إليهِ واحدةً منْهُمَا تَدْعُوه ليَشْكُرَهُ علَى حُسْنِ صَنِيْعِهِ. فذهبَتْ إليه، وقالَتْ لَهُ: ﴿إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ [القصص: ٢٥].

فاستَجَابَ نَبيُّ اللهِ موسَى عليه السلام، وحَضَرَ إليهِ، فأُعجِبَ الشَّيخُ بِهِ وأكرَمَهُ، ثمَّ عرَضَ عليهِ أنْ يتَزَوَّجَ إحدَى ابنَتَيْهِ، علَى أنْ يكُونَ مَهْرُهَا هُوَ رَعْيُ الأغنامِ لِمُدَّةِ ثمانيةِ أعوامٍ؛ أو عَشْرةٍ.

وافَقَ مُوسى عليه السلام علَى الزَّواجِ مِنِ ابْنَةِ الشَّيخِ الصَّالحِ، وبقِيَ أجيراً لدَيهِ عَشْرةَ أعوامٍ كامِلةً، يقُومُ بخِدمَةِ الأغنامِ ورِعايَتِهَا.

وبِهَذا دفَعَ مُوسَى عليه السلام مَهْرَ ابنَةِ الشَّيخِ الصَّالحِ، وتزَوَّجَهَا، فكانَ زَواجاً مُباركاً.

---

المُسلِمُ يكسَبُ حُبَّ الله عزَّ وجلَّ بإتْقانِ عمَلِه؛ قالَ ﷺ: «إنَّ اللهَ يُحِبُّ إذَا عَمِلَ أحدُكم عملاً أنْ يُتْقِنَهُ» [البيهقيُّ في شُعبِ الإيمانِ].

# مارەیی کچێك.

کاتێك باوکی دوو کچە بەسەرهاتی پێغەمبەر موسای (سەلامی خوای لێ بێت) ...ی بەوەی ئەمڕۆ مەڕەکانی ئاو داوە بۆ کچەکانی. یەکێ لەکچەکانی نارد بە شوین پیغەمبەر موسادا هەتا سوپاسی بکات لەسەر ئەو کارە جوان و باشەی کردوویەتی،کچە ڕۆشت و بە پێغەمبەر موسای ووت: ﴿إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ (القصص ٢٥).:باوکم بانگت دەکات و حەز دەکات پاداشتی ئەو چاکەیەت بداتەوە کە مەڕو ماڵاتەکەت بۆ ئێمە ئاودا، موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بەدەم دەعوەتەکەوە ڕۆشت و بینی پیاوێکی بە ساڵاچووە زور سەرسام بوو بە موساو ڕێزێکی زۆری لێنا،داوای لێکرد یەکێ لەکچەکانی بخوازێ وە مارەییەکەشی بریتی بێ لە شوانی هەشت ساڵ یان دە ساڵ ئەگەر توانیت.حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕازی بوو بە خواستنی کچی ئەو پیاوە چاك و خواناسە وە بۆ ماوەی دە ساڵ شوانی بۆ کرد و خزمەتی مەڕەکانی دەکردو چاودێری باشی دەکردن.

-بەم شێوەیە حەزرەتی موسا مارەیی کچی ئەو پیاوەی دا کە شوانی دە ساڵ بوو خوای گەورە فەڕو پیرۆزی بەسەردا ڕشتن.

---

موسوڵمان ئەگەر بیەوێ خۆشەویستی خوا مسۆگەر بکات دەبێ بەردەوامی ببێ لەکاردا وە ورد بێ لە ئیشیا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ (خوای گەورە پێی خۆشە ئەگەر کارێکت کرد بیبەیتە سەرو ورد بی تیایداو بە چاکی ئەنجامی بدەیت).

# تَمْرةٌ غالِيةٌ

فِي يومٍ منْ أيَّامِ الشِّتاءِ، رجَعَ عليٌّ بنُ أبِي طالبٍ ـ رضيَ اللهُ عنْهُ ـ إلَى بيتِهِ، وكَانَ جائعاً، لكنَّهُ لَمْ يَجِدْ طعاماً، فلبِسَ رِداءً مِنْ جلدٍ يَقِيْهِ البردَ؛ وخرَجَ يَبحَثُ عنْ عمَلٍ يتكسَّبُ منْهُ.

فمَرَّ علَى بُسْتَانِ رجلٍ يَهُودِيٍّ، فتَوقَّفَ أمامَهُ، ونظَرَ مِنْ فتحةٍ كانتْ بالسُّورِ، فوجَدَ اليَهُودِيَّ يَسْقِي زَرْعَهُ بِدَلْوٍ.

ولَمَّا رَأى الرَّجلُ اليَهُودِيُّ علِيّاً ـ رضيَ الله عنه ـ عرَضَ علَيهِ العمَلَ معَهُ، عَلَى أنْ يُعطِيَهُ تَمْرةً مُقابِلَ كُلِّ دَلْوٍ يَملَؤُهُ مِنَ البئرِ.. فوافَقَ عليٌّ ـ رضيَ الله عنه ـ لِمَا كانَ بِهِ مِنْ شِدَّةِ الجُوعِ.

وظَلَّ عليٌّ يعمَلُ لَدَى الرَّجلِ، وكلَّمَا ملأَ دَلْواً أعطَاهُ اليَهُودِيُّ تَمْرةً.. حتَّى جمَعَ عليٌّ عِدَّةَ تَمْراتٍ، فكَفَّ عَنِ العملِ، وأكَلَهَا وحمِدَ اللهَ تعالَى. [الترمذي].

---

أفضَلُ طَعامٍ هو ما يأكُلُه المَرءُ منْ سَعْيِهِ؛ قالَ ﷺ: «ما أكَلَ أحَدٌ طعاماً خَيراً مِنْ أنْ يأكُلَ مِنْ عمَلِ يَدِهِ، وإنَّ نبيَّ اللهِ داودَ كانَ يأكُلُ مِنْ عمَلِ يَدِهِ» [البخاري].

# خورمایەکی بەنرخ

ڕۆژێ لە ڕۆژەکانی زستان، عەلی کوڕی ئەبی تالب ﷺگەڕایەوە بۆ ماڵەوە و زۆری برسی بوو بەلاّم هیچ خواردنێک نەبوو لەماڵەکەیدا، پۆشاکێکی هەبوو لەپێستە دروست کرابوو لەبەری کرد تاسەرمای نەبێت دەرچوو لەماڵ بەڵکو دەستی لەکارێ گیر ببێ.ڕۆیشت بەلای باخی کابرایەکی جولەکەدا ڕاوەستا لەبەردەم باخەکەدا وە سەیری ناو باخەکەی کرد بینی وا کابرای جولەکە خەریکی ئاودانی باخەکەیەتی بە دۆڵچە.

کە کابرای جولەکە عەلی ﷺ بینی داوای لێکرد کە ئیشی بۆ بکات. لە بەرامبەردا بۆ دەرهێنانی هەر دۆڵچەیەک ئاو لە بیرەکەیدا دەنکێ خورمای بداتێ...حەزرەتی عەلی ﷺ ڕازی بوو دەستی کرد بە ئاو دەرهێنان لە کاتێکا زۆریش برسی بوو، بەردەوام بوو لە ئاو دەرهێنان بۆ کابرای جولەکە، کابراش بۆ هەر دۆڵچەیەک ئاو دەنکێ خورمای بۆ وەلا دەنا.هەتا وای لێهات کۆمەڵێ خورمای کۆکردەوە بەهۆی ئیشەوە ئینجا دەستی هەڵگرت لەکارەکەی، و دەستی کرد بەخواردنی و پاشان زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد)الترمذي.

---

باشترین خواردن ئەوەیە مرۆڤ بەرەنجی شانی خۆی پەیدای بکات،پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(هیچ خواردنێک باش نی یە بە ئەندازەی ئەو خواردنەی بەدەستی خۆت پەیدای دەکەی، و حەزرەتی داود ﷺ خواردنی دەستی خۆی دەخوارد)البخاري.

# القِرْدُ والصُّرَّةُ

فِي قديمِ الزَّمانِ، كانَ هناكَ رَجلٌ يشتَغِلُ بالتِّجارةِ، ولكنَّهُ إعتادَ أنْ يَغُشَّ النَّاسَ في بَيْعِهِ وميزانِهِ.

وذَاتَ يومٍ، باعَ التَّاجِرُ بِضاعتَهُ، وركِبَ سفينةً لِيَعودَ إلَى بلَدِهِ، وكانَ معَهُ قِردٌ يُلازِمُهُ أينمَا ذهَبَ.

وفِي السَّفينةِ، خبَّأَ التَّاجرُ صُرَّةَ المالِ، ونامَ. وعندمَا استَيقظَ، لَمْ يجِدِ القِردَ.

قامَ التَّاجرُ لِيَبْحَثَ عنِ القِردِ، فرآهُ فوقَ سارِيةِ السَّفينةِ وبيَدِهِ الصُّرَّةُ.. وكَانَ القِردُ يُلقِي دِرْهماً فِي البحرِ والآخَرَ في السَّفينةِ، حتَّى فَرَغَتِ الصُّرَّةُ مِنَ الدَّراهمِ. [أحمد].

وبهذَا ألقَى القِردُ المالَ الحرامَ فِي البحرِ، وحصَلَ التَّاجرُ علَى الثَّمنِ الحقيقِيِّ لِتجارَتِهِ، وبَقِيَ علَيهِ دَينٌ آخَرُ، يُحاسِبهُ اللهُ عزَّ وجلَّ عليهِ يومَ القيامةِ، وهوَ ثمنُ الغِشِّ.

---

حَذَّرَ النَّبيُّ ﷺ مِنَ الغشِّ والخِداعِ فِي الكَيلِ أو فِي الميزانِ، فقالَ: «مَنْ غشَّنَا فليسَ مِنَّا، والمَكرُ والخِداعُ فِي النَّارِ» [الطبراني وابن حبان].

# مەیمون و تورەکە پارە

لە دێرین زەمانـدا کابرایـەک خـەریکی بازرگـانی بووە،بـەڵام ئـەم پیـاوە زۆر کەسـێکی ناڕاسـت و فێڵبـاز بـووە لـە کـڕین و فرۆشـتن و کێشـانە و پێوانـەدا، رۆژێکیان ئەم بازرگانە کۆمـەڵێ کـەل و پـەلی کڕیبوو،سـوار کەشـتیەک بـوو بـۆ گەڕانەوە بۆ شاری خۆی.ئەم پیاوە مەیمونێکی پێ بوو لە ناو کەشتیەکەدا، کـابرای بازرگان پارەکانی لە تورەکەیەکدا قایم کردو لای سەری خۆیەوە دایناو خەوت کە خەبەری بـووەوە، مەیمونەکـە لـەوێ نـەمابوو.کـابرای بازرگـان کەوتـە گـەڕان و هەواڵپرسـینی مەیمونەکـە، کـە بینـی وا مەیمونەکـە چـووەتە سـەر کۆڵەکـەی کەشتیەکەو تورەکە پارەکەش بەدەستییەوەیە.

مەیمونەکـە تورەکەکـەی کـردەوە درهـەمێکی فـڕێ ئەدایـە نـاو دەریـاو درهەمێکیشی فڕێ ئەدایە ناو کەشتی یەکەوە،هەتا تورەکەکەی خاڵی کرد لەپارە) (احمد).

بەم شێوەیە مەیمونەکە ئەو پارانەی حـەرام بـوو فڕێـی دایـە نـاو دەریـاوە وە کابرای بازرگان قازانجی ڕاستەقینەی لە بازرگانیەکە بۆ مایەوە، وە ئەوەی مایـەوە قەرزە بۆ ئاخیرەت،خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا پرسـیاری لێـدەکات لـە بـارەوە ئەویش کاسبی ناڕاست و فێڵ بـازی و ئـەو پـارە بـوو کـە بـە خیانـەت دەسـتی خستبوو.

---

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری کردوین کـە فـرت و فێـڵ و غـەش نەکـەین لـە سەوداو کێشانەدا، دەفەرموێ:(ئەوەی فێڵ بکات لە ئێمە نی یە، ئەوانەی فـرت و فێڵ دەکەن لە ئاگری دۆزەخدان)الطبرانی وابن حبان.

# السَّعْيُ الطَّيِّبُ

فِي صباحِ أحَدِ الأيَّامِ، جلَسَ الصَّحابةُ معَ رسولِ اللهِ ﷺ، فرَأَوْا رَجلاً قوِيَّ البُنْيانِ، يُسرِعُ فِي السَّيرِ، ساعِياً إلى عمَلِه.

فتَعَجَّبَ الصَّحابةُ مِنْ قوَّةِ ذلكَ الرَّجُلِ ونشَاطِهِ، وقالُوا: يا رسولَ اللهِ؛ لو كانَ هذا فِي سبيلِ اللهِ (أي: لو أنَّهُ يستَخدِمُ قوَّتَهُ فِي الحرْبِ والجِهادِ في سبيل الله لَكَانَ خَيراً لَهُ).

فقالَ رسولُ اللهِ ﷺ مُوَضِّحاً لَهُم أنواعَ العمَلِ الطَّيِّبِ: «إنْ كانَ خرَجَ يَسْعَى علَى ولَدِه صِغَاراً؛ فهوَ فِي سبيلِ اللهِ. وإنْ كانَ خرَجَ يَسْعَى علَى أبوَينِ شيخَينِ كبيرَينِ فهو في سبيلِ اللهِ، وإنْ خرَجَ يسْعَى على نَفسِهِ يَعِفُّهَا (أي مِنْ سُؤالِ النَّاس)؛ فَهُوَ فِي سبيلِ اللهِ، وإنْ كانَ خرَجَ رِياءً ومُفَاخَرَةً؛ فهُوَ فِي سبيلِ الشَّيطانِ» [الطبراني].

---

اللهُ يُجازِي عِبادَهُ علَى أعمالِهم بقَدْرِ حُسْنِ نيَّاتِهِم؛ قالَ ﷺ: «إنَّما الأعمالُ بالنِّيَّاتِ، وإنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ ما نَوَى» [متفقٌ عليه].

# هەوڵێكی خاوێن

بەیانیەكیان هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوون، پیاوێكی بەهێزوبەشان و شەوكەتیان بینی زۆر بەخێرایی دەڕۆی بۆ سەر كارەكەی.هاوەڵان سەرسام بوون بە هێزو توانا وچالاكی ئەم پیاوە.بۆیە وتیان:ئەی پێغەمبەری خوا!ئەگەر ئەم هێزو توانا و ئازایەتی یەی لە ڕێی خوادا بوایە باشتر نەبوو.واتە:(ئەم هێزو توانایەی بۆ جەنگ و تێكۆشان لە ڕێی خوادا سەرف بكا باشترو چاكتر نی یە)

-پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕون كردنەوە كە كاری باش و چاك زۆرە وەك:ئەگەر پیاوێ دەرچێ لە ماڵ بۆ پەیداكردنی ڕزقی حەڵاڵ بۆ مناڵە ووردەكانی ئەوە لەڕێگەی خوادا كۆششی كردووە، ئەگەر بۆ ئەوە دەرچێ نان پەیدا بكا بۆ دایك و باوكە پیرەكەی ئەوە كاری لە ڕێگەی خوادا كردووە،ئەگەر بۆ ئەوە دەرچێ لە ماڵ وكاربكا وەعیزەتی نەفسی ڕابگرێ و سواڵ نەكا، ئەوە لە ڕێگەی خوادا كۆششی كردووە، بەڵام ئەگەر كار بۆ ڕوپامایی و خۆبەزلزانی بكا ئەوە لەڕێگەی شەیتانا كۆششی كردووەوهەوڵی داوە) (الطبرانی).

---

خوای گەورە پاداشتی مرۆڤەكان دەداتەوە بەئەندازەی چاكی نیەتیان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (كارو كردەوەكانتان بە نیەتە، هەموو كارێك دەگەڕێتەوە بۆ لای نیەتەكەی)متفق علیە.

# رِزقُ اللهِ

ذاتَ يَومٍ، صَلَّى النَّبيُّ ﷺ صلاةَ الفَجْرِ معَ أصحابِهِ فِي المَسجِدِ.

وبعدَمَا فرَغَ النَّبيُّ ﷺ مِنَ الصَّلاةِ تَوَجَّهَ إلى بيتِ ابنتِه السَّيِّدة فاطمةَ - رضيَ الله عنها - فوجَدَهَا ما زالَتْ نائمةً، وقَدْ طَلَعَ الصُّبحُ، فأيْقَظَهَا وأخبرَهَا بفَضلِ ساعاتِ البُكُورِ، وما فِيهَا مِنْ خيرٍ وبركةٍ، فقالَ: «يا بُنَيَّةُ؛ قُومي اشْهَدي رِزقَ ربِّكِ، ولاَ تكُونِي مِنَ الغافلينَ، فإنَّ اللهَ يُقَسِّمُ أرزَاقَ النَّاسِ ما بينَ طُلوعِ الفَجرِ إلى طُلُوعِ الشَّمسِ» [البيهقي].

ومِنْ ذلِكَ يتَعلَّمُ المُسلِمُ الدَّرْسَ، فيُسارِعُ إلى قضاءِ أعمالِهِ فِي البُكورِ، ليَحْظَى بهَذَا الخَيرِ الوَفيرِ، معَ مَا يكُونُ لدَيهِ مِنَ النَّشاطِ وراحةِ البَدنِ فِي الصَّبَاحِ.

---

التَّبكيرُ فِي السَّعْي إلى العَمَلِ فِيهِ خَيرٌ كثيرٌ؛ قالَ ﷺ: «باكِرُوا الغُدُوَّ فِي طلَبِ الرِّزْقِ، فإنَّ الغُدُوَّ بركةٌ ونجاحٌ» [البزار].

# رۆزی خوا

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵان کرد.لەدوای نوێژەکەی ڕووەوماڵی خاتوو فاتیمەی کچی ڕۆشت، بینی هێشتا ئەوان نوستون و بەخەبەر نەهاتوون لە کاتێکا تەواو دنیا ڕون بۆتەوە،خەبەری کردنەوەو ئاگاداری کردن لەفەزڵ و بەرەکەتی سەعاتی دوای نوێژی بەیانی، کەلەو کاتەدا خەیرو بەرەکەتێکی زۆر هەیە.فەرموی:(ئەی کچەکەم!هەستە شاهیدو بە ئاگا لەسەر ڕزقی پەروەردگار،نەکەی لە بێ ئاگایان بیت، چونکە خوای پەروەردگار ڕزق و ڕۆزی خەڵکی دیاری دەکات لە بەینی فەجرو ڕۆژهەڵاتدا) (البیهقی).

بەم شێوەیە موسوڵمانان دەرس دادەدات کە پەلەبکەن بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان لە بەیانیاندا،چونکە بەردەوام لە بەیانیاندا خێروچاکە هەیە،وەمرۆڤەکان بەیانیان چالاك و لەش ساغ و تەندروستن.

---

هەوڵدان بۆ بەخەبەرهاتنی بەیانیان بەزویی بۆ ڕاپەڕاندنی خێروچاکەی زۆرە! پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(پەلە بکەن لە بەیانیان بۆ داواکاری ڕزق و ڕۆزی،چونکە بەیانیان خێرو بەرەکەت و سەرکەوتنی تیایە)البزاز.

# الطَّريقُ إلى السُّوقِ

فِي المدينةِ المنَوَّرةِ، آخَى النَّبيُّ ﷺ بينَ المُهاجرينَ والأنصارِ، فكانَ عبدُ الرَّحمنِ بنُ عَوفٍ مِنَ المُهاجِرينَ أخاً لسَعْدِ بنِ الرَّبيعِ مِنَ الأنصارِ.

عرَضَ سَعْدٌ علَى عبدِ الرَّحمنِ أنْ يُعطِيَهُ نصفَ ما يَمْلكُ، فرفَضَ عبدُ الرَّحمنِ أنْ يأخُذَ شيئاً، وفَضَّلَ أنْ يتكَسَّبَ مِنْ عمَلِ يَدِه، وقالَ لسَعدٍ: بارَكَ اللهُ لكَ فِي أهلِكَ ومالِكَ. وطلَبَ منْهُ أنْ يَدُلَّهُ علَى السُّوقِ، فدَلَّهُ علَى مكانِهِ.

ذهَبَ عبدُ الرَّحمنِ إلى السُّوقِ، وعمِلَ بالتِّجارةِ، فاشتَرَى وباعَ، حتَّى ربِحَ بعضَ الأموالِ، فاشتَرَى لنَفسِهِ ما يَحتاجُ إليهِ مِنَ الطَّعامِ.

وظلَّ عبدُ الرحمنِ ـ رضِيَ الله عنه ـ يعملُ فترةً مِنَ الزمنِ، حتَّى تكوَّنَ لديهِ مالٌ كثيرٌ، واستَطاعَ أنْ يتزوَّجَ، ويقَدِّمَ مَهْراً لزَوجَتِهِ مِقدارُهُ وزنُ نواةٍ مِنْ ذَهبٍ. [ابن سعد].

---

دُعاءُ دُخولِ الأسواقِ هوَ: «لا إلهَ إلاَّ اللهُ وحدَهُ لا شَريكَ لَهُ. له المُلكُ ولَهُ الحَمدُ، يُحْيِي ويُمِيتُ وهُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الخَيرُ وهوَ عَلَى كُلِّ شيءٍ قَديرٌ» [الترمذي].

# ڕێگەی بازاڕ

لەمەدینەی پڕ نووردا –پێغەمبەری خواﷺ برایەتی دروست کرد لە نێوان کۆچەرییان و پشتیوانان‌دا. (عبدالرحمن کوڕی عەوفی) کرد بەبرای (سەعدی کوڕی ڕەبیعە) کەلە پشتیوانان بوو خەڵکی شاری مەدینە بوو.

-سەعد ماڵەکەی خستە بەردەستی عبدالرحمن وفەرمووی نیوەی بۆتۆ براکەم! بەڵام عبدالرحمن قبوڵی نەکرد هیچ شتی لە سەعد وەربگرێت، وەفەزڵی کارکردنی دا بەسەر شت وەرگرتندا.

وتی بەسەعد:خوای گەورە بەرەکەت بڕێژێ بەسەر ماڵ و منداڵ و کەس و کارتا،ڕێگەی بازارم نیشانبدە، سەعد ڕێگەی بازاڕی نیشان عبدالرحمن دا، عبدالرحمن ڕۆیشت بەرەو بازاڕ دەستی کرد بە بازرگانی کردن، شتی دەکڕی و ئەیفرۆشت، هەتا هەندێ قازانجی باشی دەستکەوت و کەوتە کڕینی پێداویستی خۆی لەخۆراک،عبدالرحمن ﷺبەردەوام بوو لە کەسابەت کردن تا ماوەیەکی زۆر، وای لێهات بووە خاوەنی سامانێکی زۆر،ئامادە بوو بۆ ژن هێنان، مارەییەکی باشی ئاڵتونی دیاری کرد بۆ ئەو ئافرەتەی کە خواستی) (ابن سعد).

---

نزای چونە ناوبازاڕ بریتییە: (هیچ خوایەك نی یە جگە لە الله –بێهاوەڵە لە موڵك و دەسەڵاتا، لە سوپاسی کردنا، ژیان و مردن بەدەست ئەوە، خوایەکی زیندووەو نامرێت هەموو خێرو چاکەیەك لە دەستی پەروەردگاردایە) (الترمذي).

# صاحِبُ القَدُومِ

ذَاتَ يومٍ، طلَبَ أحَدُ الفُقَراءِ صدَقةً مِنَ النَّبيِّ ﷺ، فَلَمْ يُعْطِه، وسَأَلَهُ عمَّا يَملِكُ، فأخبَرَهُ أنَّهُ يَملِكُ رِداءً وقدَحاً، فأمَرَهُ ﷺ بإحضارِهِمَا.

ثُمَّ باعَهُمَا النَّبيُّ ﷺ بدِرهمَينِ، وأعطَاهُمَا السَّائلَ، وأمَرَهُ أنْ يشتَرِي بأحَدِهمَا طعاماً لأهْلِه، ويَشتَرِيَ بالآخَرِ قَدُوماً..

فعَلَ الرَّجلُ ما أمَرَهُ بِهِ النَّبيُّ ﷺ، وعادَ بالقَدُومِ، فجهَّزَهُ لهُ النَّبيُّ ﷺ، وقالَ لَهُ: «اذْهَبْ فاحتَطِبْ، ولا أراكَ خمسةَ عَشَرَ يوماً». كَسِبَ الرَّجلُ مِنْ عمَلِه خلالَ هذِهِ الفترةِ عشْرَةَ دراهِمَ. فلَمَّا جاءَ إلى النَّبِيِّ ﷺ، قالَ لَهُ: «اشْتَرِ ببعضِهَا طعاماً، وبِبَعضِهَا ثَوباً».

ثُمَّ وضَّحَ لَهُ النَّبيُّ ﷺ أنَّ هذَا العَمَلَ أفضَلُ مِنْ سُؤالِ النَّاسِ والتَّسوُّلِ، فقالَ ﷺ: «هذَا خَيرٌ مِنْ أنْ تَجِيءَ المَسألَةُ (التَّسوُّلُ والشِّحَاذَةُ) نُكتَةً (علامَةً) فِي وجْهِكَ يومَ القِيامَةِ» [ابن ماجه].

---

قالَ ﷺ: «لأنْ يأخُذَ أحَدُكم حَبْلَهُ فيذْهَبَ بِهِ إلى الجبَلِ، فيَحتَطِبَ، ثُمَّ يأتِيَ بِهِ فيَحمِلَهُ علَى ظَهْرِهِ، فيأكُلَ.. خَيرٌ لَهُ مِنْ أنْ يسألَ النَّاسَ» [أحمد].

# خاوەنی تەور

ڕۆژێکیان، پیاوێک داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد تاخێرێکی پێبکا،پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی نەدایەو فەرموی: چیت هەیە لەماڵەوە؟ کابرا وتی: پارچە بەڕەیەک و پەرداخێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:بچۆ بیهێنە.ئەوجا پێغەمبەر ﷺ بۆی فرۆشت بەدوو درهەم.دایە دەستی سواڵکەرەکە -فەرموی: بەدرهەمێکیان خواردن بکڕە بۆ منالەکانت،بە درهەمەکەی تر تەورێ بکڕە... کابرا ڕۆشت ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموبوو جێبەجێی کردو گەڕایەوە تەورێکی بەدەستەوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی پیرۆزی تەورەکەی بۆ ساز کردو فەرموی..بڕۆ دار بهێنە لەو شاخە، تا پانزە ڕۆژ نەت بینم! کابرا ڕۆشت دەستی کرد بە دارهێنان وفرۆشتنی، لەو ماوەیەدا دە درهەمی دەست کەوتبوو، دوای پانزە ڕۆژەکە هاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بڕۆ بە هەندێکی خواردن بکڕە بەوەی تریشی پۆشاک و ڕاخەر بکڕە.وە پاشان بۆی ڕون کردەوە کەکار کردن باشترو پیرۆزە تا ئەوەی سواڵ بکەیت و دەست لە خەڵک پان بکەیتەوە فەرموی:(ئەمە باشترو چاکترە لەوەی کە سواڵ بکەی، چونکە سواڵکردن وادەکا خاڵێکی ڕەش لە دەم و چاوودا دەرکەوێ لە ڕۆژی دوایدا) (ابن ماجە).

---

پێغەمبەر ﷺ فەرموی:هەریەک لە ئێوە گوریسێک هەڵگرێ و بچێتە ئەو شاخە دار کۆکاتەوەو بیدات بە پشتیاو بیهێنێتە شارو بیفرۆشێ، وەپارەی ئەو کارەی بخوا باشترە لەوەی سواڵ بکات و داوا لە خەڵک بکات) (احمد).

# الخادمُ حُرٌّ

ذاتَ يَومٍ، كانَ النَّبيُّ ﷺ يَمشِي فِي أحَدِ شوارعِ المدينـةِ، فرَأَى أَبَا مسعودٍ البَدْرِيَّ رضي الله عنه يَضرِبُ خادِمَـهُ بالسَّـوطِ ضَرباً شديداً، فأتَـاهُ الـنَّبيُّ ﷺ مِـنْ خلْفِـهِ ونَـادَاه: «اعلَـمْ أبـا مسعودٍ!». لكنَّ أبَا مسعودٍ لَمْ يَعرِفِ الصَّوتَ مِنْ شِدَّةِ غضَبِهِ.

ولَمَّا اقترَبَ منْهُ النَّبِيُّ ﷺ عرَفَهُ أَبُـو مسـعودٍ، فقـالَ ﷺ: «اعلَمْ أَبَا مَسعودٍ أنَّ اللهَ أَقْدَرُ عليكَ؛ مِنْكَ علَى هَذَا الغُلامِ».

ومَا إنْ سَمِعَ أَبُو مسعودٍ رضي الله عنه كـلامَ الرَّسـولِ ﷺ حتَّى ارتَجَفَ، وسقَطَ السَّوطُ مِـنْ يَـدهِ، وقـالَ دُونَ تـرَدُّدٍ: لا أَضرِبُ مَملوكاً بَعْدَهُ أبداً.

ثُمَّ قالَ: يا رسولَ اللهِ! هُوَ حُرٌّ لوجْهِ اللهِ تعالَى.

فقالَ ﷺ : «أما لَوْ لَمْ تفعَـلْ للَفَحَتْـكَ النَّـارُ؛ أو لَمَسَّـتْكَ النَّارُ» [مسلم].

---

أرشَدَ النَّبيُّ ﷺ إلى حُسْنِ معاملةِ الخَـدَمِ، فقـالَ: «.. مَـنْ كـانَ أخُـوهُ تحتَ يَدِهِ، فلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يأكُلُ، ولْيُلْبِسْهُ مِمَّا يلبَسُ، ولاَ تُكَلِّفُـوهُم مـا يَغلِبُهُم، فإنْ كلَّفتُموهُم فأعِينُوهُم عليهِ» [مسلم].

# خزمەتکارێکی ئازاد کراو

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ ئەڕۆیشت بەیەکێ لە ڕێگاکانی ناو مەدینەدا چاوی کەوت بە ئەبا مەسعودی بەدریؓ کە بە قامچی زۆر بە قورسی ئازاری خزمەتگوزارەکەی ئەدا، لە دوایەوە پێغەمبەری خواﷺ بانگی لێکرد: (بزانە ئەبا مەسعود!بەڵام ئەبا مەسعود گوێی پێنەدا چونکە نەیبینی بە هۆی توڕەییەکەیەوە کاتێک پێغەمبەری خوا نزیک بویەوە ئینجا ئەبا مەسعود زانی ئەو دەنگەی بانگی لێدەکرد پێغەمبەری خوا بووە، پێغەمبەر فەرموی:(بزانە ئەبا مەسعود تۆ چەند بەتوانای بەسەر ئەو خزمەتکارەدا خوای گەورە زۆر بەتواناترە بەسەر تۆدا)کاتێک ئەبا مەسعود گوێی لە قسەکانی پێغەمبەرﷺ بوو زۆر نارەحەت بوو، قامچییەکە کەوتە خوارەوە لە دەستی -داوای لێبوردنی لە پێغەمبەر کردو وتی:جارێکی تر بەهیچ شێوەیەک لە خزمەتکار نادەم، پاشان وتی:ئەی پێغەمبەری خوا!ئەوا ئازادم کرد لە پێناوی خوای گەورەدا پێغەمبەرﷺ فەرموی:ئەگەر ئەم خزمەتکارەت ئازاد نەکردایە ئەوا شایستەی ئاگر دەبوی، یان ئاگر دەیسوتاندی) (مسلم).

---

پێغەمبەری خواﷺ ئاگادارمان دەکاتەوە کە مامەڵەمان جوان بێ لەگەڵ خزمەتکارەکانماندا.دەفەرموێ(هەرکەسێ برایەکی لە ژێر دەستدا بوو با خواردنی بداتێ لەو خواردنەی خۆی دەیخوات،وە پۆشاکی بۆ بکات لەو پۆشاکەی خۆی دەیکا،ئەرکی زۆرو گران مەدەن بە سەریاندا، ئەگەر خستان دەبێت بە وردی چاودێریان بکەن و هاوکارییان بکەن) (مسلم).

# الفَهمُ الخَاطِئُ

ذهَبَ أحَدُ الصَّالحينَ إلى إحدَى الجِهَات؛ لأداء مُهِمَّةٍ لَـهُ، فلَمْ يَجِد المُوظَّفَ المُختَصَّ، فسأَلَ عَنْهُ، فقِيلَ لَهُ: إنَّهُ يَستَعِدُّ لِصَلاةِ الظُّهرِ.

وكانَ ما يزَال علَى وقتِ أذانِ الظُّهرِ أكثَرَ مِنْ ساعةٍ كاملةٍ.

فسألَ الرَّجلُ عنْ مكانِ المُوظَّفِ، فدلُّوه علَيهِ، فطَلَبَ منْهُ أنْ يُؤَدِّيَ لَهُ مُهِمَّتَه. فقالَ المُوظَّفُ فِي غَيظٍ: ألاَ تعلَمُ أنَّ الصَّلاةَ فَرِيضةٌ علَى كُلِّ مُسلِمٍ؟

فقالَ الرَّجلُ: وعَمَلُكَ ـ أيضاً ـ فَرِيضةٌ.

قالَ المُوظَّفُ: وكيفَ ذلكَ؟ قالَ الرَّجلُ: لأنَّ هنـاكَ اتِّفاقاً تَـمَّ بينَكَ وبينَ هذه المُؤَسَّسةِ، يَقْضِي بأنْ تعملَ لدَيهَا مُقابِلَ أجْرٍ مُحَدَّدٍ، فليسَ لَكَ أنْ تُعَطِّلَ مَصَالِحَ النَّاسِ، أمَّا الصَّلاةُ فلَمْ يَحِنْ وقتُهَا بعدُ.

فأدرَكَ المُوظَّفُ خطَأَهُ، واعتَذَرَ لِلرَّجُلِ، ووَعَدَهُ ألاَّ يَعُودَ إلَى التَّقصيرِ فِي عمَلِه مرَّةً أُخرَى.

---

حرَصَ الصَّحابةُ علَى مَعرفةِ الحَلالِ والحَرامِ؛ قالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه: لا يَبِيعُ فِي سُوقِنَا هذا إلاَّ مَنْ تفَقَّهَ فِي الدِّينِ. [الترمذي].

# بۆچونی هەڵە

ڕۆژێك یەكێ لە پیاو باشان ڕۆشت بۆ جێگەیەك بۆ بـەجێ هێنـانی كاروبارێـك، كە چووە شوێنەكە بینی كارمەندی تایبەتی ئەو كارە نەبوو لەوێ،پرسی لە كوێیە فلان كەس؟ وتیان:چووە بۆ بەجێهێنانی نوێژی نیوەڕۆ لـە كاتێكـدا نوێـژی نیـوەڕۆ یەك سەعاتی تەواوی مابوو.

كابرا پرسی: لەكوێیە ئەو شوێنەم پیشـانم بـدەن!.كـابرای بینـی پێـی وت: بـۆ كارەكەت جێهێشـتووە؟ .وتـی:ئـەی نـازانی نوێـژ واجبـە لەسـەر هـەموو تـاكێكی موسوڵمانان؟ كەپیاوە وتی:وەڕاپەڕاندنی ئـیش و كـاری خـەڵكی بەهـەمان شـێوە واجبە، كارمەندەكـە وتـی:چـۆن ئـەزانی؟پیاوە وتـی:چـونكە لـە نێـوان تـۆو ئـەم دەزگایەدا ڕێكەوتن هەیە بەوەی تـۆ كـار بكـەی وەئـەوانیش كـرێ بدەنـە تـۆ، وەنابێ كاروباری خەڵكی ڕاوەستێنی لەبەر بەرژەوەندی خۆت، وەنوێژەكەت كـاتی بەسەر ناچێ هێشتا زۆریشی ماوە.كابرای كارمەند هەستی بە هەڵـەی خـۆی كـرد وە داوای لێبوردنی كرد لەو پیاوە، وەبەڵێنی دا كەجارێكی تر كەمتەرخەمی نـەكات و دەوام جێنەهێڵێ.

---

هاوەڵان زۆر داكۆكیان دەكرد لەسـەر زانینـی حـەڵاڵ و حەرام،عومـەری كـوڕی خەتاب دەفەرموێ(نابێت هیچ كەس لە بـازاڕدا كـڕین و فرۆشـتن بكـات مەگـەر شارەزایی هەبێ لە دیندا)واتـە لـە بابـەتی حـەڵاڵ و حـەرامی مامەڵـەو سـەودادا دەبێت شارەزا بێت. (الترمذی)

# سَدٌّ بينَ جبلَينِ

كَانَ ذُو القَرْنَينِ مَلِكاً عادِلاً، آتَاهُ اللهُ مُلْكاً كبيراً.

وفِي أحَدِ الأيَّامِ خرَجَ يتجَوَّلُ فِي مَمْلَكتِه، ويَطمَئِنُّ علَى أحوَالِ رعيَّتِهِ، فمَرَّ بقَومٍ يَسكُنُونَ خَلْفَ جبَلَينِ، فلَمَّا رأَوا ذَا القَرْنَينِ، طلَبُوا مِنْهُ أنْ يَبنِيَ سَدّاً بينَهم وبينَ قَبيلَتَيْ يأْجُوجَ ومأْجوجَ؛ لأنَّ أهْلَهُمَا يُفسِدونَ فِي الأَرضِ. وعرَضُوا علَيه أجْراً، فلَمْ يأْخُذْهُ.

ثُمَّ أمَرَهُم ذُو القَرْنَينِ أنْ يُساعِدُوه، ويُعِينُوهُ بقوَّتِهِمْ، وبيَّنَ لَهم أنّ العمَلَ يحتاجُ إلى كثيرٍ مِنَ التَّعبِ والمشَقَّة، فجَمَعُوا الحَديدَ، وأَوْقَدُوا عليهِ النِّيرانَ، وصبُّوا عليهِ النُّحَاسَ المُذَابَ.. وظَلُّوا يعمَلونَ بِجِدٍّ ونَشاطٍ حتَّى فرَغُوا مِنَ العمَلِ، وتَمَّ البِناءُ الَّذي طَلَبُوهُ.

وحِينَئذٍ لَمْ يَنْسُبْ ذُو القَرْنَينِ الفَضلَ إلى نَفسِهِ، وإنَّمَا قالَ: ﴿هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ﴾ [الكهف: ٩٨].

---

أرشَدَ رسولُ اللهِ ﷺ إلى المُداوَمةِ علَى الأعمالِ الصَّالحةِ، وإنْ كانَتْ قليلةً، فقالَ ﷺ: «أحَبُّ الأعمالِ أدْوَمُهَا وإنْ قَلَّ» [البخاري].

# بەربەستێك لە بەینی دوو شاخدا

(ذوالقرنین) پادشایەکی دادپەروەر بوو، خوای گەورە دەسەڵات و ماڵێکی زۆری پی بەخشیبوو،ڕۆژێکیان دەرچوو بۆ گەڕان بە ناو وڵاتیدا،هەتا دڵ ئارام بێ لە ئەحواڵی دانیشتوانی،ڕۆشت بەلای گەلێکدا کە لە نێوان دوو شاخدا دەژیان. لەگەڵ (ذوالقرنین) یان بینی داوایان لێکرد کە بەربەستێکیان بۆ دروست بکات لە نێوان ئەوان و گەلی(یأجوج ومأجوج) چونکە ئەو گەلە سەر زەوی پیس دەکەن وە خراپە بلاو دەکەنەوە وە ئەجرو پاداشتێکیان خستە بەردەستی ئەگەر ئەو کارەیان بۆ بکات، بەلأم ئەو قبوڵی نەکرد.(ذوالقرنین) فەرمانی کرد بەوەی هاریکاری بکەن وە بەهەموو هێزی خۆیان بەشداری بکەن، بۆی ڕونکردنەوە کە ئەم کارە زۆر قورس و گرانە وە کاتی زۆری دەوێ، دەبێ ئاسنێکی زۆر کۆبکرێتەوەو پاشان ئاگرێکی گەورە بکرێتەوە هەتا ئاسنەکانی تێ فرێبدرێ و پاشان مسی تواوەی بەسەردا بکرێت، ئینجا باشترین بەربەست دروست دەبێ، بەردەوام کاریان تیا دەکرد تا تەواویان کرد،وەئەو کارەی بۆ کردن کە خەڵکەکە داوایان دەکرد.لە هەموو گرنگتر ئەوەبوو (ذوالقرنین) فەزڵی ئەم سەرکەوتنەی نەگێڕایەوە بۆخۆی بەڵکو فەرموی: ئەمە فەزڵ و بەرەکەتی پەروەردگارە (هذا رحمة من ربي) (الکهف ٩٨)

---

پێغەمبەری خوا ﷺ هانمان دەدا بۆ کردنی کاری چاکە ئەگەر کەمیش بێت.دەفەرموێ:(خۆشەویست ترین کار لای خوا ئەوەیە بەردەوام بێت ئەگەر کەمیش بێ) (البخاري).

# صاحِبُ الحَديقَةِ

حكَى النَّبيُّ ﷺ لأصحابِهِ أنَّ رَجلاً كانَ يَسيرُ فِي الصَّحراءِ، فسَمِعَ صَوتاً في سَحَابَةٍ يَقُولُ: اِسْقِ حَديقةَ فُلانٍ.

فاتَّجَهَتِ السَّحَابةُ إلَى تِلكَ الحَديقةِ، فأفْرَغَتْ ماءَهَا كُلَّهُ في مَجْرَى سَيلٍ، فتَتَبَّعَ الرَّجلُ الماءَ، فَإذا رَجلٌ يَعمَلُ فِي حَديقَتِه؛ يُحوِّلُ الماءَ، ويَسْقِي الزَّرْعَ، فسَأَلَهُ عنِ اسمِهِ.

قالَ: فُلانٌ (وهو نفسُ الاسمِ الذي سَمِعَهُ فِي السَّحَابةِ).

وسألَ صاحِبُ الحَديقَةِ الرَّجلَ عَنْ سَببِ سُؤالِهِ، فحكَى لَهُ ما حَدَثَ، فقالَ الرَّجلُ: فمَا تَصنَعُ فِيهَا؟

فَأخبَرَهُ صاحِبُ الحَديقةِ أنَّهُ يَتَصدَّقُ بِثُلُثِ ثمارِهَا، ويَأكُلُ هُوَ وعِيالُهُ ثُلُثاً، ويُنْفِقُ علَى الحَديقةِ ويَعْتَنِي بِهَا بالثُّلُثِ البَاقِي. [مسلم].

---

قالَ الشَّاعرُ:

بقَدْرِ الكَدِّ تُكتَسَبُ المَعَالِي ... ومَنْ طلَبَ العُلاَ سَهِرَ اللَّيالِي

ومَنْ طلَبَ العُلاَ في غَيرِ كَدٍّ ... أضَاعَ العُمْرَ فِي طَلَبِ المُحَالِ

# خاوەنی باخچەکە

پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر هاتێک دەگێرێتەوە بۆ هاوەڵان و دەفەرموێ (پیاوێک دەڕۆشت بە دەشتێکا گوێی لەدەنگێک بوو بە پەلە هەورێکی دەوت! بڕۆ لە فلان باخ بباریێ وە ئەو باخە ئاو بدە!!.هەورەکە ڕۆشت بەرەو ئەو باخە، هەرچی ئاوێکی هەڵگرتبوو هەڵی ڕشت بەسەر باخەکەدا، ئاوەکە ڕێی کرد بە جۆگەیەکا ئەم پیاوە شوێن ئاوەکە کەوت، بینی وا پیاوێک خەریکی ئاودانە لە باخەکەدا پرسی ناوت چی یە؟. وتی:فلان-(ئەوناوە بوو کەبە هەورەکە وترا بچۆ لەسەر فلانە باخ هی فلان کەس بباریێ).خاوەن باخ پرسی: بۆچی دەپرسی لەناوم؟ کابرا بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، پاشان کابرا لە خاوەن باخی پرسی تۆ چ کارێک دەکەیت؟خاوەن باخ وتی:ئەم باخەم کردووە بە سێ بەش، بەشێکی دەکەمە خێر وە بەشێکی بۆ ماڵ و منالم سەرفی دەکەم، بەشەکەی تری بۆ باخەکەی سەرف دەکەمەوە)مسلم.

---

شاعیر دەڵێت:

بەگوێرەی کارکردنت دەست کەوتت دەبی

کەسی داوای بەرزی دەکا دەبێ شەوان بەئاگابێ

هەر کەس داوای شتێ دەکا بەبێ ماندوبون

تەمەنی بە زایە چووە لەشتێکی ئەستەمدا

# أجرُ العامِلِ

فِي قَدِيمِ الزَّمَانِ، استَأجَرَ رَجلٌ عُمَّالاً، لِيُعاوِنُوهُ.

وعندمَا انتَهَى العُمَّالُ مِنَ أداءِ عَمَلِهِم، أخَذُوا أُجُورَهم إلاَّ واحِداً؛ تَرَكَ أجْرَهُ وانصَرَفَ.

فاستَثْمَرَ صاحِبُ العمَلِ أجْرَ هَذَا العامِلِ حتَّى صارَ لَهُ قطِيعٌ مِنَ الغنَمِ والبَقرِ.

وبعدَ حينٍ، عادَ صاحِبُ الأجْرِ وطلَبَ أجْرَهُ، فأشارَ إليهِ الرَّجلُ أنْ يَأخُذَ القَطِيعَ كُلَّهُ، فظَنَّ الأجيرُ أنَّ الرَّجلَ يَسخَرُ منْهُ، فَحكَى لَهُ ما حَدَثَ، فَأخَذَ الأجيرُ كُلَّ ذلكَ وانصَرَفَ شاكِراً.

وبهَذَا العمَلِ الطَّيِّبِ، نَجَّى اللهُ الرَّجُلَ مِنَ الهَلاكِ؛ فقَدْ كانَ يَسيرُ معَ اثنَينِ مِنْ رِفاقِهِ، فدَخَلُوا غاراً للرَّاحةِ، فانحَدَرَتْ صَخرةٌ، فسَدَّتْ بابَ الغارِ، فدَعَا كُلٌّ مِنَ الرَّجُلَينِ بعَملٍ صالحٍ، ثُمَّ دَعا الرَّجلُ بعَمَلِهِ هَذَا، فأزَاحَ اللهُ الصَّخْرةَ، وخَرَجُوا مِنَ الغَارِ، بفَضْلِ أعمَالِهِمُ الصَّالِحَةِ. [البخاري].

---

يَجِبُ على المُسلِمِ إذا استَأجَرَ عُمَّالاً أنْ يُوَفِّيَهم اجُورَهم بَعْدَ الانتِهاءِ مِنْ أعمالِهِم مُباشَرةً؛ قالَ ﷺ: «أعطُوا الأجيرَ حَقَّهُ قبلَ أنْ يَجُفَّ عَرَقُهُ» [ابنُ ماجه].

# پاداشتی کرێکار

له دێرین زەمانـدا، کابرایـەکی دەوڵەمەنـد چـەند کریکـارێکی دەبـێ ئیشـیان پیدەکات و پارمەتیشیان دەدات. کاتێک ئیشەکە تەواو بوو کرێکارەکـان هـاتن بـۆ وەرگرتنی کرێکەیان واتە(هەقی کارەکەیان)بەڵام یەکێکیان وەری نەگرت تورە بوو رۆشت. کابرای خاوەنکار بە پارەی ئەم کرێکارە هەژارە چەند سەرێ مەڕو مانگـای کری. دوای چەند ساڵێ، کابرای کرێکـار هاتـەوەو داوای ئـەو پـارەی ئـەو سـاڵەی دەکرد، کابرای دەوڵەمەند وتـی: سـەیری ئـەو دۆڵـە بکـە ئەوانـە هـەمووی هـی تـۆن!!، کـابرای کرێکـار وتـی گاڵتـەم پـێ مەکـەو مافەکـەم بـدەرێ، کـابرای دەوڵەمەند: بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، کرێکارەکە مـەڕوماڵاتی پـێش خۆیـدا و سوپاسی کابرای کرد!

بەهۆی ئەم کارە باشەوە، خوای گەورە ئەم پیاوە دەوڵەمەندەی رزگار کـرد لـە کاتێکا لەگەڵ دوو هاوەڵەکەیا لە ئەشکەوتەکەدا گیریان خوارد، لە کاتێکـا بـەردێکی گەورە بەردەمی دەرگای ئەشکەوتەکەی گرتبوو، هەر یەک لەم سـێ پیـاوە چـووە سوچێکەوە دەستیان کردە دوعاو نزاکردن بەکردەوەیەکی چاکی خۆیان، ئەم پیاوە بـەم کـارەی داوای لـە خـوا کـرد، وە خـوای گـەورە بەتـەواوی بەردەکـەی لاداو ئـەوانیش هاتنـە دەرەوە لـە ئەشـکەوتەکە بـە فـەزڵی کـردەوە باشـەکانیان) (البخاری).

---

پێویستە لەسەر موسوڵمان هەق وپاداشـتی کرێکـار بداتـەوە دوای تـەواوبوونی ئـیش و کارەکـە، وە هـیچ دوای خـات. پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ:(هـەقی ئـەو کەسەبدە کەبە کرێت گرتووە پێش ئەوەی ئارەقەی وشک بێتەوە) (ابن ماجە)

# قِصصُ آدابِ العَملِ

العَملُ الصَّالحُ والكَسْبُ الطَّيِّبُ عِبادَةٌ يُجازِي اللهُ عزَّ وجلَّ عليهَا بالأجرِ الكبيرِ والثَّوابِ الجَزيلِ.

وقدْ أمَـرَ اللهُ ـ سـبحانَه ـ المُؤمنينَ بالسَّعْيِ فِي الأرضِ وتَعميرِ الكَونِ بجَهْدِهم الطَّيِّبِ، وإنجـازاتِهم الكثيرةِ؛ قالَ تعـالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ﴾ [الملك: ١٥].

والمُسلمُ حينمَا يَستَجيبُ لِنداءِ اللهِ، فيَعمَلُ ويكسَبُ خيراً بيَدَيْـه، فإنَّهُ يَشعُرُ بلَذَّةِ الطَّاعةِ وثوابِ العبادةِ، كمَا يُحقِّقُ لِنَفْسِـهِ ولأهْلِـهِ سَـعَةً ورِزقاً رَغَداً.

لكنَّ الإنسانَ إذا ركَنَ إلى الكسَـلِ والخُمـولِ، فإنَّـهُ لَـنْ يُحصِّـلَ كَسْباً، ولَنْ يَجْنِيَ ثمَرةً، إنَّما عليه أنْ يَصبِرَ علَى كَـدِّ العمَـلِ، ومَشَـقَّةِ السَّعْيِ؛ حتَّى يَبلُغَ غايَتَهُ، وإذا كانَ الإنسانُ يَشعُرُ بالتَّعبِ والإعياءِ مِـنْ عَنَاءِ العمَلِ، فإنَّ النَّجاحَ الَّذِي يُكَلِّلُ هَذَا السَّعْيَ يُهوِّنُ كُلَّ مشقَّةٍ.

وللعمَلِ آدابٌ كثيرةٌ، مِنْهَا: اختِيارُ المِهْنَةِ الطَّيِّبَةِ، وإتْقانُ العمَلِ، وأداؤُهُ علَى أكملِ وَجهٍ، وإعانَةُ الأجيرِ والخادِمِ، وإعطاؤُهمَا حقَّهُمَا، وغيرُ ذلكَ.

*****

# چیرۆکی ئادابی ئیشکردن

کاری باش و بازرگانی پاک بەندایەتیە خوایگەورە بەباشترین شێوە ئەجرو پاداشتت دەداتەوە لەسەری.

خوای گەورە فەرمان ئەدات بەسەر موسوڵماناندا کە هەوڵ و کۆشش بکەن و سەرزەوی ئاوەدان بکەنەوە بەهەوڵ و کۆششی چاک وپاک، وە بەدەست هێنانی بەروبومی چاک.خودا دەفەرموێ: (هەر ئەو زاتەی کە -اللە- یە زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون، هەرچیتان بوێت لەسەری دروست دەکەن، چۆنتان بوێت بەکاری دەهێنن، بگەڕێن بەهەموو گۆشەو کەناریدا لەو ڕزق و ڕۆزیەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات، دڵنیاش بن کە سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای خوایە.

-تاکی موسوڵمان کاتێ گوێی لەم بانگەوازە دەبێ، ئازا دەڕوا بەدەم بانگەوازەکەوەو دەست دەداتە کارکردن، وە هەست بەلەزەت و خۆشی دەکا وەک چۆن بەندایەتی بۆ خوا ئەنجام دەدات، چونکە هەوڵەکەی دروستە لە پێناو ژیانێکی خۆش و سەربەرزانە بۆ خۆی و ماڵ و منالی فەراهەم بکات،

-بەڵام کاتێک مرۆڤ پاڵ دەداتەوەو هیچ کارێک ناکات توشی تەمبەڵی و کەنارگیری دەبێ، وەبەم بێ کارییە هیچی دەست ناکەوی وەهیچ بەروبومێکی نی یە،بۆیە پێویستە خۆڕاگر بین لەسەر کردنی ئیش وکار وە نارەحەتی نان پەیداکردن، هەتا بەئاوات و ئامانجمان دەگەین.

-کاتێک مرۆڤ خەریکی کارە توشی ئازار و نارەحەتی زۆر دەبێ، وەئەگەر بتەوێ سەر بکەوی بەسەر کۆسپەکانی ژیاندا دەبێ خۆڕاگربی.

کارکردن کۆمەڵێ ئادابی خۆی هەیە: هەڵبژاردنی کار و پیشەیەکی پاک وچاک و حەڵاڵ، بەردەوامی لەسەر ئیشێ تا بەرهەم بەدەست دێنی، جێبەجێکردنی ئەو کارە بە جوانترین شێوە. یارمەتیدانی کرێکارو خزمەتکار بدەی. هەقی خۆیان بدەیتێ وەچەندەها ئادابی تر....

# أعرابيٌّ في المَسجدِ

ذاتَ يَومٍ، كانَ ﷺ جَالساً مع أصحابِهِ في المَسجِدِ، فجَاءَ أعرَابيٌّ، وَوقفَ يبُولُ.

ولمَّا رَأى الصَّحابةُ هذَا المَنظرَ، أسرعُوا إليهِ ليَمنَعُوهُ، فَأشَارَ إليهِمْ النَّبيُّ ﷺ وقَالَ لَهُمْ: «دَعُوهُ، حتى يُتِمَّ بَولَهُ».

ترَكَ الصَّحابةُ الرَّجُلَ حتَّى قَضَى حاجَتَهُ، ثُمَّ نَاداهُ النَّبيُّ ﷺ.

فلَمَّا وَقَفَ الرَّجُلُ أمامَ النَّبيِّ، قَالَ ﷺ لَهُ: «إنَّ هذِهِ المَساجِدَ لا تَصلُحُ لِشيءٍ مِنْ هذَا البَولِ ولا القَذَرِ، إنَّما هِيَ لِذِكْرِ اللهِ عزَّ وجلَّ وَالصَّلاةِ، وقِراءَةِ القُرآنِ».

ثمَّ التفَتَ رسُولُ اللهِ ﷺ إلى أصحابِهِ، وقَالَ لَهُمْ: «أريقُوا علَى بَولِهِ سِجْلاً مِنْ مَاءٍ أَو ذَنُوباً (دَلواً) مِنْ مَاءٍ، فإنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرينَ، ولَم تُبعثُوا مُعَسِّرينَ»[متفق عليه].

---

الأنبياءُ وَالمُرسَلُونَ يَنصَحُونَ النَّاسَ جميعاً بِهدايتِهِمْ إلى طَريقِ الحَقِّ، وكذلكَ المُؤمِنُونَ يَنصَحُونَ بَعضَهُمْ لأنَّهُمْ إخوةٌ.

# دەشتەکیەك لە مزگەوتدا

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ دانیشتبوو لەگەڵ هاوەڵان لەناو مزگەوتدا، کابرایەکی دەشتەکی هاتوو لە سوچێکی مزگەوتدا دەستی کرد بە میزکردن. کاتێك هاوەڵان ئەم دیمەنە ناشیرینە نەخوازراوەیان بینی لە مزگەوتدا، بەپەلە ڕۆشتن بۆی تا ڕێگری لێبکەن، پێغەمبەر ﷺ(بانگی لێکردن و فەرموی: وازی لێبهێنن با میزەکەی تەواو بکات) هاوەڵان وازیان لێهێنا تا پیاوە میزەکەی تەواو کرد پاشان پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن، کابرا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ئەمە مزگەوتە دەست نادا بۆ ئەم کارانە (واتە شوێنی میز کردن نیە، بەڵکو ئەم مزگەوتە شوێنی یادی خوای گەورەو نوێژکردن و قورئان خوێندنە)پاشان ڕوی کردە هاوەڵان و فەرموی (ئەو شوێنە پاك بکەنەوە ئاو بکەن بەشوێنی میزەکەدا وە پاشان فەرموی (ئێوە بۆ ئەوە ڕەوانە کراون ئاسانکاربن، بۆ ئەوە ڕەوانە نەکراون قورس کاربن) (متفق علیە).

---

پێغەمبەران کاریان ئامۆژگاریکردنی خەڵکی بووە، وە هەمیشە ویستویانە لە ڕێگای ئامۆژگارییەوە ڕێنمویی خەڵکی بکەن بۆ لای هەق وڕاستی، وە موسوڵمانانیش دەبێ هەندێکیان ئامۆژگاری هەندەکەی تر بکەن چونکە برای یەکن.

# الحَربُ وَالمَكِيدَةُ

عندمَا وصَلَ جيشُ المُسلِمينَ إلى بَدرٍ استعدَاداً لِقتَال كُفَّارِ قُرَيشٍ، نَظرَ الحبَابُ بنُ المُنذِرِ، فَوجَدَ أنَّ عُيونَ الماءِ قَريبَةٌ مِنَ المُشرِكينَ، فَسَأَلَ النَّبيَّ ﷺ: أهذَا مَنـزِلٌ (مكَانٌ) أنزلَكَهُ اللهُ، أمْ هُوَ الرَّأيُ والحربُ وَالمَكيدَةُ؟

فَقَـالَ لَـهُ رسُـولُ اللهِ ﷺ: «بَـلْ هُـوَ الـرَّأيُ والحَـربُ والمَكيدَةُ».

فَأشارَ عليهِ الحُبَابُ أنْ يَتَقدَّمَ بِالجيشِ لِيُسَيطِرَ المُسـلِمُونَ علَى المَاءِ فَلا يَشرَبُ منْهُ الكُفَّارُ.

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «لَقَدْ أشَرْتَ بِالرَّأيِ».

ثُمَّ أمَرَ النَّبيُّ ﷺ بِتَنفيذِ مَا أشارَ به الحُبَابُ، وَانتَقلَ جَـيشُ المُسلِمينَ إلى المَوقعِ الجَديدِ، فَكانَ هذَا مِنْ أسبابِ انتِصارِهِمْ في بَدرٍ. [ابن إسحاق].

---

تَقديمُ النُّصحِ مِنْ أسبابِ الفَلاَحِ قَالَ تَعالَى: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾

[آل عمران:١٠٤]

# فێڵ کردن لە جەنگدا

موسوڵمانان بە خۆئامادەکردنێکی باشەوە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی کافرانی قـوڕەیش گەشتنە بەدر، (حوباب کوڕی مونـذیر ﷺ) تەماشای کرد ئـاوێکی دۆزییـەوە کـە نزیک بوو لە کافرەکانەوە.پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا هەڵبـژاردنی ئـەم جێگەیـە بە فەرمانی خوایە یان بۆچونی جەنابتە و سیاسـەتی جەنگـە؟ پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموی: (بەڵکو هەڵبژاردنی ئەم شوێنە بـە بۆچـونی خۆمـە) حوبـاب: پێشـنیاری کرد کە سوپاکە بەرینە پێشترەوە تا دەست بگرین بەسەر کانیەکەدا وە نـاهێڵین کافران لەو ئاوە بخۆنەوە، پێغەمبەر فەرموی (بۆچونەکەت زۆر پەسەندە! پاشان پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دا بـەوەی حوبـاب چـی دەڵـێ بـە گـوێی بکـەن، سـوپای موسوڵمانانی گواستەوە بۆ شوێنێکی تازە، ئەوە بـووە هـۆی سـەرکەوتنی سـوپای موسوڵمانان لە جەنگی بەدردا)ابن اسحاق.

---

پێشکەشکردنی ئامۆژگاری یەکێکـە لـە هۆکارەکـانی سـەرکەوتن.خـوای گـەورە دەفەرموێت(پێویستە لە ئێوە ئومەتێک پێک بێت، یاخود با هـەمووتان ئومـەتێک بن کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بدەن بە هەموو کارێکی چاک و باش وە قەدەغەی هەموو کارێکی نادروست بکەن ئەوانـەی ئـەوە کاریانـە سـەرفرازو سەرکەوتوون)ال عمران ١٠٤

# رِفقٌ في النَّصيحَةِ

جاءَ معاويةُ بنُ الحَكَمِ السَّلَميُّ رضي الله عنه إلى المَدينةِ؛ لِيتَعلَّمَ آدابَ الإسلامِ، وَيلْتَقِيَ بِرَسولِ اللهِ ﷺ.

ولمَّا حَانَ وقتُ الصَّلاةِ، دخلَ المَسجدَ لِيُصلِّيَ، وَفي أثناءِ الصَّلاةِ، عَطَسَ رَجُلٌ، وقَالَ: الحمدُ للهِ. فَقالَ لهُ مُعاويةُ بصوتٍ عَالٍ: يَرْحَمُكَ اللهُ.

فلمَّا تَكلَّمَ مُعاويةُ في الصَّلاةِ، سَبَّحَ النَّاسُ لِيَسْكُتَ وَلاَ يَتَكلَّمَ في صلاَته. ولَمَّا انتَهت الصَّلاةُ، قَالَ النَّبيُّ ﷺ: «مَنِ المُتكلِّمُ»؟ فَقالَ النَّاسُ: هذَا الأَعرابيُّ.

فَناداهُ النَّبيُّ ﷺ، وقَالَ لَهُ: «إنَّما الصَّلاةُ لِقراءةِ القُرآنِ وذِكْرِ اللهِ عزَّ وجلَّ، فإذَ كُنتَ فِيهَا فَليكُنْ ذلكَ شَأنُكَ».

فَقالَ مُعاويةُ: مَا رأيتُ مُعَلِّماً قَطُّ أرفَقَ مِنْ رسُولِ اللهِ ﷺ. [أبو داود].

---

الرِّفقُ مِنْ آدابِ النَّصيحةِ، وَالنَّبيُّ ﷺ يقولُ: «مَا كَانَ الرِّفْقُ فِي شيءٍ إلاَّ زَانَهُ (زيَّنَهُ وجمَّلَهُ)، ومَا نُزِعَ الرِّفقُ مِنْ شيءٍ إلاَّ شانَهُ (قبَّحَهُ وعابَهُ)»[متفق عليه].

# نەرمی لە ئامۆژگاریدا

موعاویەی کوڕی حەکەمی سەلەمی ﷺ ڕۆشت بۆ مەدینە تا فێری ئادابەکانی دینی ئیسلام ببێ لە خزمەت پێغەمبەردا، کاتێک گەیشت بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کاتی نوێژ بوو، چووە مزگەوتەوە بۆ نوێژکردن لە ناو نوێژدا پیاوێک پژمی و وتی: سوپاس بۆ خوا.موعاویەش بە دەنگی بەرز وتی:خوا ڕەحمەت پێبکات.کاتێ موعاویە لە ناو نوێژدا قسەی کرد.نوێژ خوێنان (سبحان الله)یان کرد بۆ ئەوەی کە موعاویە تێبگات نابێ لە نوێژدا قسە بکرێ.کاتێک نوێژ تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ بوو قسەی کرد لە نوێژدا؟خەڵکەکە وتیان: ئەم پیاوە دەشتەکیە بوو.پێغەمبەرﷺ فەرمووی:لەناو نوێژدا قورئان دەخوێنرێ و یادی خوای گەورە دەکرێ، ئەگەر نوێژت کرد ئەبێ ئاوابێ)موعاویە وتی:(نەم دیوە هیچ کەسێک بە ئەندازەی پێغەمبەرﷺ مامۆستاو داناو نەرم بێ لە ئامۆژگاریدا). (ابو داود)

---

نەرمی لە ئادابی ئامۆژگارییە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:(هەرشتێ نەرم و نیانی تیا بەکار بێت ئەو شتە جوان دەبێ،وەهەرکارێ نەرم و نیانی لێدابڕێ ئەو کارە ناشیرین دەبێ) (متفق علیه).

# النَّاصِحُ وَالخَلِيفَةُ

ذاتَ يَومٍ، استَأذنَ رَجُلٌ في الدُّخولِ علَى الخَلِيفةِ العَبَّاسيِّ المَأمـونِ، فلَمَّا أذنَ لَهُ، دَخَـلَ إليهِ، وَحيَّـاهُ ثُمَّ أَخبرَهُ أنَّهُ لَمْ يَحْضُرْ إليهِ إلاَّ لِيَعِظَهُ وَيُخْبِرَهُ بِعُيوبِهِ، وَيَنْصَحَهُ، فَتَكلَّمَ بِشدَّةٍ وَبلَهجَةٍ حَادَّةٍ.

فَتَعجَّبَ المَأمونُ مِنَ الرَّجُلِ الَّذي لَمْ يُقدِّمْ لَهُ النَّصيحَةَ في رِفْقٍ ولِيْنٍ وَحِكْمَةٍ. فَقالَ لهُ: يَا رَجلُ!! ارفقْ، فَقَدْ بَعَثَ اللهُ مَنْ هُوَ خَيرٌ منْكَ إلى مَنْ هُوَ شَرٌ منِّي، وَأمرهُ بالرِّفقِ.

فَتَعجَّبَ الرَّجُلُ، وتَساءَلَ عَنِ الَّذي بَعثَهُ اللهُ نَاصِحاً، وَعنِ الشِّريرِ الَّذي أُرسِلَ إليهِ.

فلمَّا رَأى المَأمونُ علاَمَاتِ التَّعجُبِ وَالاندِهاشِ علَى وَجهِ الرَّجُلِ، قَالَ لهُ: بَعَثَ اللهُ مُوسَى وأَخَاهُ هارُونَ ـ عَليهمَا السَّلامُ ـ إلى فِرعَونَ، فقالَ لَهُمَا: ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ﴾[طه:٤٤].

---

كانَ ﷺ إذَا باعَ الشَّيءَ أو اشتَرَاهُ قَالَ: «أمَا إنَّ الَّذي أَخذنَا مِنكَ أَحَبُّ إلينَا ممَّا أعطينَاكَ، فَاختَرْ» [أبو داود].

# ئامۆژگاریکەرو خەلیفە

ڕۆژێکیان پیاوێک ڕۆشت بۆ لای خەلیفـەی عەبباسـی (مـەئمون)کاتێـک ڕێگایـان پیدا ڕۆشتە ژوورەوە، ووتی بۆ ئەوە هاتووم تـا ئامۆژگاریـت بکـەم و عەیبـەکانی خۆت پـێ بناسـێنم، کەوتـە ئامۆژگـاری بـە شـێوەیەکی زۆر تونـدو ڕەق قسـەی دەکرد.

-مەئمون زۆر بەلایەوە سەیر بوو ئەم پیاوە هیچ نەرم و نیـانی و دانـایی بـەکار نەهێنا لە ئامۆژگاریکردنەکەیدا مـەئمون وتـی:ئـەی پیـاو!!نـەرم و نیانبـە خـوای گەورە لە تۆ باشتری ڕەوانە کـردووە بـۆ لای کەسـێ لـەمن خـراپتر وە فـەرمانی پیداوە کە نەرم و نیان بێ،پیاوە بەلایەوە سەیر بوو، پرسی: ئـەو ئامۆژگاریکـەرە کێ بوو کە خوا ناردی بۆ ئەو کەسە خراپ و ستەمکارە کاتێک (مەئمون)نیشـانەی سەرسوڕمانی لە دەم و چاوی کابرادا بینی ووتی:خـوای گـەورە پێغەمبـەر موسـاو هارونی نارد بۆ لای فیرعەونی ستەمکار. پێی دەفەرمون: (هەردوکتان بە نەرمی و بە جوانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن بۆئەوەی یاداوەری وەربگرێت، یان ترسی سزای ئێمە لە دەرونیدا جێ بگرێت) (سورەی طە ٤٤).

---

پێغەمبەر ﷺ کاتێک شتێکی دەکڕی یان دەیفرۆشت، دەیفەرموو: (ئـەوەی کـە کە لێمان وەرگرتیـت مـن وەرگـرت خۆشەویسـت تـرە بەلاتـەوە لـەوەی لێمـان وەرگرتی، سەرپشک بە) (ابو داود).

# ذَكاءٌ في النَّصيحَةِ

فِي قديمِ الزَّمانِ، كانَ هناكَ أخوَانِ، ربَّاهُمَا أبوهُمَا الصَّالحُ علَى إحسانِ كلِّ شيءٍ يُؤدِّيانِه.

وكانَ الغُلامان يَتعلَّمَانِ كلَّ مَا يُفيدُهُمَا في حياتِهِمَا، وكانَا يُقْبِلانِ علَى دُروسِ العِلْمِ، حتَّى أصبَحَا على دِرايَةٍ بكثيرٍ مِنْ أُمورِ الدِّينِ وهُمَا في سِنٍ مُبكِّرَةٍ.

وذاتَ يومٍ، رَأَى الغُلامَانِ شَيخاً لا يُحْسِنُ الوُضُوءَ، فَفَكَّرَا كيفَ يُعلِّمانِهِ دُونَ أنْ يَجْعَلاهُ يَشعُرُ بالحَرَجِ.

فَذهبَا إليهِ وَأخبَرَاهُ أنَّ كِلَيهِمَا تَوضَّأَ وُضُوءاً أفضلَ مِنْ أخيهِ، وَأنَّهُمَا اختَلَفَا فِي أيِّهِمَا أحسَنُ وضُوءاً مِن الآخَرِ، وطلبَا مِنَ الشَّيْخِ أَنْ يَحكُمَ بينَهُمَا: أيُّهُمَا أصَحُّ وضُوءاً.

وَتوضَّأَ كلٌّ منْهُمَا، فلَمَّا انتَهيَا مِنَ الوُضُوءِ أمامَهُ، قَالَ لَهُمَا: لَقَدْ أصَبتُمَا، وأنَا الذِي أخطأتُ.

ثُمَّ شكَرَهُمَا وانصَرَفَ مَسروراً بِذَكاءِ الغُلامَيْنِ وَأدَبِهِمَا في نُصحِ الآخَرِينَ.

---

الذَّكاءُ مطلوبٌ في النَّصيحَةِ، والرَّسولُ ﷺ كانَ كَثيراً مَا يُعرِّضُ بالنَّصيحةِ، فيقولُ: «مَا بالُ أقوامٍ قَالُوا كذَا وكذَا» [مسلم].

# زیرەکی لە ئامۆژگاریدا

لە دێر زەماندا، دوو برا هەبوون دایـک و بـاوکێکی بـاش وچـاک و خواناسـیان هەبوو پەروەردەی ئەم دوو کوڕەیان کە هەر کارێک ئەکەن بـە جـوانی ئـەنجامی بدەن.

-ئەم دوو گەنجە کەوتنە خوێندنی زانستەکان، هەرچیەک بە سود بوو بۆ ژیـان وەریان گرت کەوتنە وەرگرتنی زانست هەتا تەواو شارەزا بوون لـە کـار و بـاری ئاین هەر لە سەرەتای تەمەنیانەوە، وە تەمەنیان بەخشی بـە زانسـت و زانیـاری، رۆژێکیان ئەم دوو برایە بینیان وا کابرایەکی بەتەمـەن دەسـتنوێژ دەشـوا، بـەلاَم زۆر دەســتنوێژەکەی ناتــەواوە،بیریان کــردەوە چــۆن ئــەم پیــاوە بەتەمەنــە ئاگادارکەینەوە بەبێ ئەوەی بێتاقەت و نارەحەتیش بێ.

-رۆیشتن بۆ لای و پێیان ووت: ئێمە دەستنوێژ دەشۆین تـۆیش سـەیرمان بکـە بزانە هی کاممان جوانترو باشترە، چونکە ئێمە ناکۆکیەکمان بـۆ دروسـت بـووە، وەداوات لێدەکەین تۆ ببە بە دادوەر لـە نێوانمانـداو بزانـە کێمـان زۆر بـەجوانی دەستنوێژ دەشوا؟

-دەستیانکرد بـە دەسـتنوێژ شـۆرین لەبـەر دەمیدا،کـە لێبونـەوە پیـاوە پـیرە وتی:ئێوە هەردوکتان زۆر بە جوانی و چاکی دەستنوێژتان شۆرد، بەلاَم من هەڵـەو کەموکوڕیم هەیە لە شۆردنی دەستنوێژدا.پاشان سوپاسی کردن و دڵخـۆش بـوو بەو زیرەکیەی ئەو دوو برایە وە ئەو ئەدەبە جوانەی بەکاریان هێنا لە ئامۆژگـاری کردندا (دەڵێن: ئەم دوو منداڵە(حسن و حسین) کچەزای پێغەمبەر بوون).

---

زیرەکـی پێویســتە لـە ئامۆژگـاری کردنـدا، پێغەمبـەرﷺ زۆرجـار ناراسـتەوخۆ ئامۆژگاری کردووە، دەیفەرموو ئەوە چییە هەندێ خەڵك وا و وا دەکەن) (مسلم)

# نَصيحةُ جَريرٍ

كانَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه جَالِساً مـعَ النَّـاسِ يَوماً، فَأَخرجَ رَجُلٌ رِيْحاً، فَقالَ عُمَرُ: عَزَمتُ علَى صاحبِ هذَا أنْ يَتَوضَّأَ.

وكانَ جَرِيرُ بنُ عبدِ اللهِ البَجَلِيُّ رضي الله عنه حاضِـراً، فَأَحَبَّ أَنْ يُنْقِذَ صَاحِبَ هذَا الرِّيحِ مِنَ الإحـراجِ، فَقـالَ: يَـا أميرَ المُؤمنِينَ، لَو تَعزِمُ عَلينَا جَميعاً أَنْ نَتَوضَّأَ.

فَأُعجِبَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ بالرَّأيِ الَّذِي أشارَ بهِ جَرِيرٌ، وقَالَ لَهُ: جَزَاكَ اللهُ خَيراً.

وأمَرَ عُمَرُ رضي الله عنه النَّـاسَ جَميعـاً أَنْ يتوَضَّـؤُوا، ونَجَا صاحِبُ الرِّيحِ بِفَضلِ نَصيحَةِ جَرِيرِ بنِ عبـدِ اللهِ. [ابـن عبد البر].

---

المُسلِمُ يَتَجنَّـبُ أَنْ يَنصـحَ أخَـاهُ أمـامَ الآخَـرينَ ـ إلاَّ إذَا دَعَـتِ الضَّرورَةُ ـ؛ لأنَّ النَّصِيحةَ أمامَ النَّاسِ فَضِيحَةٌ.

# ئامۆژگاری جەریر

ڕۆژێ پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ﷺدانیشتبوو لەگەڵ خەڵکیدا، یەکێ لە دانیشتووان بایەکی لێبووەوە،عومەر فەرموی: کێ بوو با بچێت دەستنوێژ شواتەوە،

-جەریر کوڕی عبدالله بەجەلی ﷺئامادە بوو لەو دانیشتنەدا پێیخۆش بوو ئەو کەسە لەو نارەحەتیە ڕزگار بکات.فەرموی:ئەی گەورەی بڕواداران ئەگەر بفەرموی هەمووومان دەستنوێژ تازە دەکەینەوە! پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ﷺزۆر سەرسام بوو بەم بۆچونە جوانەی جەریر. چونکە جورەیر مەبەستی ئەوە بوو کابرا نەشکێ لە ناو کۆمەڵدا، پێشەوا عومەر فەرموی:خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە،پاشان فەرمانی دا بەسەر ئامادەبوانا کە بچن دەستنوێژ تازە بکەنەوە، کابراش لە تەریق بوونەوە ڕزگاری بوو بە فەزڵی ئامۆژگاری جەریرﷺ)ابن عبدالبر.

---

مرۆڤی موسوڵمان دەبێ خۆی بپارێزێ لەوەی ئامۆژگاری براکەی بکات لە ناو خەڵکیدا، مەگەر زۆر ناچار بێت،لەبەر ئەوە ئامۆژگاریکردن لەناو خەڵکدا ئابڕوبردنی ئەو کەسەیە.

# نَصيحَةُ الحُدَيْبِيَّةِ

فِـي العـامِ السَّـادسِ مِـنَ الهِجـرةِ، خَـرَجَ الرَّسـولُ ﷺ وَأصحَابُهُ إلى مكَّـةَ لأَداءِ العُمْـرةِ، ولَكـنَّ المُشـركِيْنَ مَنعُـوهُمْ وعَقَدُوا مَعهُمْ صُلْحَ الحُدَيْبِيَّـةِ، وكـانَ مِـنْ شـرُوطِهِ أنْ يَرجِـعَ المُسلِمُونَ هذَا العامَ ويَعُودُوا في العامِ المُقبِلِ..

وبعدَ إتمامِ الصُّـلحِ، أمَـرَ الـنَّبيُّ ﷺ أصـحابَهُ أنْ يَحلُقُـوا رُؤوسَهُمْ ويَذبَحُوا إبِلَهُـمْ، ولَكـنَّهُمْ كـانُوا غَاضِـبينَ مِـنْ هـذَا الصُّلْحِ، فتأَخَّرُوا في تَنفيذِ أمرِ النَّبيِّ ﷺ، فَغَضِبَ ﷺ، ودَخَلَ علَى أُمِّ المُـؤمِنينَ أُمِّ سـلَمةَ، وقـالَ: «يـا أُمَّ سَـلَمةَ! مَـا شـأنُ النَّاسِ؟ أَمَرتُهُمْ فَلَمْ يَستَجِيبُوا».

فَأشارَتْ علَى النَّبيِّ ﷺ أَنْ يَقُومَ وَلا يُكَلِّمَ أحَداً، ويَذْبَحَ، ويَحْلِقَ رأسَـهُ أمـامَ النَّـاسِ. فلَمَّـا فَعَـلَ الـنَّبيُّ ﷺ ذلِـكَ، قـامَ الصَّحابةُ فَحَلَقُوا رؤُوسَهُمْ وذَبَحُوا إبِلَهُمْ. [البخاري].

---

إذَا استَشَارَ المُسلِمُ أحَدَ النَّاسِ، طَلَباً لِنَصيحته، فإنَّهُ يَجِبُ عليهِ اختيـارُ الإنسانِ الذَّكيِّ الفَطِنِ الَّذي يَجِدُ عندَهُ الإجابَةَ السَّديدةَ المُقنِعَةَ.

# ئامۆژگاری لە حودەیبییەدا

لەساڵی شەشی کۆچیدا، پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا کەوتنە ڕێ بەرەو مەککە بە مەبەستی عەمرە کردن، بەڵام موشریکەکان ڕێگرییان لێکردن و نەیان هێشت بچنە ناو مەککەوە، پاشان ڕێکەوتننامەیەکیان مۆر کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ یەکێ لەمەرجەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە ئەوەبوو کە موسوڵمانەکان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە، ساڵی ئایندە بێن بۆ عەمرە کردن.لە دوای ڕێکەوتن نامەکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵان کە سەریان بتاشن و وشترەکان سەر ببڕن،بەڵام هاوەڵان بەگوێیان نەکرد وە زۆر بێتاقەت بوون لەو ڕێکەوتنە لەگەڵ کافران.فەرمانەکەی پێغەمبەریان ﷺ پشتگوێ خست و جێبەجێیان نەکرد!! پێغەمبەر تووڕەیی دایگرت، چووە ژوورەوە بۆ خەیمەکەی کە دایکی ئیمانداران (ئوم سەلەمە)ی لێبوو،پێغەمبەر ﷺ فەرموی(ئەی دایکی سەلەمە!چی دەڵێی لەبارەی ئەو خەڵکەوە؟فەرمانم کردووە بەسەریاندا بەڵام فەرمانەکەم جێبەجێناکەن!.ئوم سەلەمە پێشنیارێکی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستە بچۆرە دەرەوە، حەیوانی خۆت سەربببڕە،وەلەبەر چاویانا سەری خۆت بتاشەو، هیچ قسەشیان لەگەڵ مەکە،

-کاتێک پێغەمبەر هەستاو ڕۆشت ئەم پێشنیارەی جێ بەجێ کرد خەڵکەکە بەدوای پێغەمبەرا ﷺ هەستان بە تاشینی سەریان و سەربڕینی وشترەکانیان)!!

---

-کاتێک موسوڵمان راوێژ بە کەسێک دەکات وە داوای ئامۆژگاری لێدەکات، پێویستە کەسێکی موسوڵمان وزیرەک و عاقڵ و تێگەیشتوو هەڵبژێرێ، تاسود لەوەڵام و پێشنیارەکەی وەر بگرێ.

# نَصِيحةُ غُلامٍ

عندَمَا تولَّى عُمَرُ بنُ عبدِ العَزيزِ الخلافةَ، جَاءَتِ الوُفُودُ لِتَهنئتِه، وجاءَ وَفْدُ الحِجازِ، يتقَدَّمُهُمْ غُلامٌ صغيرٌ، عُمرُهُ إحدَى عشرةَ سنةً.

فَقالَ عُمَرُ: لِيتكلَّمْ مَنْ هُوَ أَسَنُّ (أكبَرُ سِنّاً) مِنْكَ.

فَقالَ الغُلامُ: أصلَحَ اللهُ أميرَ المُؤمنينَ، إنَّما المَرءُ بقَلبِه ولِسانِه، فإذَا منَحَ اللهُ عَبداً لِساناً نَاطِقاً، وقَلباً حَافظاً، فقَد استَحقَّ الكلامَ، وعَرِفَ فَضْلَهُ مَنْ سَمِعَ خِطابَهُ، ولَو أنَّ الأمرَ ـ يَا أميرَ المؤمنينَ ـ بالسِّنِّ لكانَ فِي الأُمَّةِ مَن هُوَ أحَقُّ مِنْكَ بِالخِلافة.

فَقالَ: صَدقْتَ، قُلْ مَا بدَا لكَ.

فَهنَّأَهُ الغُلامُ بِكلامٍ رَقيقٍ، ونَصَحَهُ ووَعظَهُ.

فَأُعجِبَ عُمَرُ ـ رَحِمَهُ اللهُ ـ بِوَعْظِ الغُلامِ ونَصيحَتِهِ إعجاباً شَديداً.

---

تَقديمُ النَّصيحَةِ بمَا يَعودُ بالخيرِ على الآخَرينَ واجِبٌ على المُسلم. قالَ ﷺ: «لا يُؤمِنُ أحَدُكُمْ حتَّى يُحِبَّ لأخيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ» [متفق عليه].

# ئامۆژگاری منالێك

کاتێك عومەری کوڕی عبدالعزیز-بوو بەخەلیفە —نوێنەری هۆزەکان دەهاتن بۆ پیرۆزبایی کردن لە خەلیفە، وەفدی حیجاز هات، منالێکیان پێش خستبوو تەمەنی یانزە ساڵ بوو.عومەر فەرموی: با لە تۆ بەتەمەنتر قسە بکات! منالەکە وتی: خوای گەورە ئەمیرو گەورەی موسوڵمانان بپارێزێ گەورەیی بە دڵ و زوبانە،کاتێك خوای گەورە بەندەیەکی خۆی زوبان پاراو دەکا،وە دڵ و زوبانێکی پاکی دەداتێ،ئەوا شایستەی ئەوەیە قسە بکا،بزانە فەزڵ و گەورەیی لەوەدایە گوێ لە قسەو باسیان بگری، ئەی گەورەی موسوڵمانان ئەگەر گەورەیی بەتەمەن بوایە خەڵکی زۆر بەتەمەن هەبوو کە ببن بە خەلیفە،لە جێی تۆ! عومەر فەرموی: ڕاست دەکەی ئەوەی دەتەوێ بیڵێ، منالەکە پیرۆزبایی لە خەلیفە کرد بە وتەی جوان و ناسك وە ئامۆژگاری کرد بەنەرم و نیانی.پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز ﵁ زۆر سەرسام بوو بە وتەو ئامۆژگاری ئەم منالە.

---

پێشکەشکردنی ئامۆژگاری بەخێر پێویستە لە سەر موسوڵمانان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:(ئیمانتان تەواو نی یە هەتا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ برای موسوڵمانیش پێت خۆش بێت) (متفق علیه).

# الصَّلاةُ المُطمَئنَّةُ

دَخلَ رَجلٌ مِنَ الأعرابِ المَسجِدَ، وصَلَّى صَلاةً سَريعةً؛ فلَمْ يَطمَئِنَّ في الرُّكوعِ وَلا في السُّجُودِ، ورآهُ النَّبيُّ ﷺ فقالَ لهُ: «اذهَبْ فَصلِّ، فإنَّكَ لَمْ تُصَلِّ».

فَأعادَ الرَّجلُ صَلاتَهُ مرَّةً ثَانيةً، ثُمَّ جَاءَ إلى النَّبيِّ ﷺ، فَقالَ لَهُ: «اذهَبْ فَصلِّ، فإنَّكَ لَمْ تُصَلِّ».

وَتكرَّرَ مَا حدَثَ مرَّةً ثَالِثةً، وكَرَّرَ النَّبيُّ ﷺ مَا قَالَهُ، فَقالَ الأَعرابيُّ: يَا رسولَ اللهِ، وَاللهِ لا أُحسِنُ غيرَهَا.

فَعلَّمَهُ النَّبيُّ ﷺ كَيفيَّةَ الصَّلاةِ، وقَالَ لَهُ: «إذَا ركَعْتَ فَاطمَئِنَّ رَاكِعاً، وإذَا سجَدْتَ فَاطمَئِنَّ سَاجِداً، وَافعَلْ ذَلكَ فِي صَلاتِكَ كلِّهَا» [متفق عليه].

---

النُّصْحُ مِنْ أخلاقِ الإسلامِ. قَالَ ﷺ: «المُؤمِنُ مِرآةُ المُؤمنِ، والمُؤمنُ أخُو المُؤمنِ: يَكُفُّ عليهِ ضَيْعتَهُ، ويَحُوطُهُ مِنْ ورائِهِ (أي: يَحمِي لهُ أهلَهُ وَأملاكَهُ)» [أبو داود].

# نوێژێکی ئارام

رۆژێکیان پیاوێکی دەشتەکی خۆی کرد بە مزگەوتدا، نوێژی بە خێرایی کرد،هیچ ڕکوع و سجودەی تەواو نەبوو(واتە حەقی خۆی پێ نەدەدان) پیغەمبەرﷺ تەماشای کرد، پاشان فەرموی:(بڕۆ نوێژەکەت بکە،ئەوە نوێژ نەبوو تۆ کردت)کابرا ڕۆشت نوێژەکەی دوبارە کردەوە و ئینجا چووە خزمەت پیغەمبەرەوەﷺ دوبارە فەرموی:(بڕۆ نوێژەکەت بکە، ئەوە نوێژ نەبوو تۆ کردت!)کابرا ڕۆشت سێ هەم جار نوێژەکەی کردەوە،بەلأم پێغەمبەرﷺ هەر فەرموی!بڕۆ نوێژەکەت بکەرەوە. کابرا وتی:(ئەی پێغەمبەری خوا والله لەوە باشتر نازانم.فێرم بکە؟

-ئەوجا پێغەمبەرﷺ کابرای دانیشاندو فێری نوێژی کردو فەرموی:(ئەگەر چویتە ڕکوع ئەوەنە بمێنەوە تا جەستەت ئیسراحەت بکات،وە باقی نوێژ بە هەمان شێوە) (متفق علیه).

---

-ئامۆژگاری لە ڕەوشتی ئیسلامە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:(موسوڵمان ئاوێنەی موسوڵمانە، ئیماندار برای ئیماندارە، دەتپارێزێت، لە ناوت نابات،وە پارێزگاری لە ئەهل و ماڵت دەکات) (ابو داود).

# المَهْرُ الكَبيرُ

أرادَ أميرُ المُؤمنينَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه أنْ يُيَسِّرَ على الرَّاغبينَ في الزَّواجِ، فَأمَرَ أنْ لا يَزيدَ المَهْرُ على أربعمائة دِرهَمٍ.

وذاتَ يَومٍ، قَابَلَتْهُ امرَأةٌ مِنْ قُرَيشٍ وقَالَتْ لَهُ: يَا أميرَ المُؤمِنينَ، نَهَيْتَ النَّاسَ أنْ يَزِيدُوا فِي مَهرِ النِّساءِ على أربعِمائةِ دِرهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ.

قَالَتْ: أمَا سَمِعتَ مَا أنزَلَ اللهُ في القُرآنِ الكَريم؟! قَالَ: وَأيُّ ذَلك؟

فَقالَتْ: أمَا سمِعتَ قولَ اللهِ تَعالَى: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾ [النساء: ٢٠].

قَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ عَفْواً، كُلُّ النَّاسِ أفقَهُ مِنْ عُمَرَ.

ثُمَّ جَمَعَ عُمَرُ النَّاسَ، وقَالَ: أيُّهَا النَّاسُ إنِّي قَدْ نَهَيتُكُمْ أنْ تَزيدُوا في صَدَقَاتِ المُهُورِ على أربعِمائةِ درهَمٍ، فمَنْ شَاءَ أنْ يُعطِي مِنْ مالِهِ مَا أحَبَّ فَلْيَفعَلْ. [أبو يعلى].

---

لا بُدَّ أنْ يكُونَ النَّاصحُ أميناً في نُصْحه؛ لذلكَ فهُوَ يُجنِّبُ كُلَّ المصَالحِ والأَطماعِ الشَّخصيَّةِ عِندَ النُّصْحِ، وَيبتَغِي بِنُصْحِهِ وَجْهَ اللهِ تَعالَى.

# مارەیی زۆر

گەورەی موسوڵمانان-عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه هانی گەنجانی دەدا بۆ ژن هێنان، بۆ ئەم مەبەستە ویستی مارەیی ژنان کەم کاتەوە ئەندازەی دیاری بکات،بۆیە فەرموی:(نابێ مارەیی لە چوار سەد درهەم زیاتر بێ)ڕۆژێکیان ئافرەتێ لە قوڕەیش ڕۆشت وتی:ئەی گەورەی موسوڵمانان ڕێگریت کردوە لەوەی مارەیی ئافرەتان لە چوار سەد درهەم زیاتر بێ؟عومەر رضي الله عنه فەرموی:بەڵێ. ئافرەتەکە:بیستوتە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا چی دەفەرموێ؟!عومەر:خوا چی دەفەرموێ؟.ئافرەتەکە:ئەی ئەم ئایەتەت نەبیستووە ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾(النساء ٢٠).

عومەر فەرموی:خوایە لێم خۆش ببە، هەموو خەڵك لە عومەر شارەزاترن.حەزرەتی عومەر خەڵکی کۆکردەوە، فەرموی:(ئەی خەڵکینە من پێم ڕاگەیاندن کە نابێ مارەیی ئافرەتان لە چوار سەد درهەم زیاتر بێ، بەڵام ئێوە ئازادن بە کەیفی خۆتان چۆنتان پێ خۆشبوو ئاوا بکەن لە دیاریکردنی مارەیی دا)ابو يعلی.

---

پێویستە ئامۆژگاریکەر ئەمین بێت لە ئامۆژگارییەکانیدا،خۆی بەدوور بگرێ لە بەرژەوەندی شتی تایبەتی خۆی لە کاتی ئامۆژگاریدا، بەڵکو تەنها مەبەستی ڕازی بوونی پەروەردگار بێت).

# النَّصِيحَةُ المُرَّةُ

دخَلَ أحَدُ العُلَماءِ؛ لِيَنصَحَ أمير المُؤمنينَ سُليمانَ بنَ عبدِ المَلك، فَقالَ لَهُ سُلَيمانُ: تَكَلَّمْ. فَقالَ: إنِّي سَأُكلِّمُكَ كَلاماً شَديداً، وَأنصحُكَ نَصيحةً مُرَّةً، فَاحتَملْهَا، فإنَّ وراءَهَا مَا تُحبُّ إنْ قبلتَهَا. فقالَ سُلَيمانُ: تَكلَّمْ، فَإنَّا نَجُودُ بسعَةِ الاحتمالِ على مَنْ يَنصَحُنَا. فوَعَظَهُ موعظَةً شَديدةً، قَالَ فِيهَا: يَا أميرَ المؤمِنينَ!! أحاطَ بكَ رِجالٌ اشتَرَوا دُنْياهُمْ بدِينِهِمْ، ورِضَاكَ بسَخَطِ رَبِّهِمْ، فَخافُوكَ ولَمْ يخَافُوا اللهَ، فَضَيَّعُوا الأمانةَ، وَأساؤُوا إلى النَّاسِ، وَأنتَ مَسؤُولٌ عَنْ أفعَالِهِمْ، ولَيسُوا مَسؤُولِينَ عمَّا تَفعَلُ، فَأْمُرْهُمْ أنْ يَنتَهُوا عَنْ ظُلْمِ النَّاسِ.

فَقالَ لَهُ سُلَيمانُ: إنَّكَ سَلَلْتَ لِسانَكَ، وهُوَ أقطَعُ مِنْ سَيفِكَ. فَقالَ: أجَل، ولَكِنْ ذَلِكَ لِنُصْحِكَ.

---

المُسلِمُ حينَمَا يُقَدِّمُ النَّصِيحةَ فإنَّهُ يُقَدِّمُهَا على أحسَنِ حَالٍ، ولَكنَّهُ يَتقبَّلُهَا على أيَّةِ حَالٍ، سَواءً كانَتْ برِفْقٍ أو بِقَسوَةٍ.

# ئامۆژگارییەکی تاڵ

یـەکێ لـە زانایـان، ڕۆشـت بـۆ لای پێشـەوای موسـوڵمانان(سـولەیمان کـوڕی عبدالملك)تا ئامۆژگاری بکات،سـولەیمان وتـی:قسـە بکـە، زاناکـە وتـی:مـن بـە شێوەیەکی توند قسەت لەگەڵ دەکـەم، وە ئامۆژگاریـت دەکـەم بـە ئامۆژگـاری تاڵ.وەری بگرە چـونکە قـازانجی تیایـە، سـولەیمان وتـی:قسـە بکـە، تەحـەمولی ئامۆژگارییەکـەت دەکـەم، ئێمـە نـەرم و نیـان دەبـین و سـینەمان فراوانـە بـۆ ئامۆژگاریکار، ئامۆژگـاری دەسـتی پـێ کـرد زۆر بەتونـدی وتـی. ئـەی گـەورەی ئیمانداران!پیاوانێك بە دەورتەوەن کە دونیا دەکڕن بە دینیـان، ئەوەنـدەی ڕازی بوونی تۆیان مەبەستە ئەوەندە ڕازی بـوونی خوایـان مەبەسـت نـی یـە، لـە تـۆ دەترسن و لە خوا ناترسن،ئەمانەت دەفەوتێنن، وەئەزیەتی خەڵکی دەدەن، وە تۆ بەرپرسی لە بەرامبەر ئەم کارانە ئەی گەورەی موسوڵمانان بەراستی بەرپرسیاری ئاوا ناچێ بەڕێوە!،وە فەرمان بدە دەست هـەڵگرن لـە ناحـەقی و ئەزیـەت دانـی خەڵکی!.سولەیمان وتی:زوبانت ئەزیەتی دام، خراپتر لە شمشێر کە شت دەبـڕێ کابرا وتی: بەڵێ وایە، بەڵام دڵسۆزی تۆم.

---

موسوڵمان کاتێ دەیەوێ ئامۆژگاری بکات دەبـێ حسـاب بـۆ حـاڵی ئـەو کەسـە بکات، ئاخۆ.دەتوانێ گوێ بگرێ.بە لام ئەگەر ئامۆژگاری کرا دەبێت قبوڵی بکات، جا توند بێت یان نەرم و نیان.

# قَارُونُ والنَّصِيحةُ

كانَ قَارُونُ رجلاً مِنْ قَومِ مُوسى عليه السلام، أنعَمَ اللهُ علَيهِ بالمالِ الكثيرِ، لكنَّهُ لَمْ يَشكُرِ اللهَ، وبدأَ يَفتُنُ النَّاس.

ولَمَّا رأى المُؤمِنُونَ مِنْ قَومِ مُوسى افتِتانَ النَّاسِ بِقَارُونَ وعَدمَ شُكْرِهِ لِنعَمِ اللهِ، قَرَّرُوا أنْ يَنصَحُوهُ، فَذهَبُوا إليهِ، وقَالُوا لَهُ: ﴿لَا تَفْرَحْۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ۝٧٦ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَاۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ [القصص: ٧٧].

ولَكنَّ قَارُونَ لَمْ يَستَمِعْ إلى نَصيحةِ المُؤمِنينَ، وأنكَرَ نِعَمَ اللهِ عَليهِ، وقَالَ: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ﴾ [القصص: ٧٨].

وَطالَ عَنَادُ قَارُونَ، وافتُتِنَ بهِ بعضُ النَّاسِ. فَخَسَفَ اللهُ بِهِ وبِدَارِهِ الأرضَ، عِقاباً لَهُ على عدَمِ شُكْرِهِ لِنعَمِ اللهِ عزَّ وجلَّ، وَعدَمِ استِماعهِ لِنَصِيحةِ المُؤمِنينَ.

---

عَلى الإنسانِ أنْ يَستمعَ إلى ناصحِهِ جيِّداً حتَّى ينتَهِيَ مِنْ كلامِهِ، ثمَّ يَشكُرَهُ على هذَا الاهتِمامِ، وبعدَ ذلكَ إنْ شاءَ أنْ يَعملَ بهَا عَمِلَ، وإنْ شاءَ تَرَكَ.

# قارون و ئامۆژگاری

قارون کابرایەک بوو لەهۆزەکەی موسا پێغەمبەر (علیه السلام) خوای گەورە نیعمەتی زۆری ڕشتبوو بە سەریا ماڵێکی زۆری دابویە، بەلاَم ئەم پیاوە بە هیچ شیوەیەک سوپاسی خوای نەدەکرد بەڵکو ببوە فیتنەو ئاشوب بۆ خەڵکانی تریش،

-کاتێک موسوڵمانان بینیان قارون بوەتە فیتنە بۆ خەڵکانی ترو وە هیچ سوپاسی خواش ناکا لەسەر ئەو نازو نیعمەتە، بڕیاریاندا بچن ئامۆژگاری بکەن.ڕۆشتن بۆ لای و پیان وت(کەشخە مەکەو لە خۆت بایی مەبە بەم سامانە، چونکە بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە کەشخە دەکەن بە سەروەت و سامانیانەوە و لە خۆیان بایی دەبن، هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیوی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕەو بەشی خۆیشت لە دنیادا بە حەلاَلی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەک خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەسادو گوناهو تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت تۆوی خراپە دەچێنن)(القصص ٧٦، ٧٧)بەلاَم قارون هیچ گوێی بە ئامۆژگاری ئیمانداران نەدا، وە ئینکاری نیعمەتەکانی خوای کردو وتی(بێگومان ئەم سامان و داراییەم هەر بە هۆی زانست و زانیاری و نەخشەی خۆمەوە پێم دراوە)(القصص ٧٨).

قارون بەردەوام بوو لە ئینکاری و فیتنەی بەردەوام بوو بۆ هەندێ لە خەڵکی، خوای گەورە تۆڵەی لێسەندو بردێ بە ناخی زەویدا خۆی و ماڵەکەشی، تۆڵەی ئەوەی لێسەند کە دانی نەدەنا بەو هەموو نازو نیعمەتەی پەروەردگاردا وە هیچ گوێی بە ئامۆژگاری ئیمانداران نەدا،

---

مرۆڤ پێویستە باش گوێ بگرێ بۆ ئەو کەسەی کە ئامۆژگاری دەکا هیچ قسەی پێ نەبڕێ، وە سوپاسی بکات لەسەر ئەو گرنگیدانەی کە ئەم پێی دمدا، دوای گوێگرتن ئازادی بە گوێی ئامۆژگارییەکەی دەکەی یان بە گوێی ناکەی.

# نَصِيحةٌ في العِلْمِ

ذهبَ يُونسُ النَّحْويُّ إلى أُستاذِهِ الخَليلِ بنِ أحمدَ الفَرَاهِيديِّ، يَشكُو إليهِ صُعوبةَ عِلْمِ العَرُوضِ (وهُوَ عِلْمُ أوزانِ الشِّعرِ).

وفكَّرَ الخَليلُ قليلاً، وعَلِمَ أنَّ مُيولَ تلميذِهِ لا تتَّفقُ معَ عِلْمِ العَرُوضِ، فَأرادَ أنْ يَنْصحَهُ بتَركِ هذَا العِلْمِ، وَالاتِّجاهِ إلى دراسةِ عِلْمٍ آخَرَ.

وهَدَاهُ تَفكيرُهُ إلى أنْ يَسألَهُ سُؤالاً في العَرُوضِ، وهُو يَقصدُ منْهُ أنْ يُبلِّغَهُ نَصيحتَهُ، فَقالَ لَهُ: مَا وَزنُ هذَا البَيتِ مِنَ الشِّعرِ؟

إذَا لَمْ تَستَطِعْ شَيئاً فَدعْهُ ... وَجاوِزْهُ إلى مَا تَستَطِيعُ

فَأدركَ يُونسُ نَصيحةَ الأُستاذِ، وَتركَ عِلْمَ العَرُوضِ، ودَرَسَ عِلْمَ النَّحْوِ، حتَّى أصبحَ عَلَماً مِنْ أفضَلِ عُلَماءِ عِلْمِ النَّحْوِ.

---

قَدْ تكونُ النَّصِيحةُ مُؤلِمةً، لذلكَ يَجِبُ على النَّاصحِ أنْ يُقدِّمَهَا بِشكلٍ مُناسِبٍ، حتَّى يَتَقبَّلَهَا الإنسانُ بِصَدْرٍ رَحْبٍ وَطِيْبِ نَفسٍ.

# ئامۆژگاری لە زانست دا

یوسی شارەزا لە زانستی (نەحو) ڕۆشت بۆ لای مامۆستاکەی (خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی)تا سکاڵای خۆی بکات لەدەست زانستی (عروض)ئەم زانستە ـس لەوەزن و قافیەی هۆنراوە دەکا مامۆستا خلیل بیری کردەوە، کە قوتابیەکەی حەزی بە زانستی (عروض)نی یە ویستی لە ڕێگەی زانستێکی ترەوە ئامۆژگاری بکات بۆ وازهێنان لەم زانستی (عروض)ە وە هانی بدات بۆ وەرگرتنی زانستێکی تر،مامۆستا بە پرسیار کردن لە ڕێگەی هۆنراوەیەکەوە فەرموی عروض)لێرەدا چی یە؟بەم شێوەیە قوتابیەکەی حاڵی کرد کە بخوێنە بۆ بە دەست هێنانی زانستێکی تر.

ئەگەر توانای شتێکت نی یە وازی لیّ بێنە

بچۆ بۆ لای شتێکی تر کە ئارەزوت لیّ یە

یونسی قوتابی حاڵی بوو لە ئامۆژگاریيەکەی مامۆستای و وازی هێنا لە زانستی (عروض) دەستی کرد بە خوێندنی زانستی (النحو) واتە: زانستی ڕێزمانی عەرەبی، هەتا بەردەوام بوو تا بووە یەکیّ لە ئەستێرەکانی زانستی نەحو.

---

جاری وا هەیە ئامۆژگاری ئازاری هەیە بۆیە دەبێت ئامۆژگاری لە شوێنی خۆیدا بێت،وە ئامۆژگاریکەر زەمینە سازی بکات بۆ ئامۆژگاری کردن، هەتا بەرامبەر بە سنگێکی کراوەو نەفسێکی پاکەوە پێشوازی بکات لە ئامۆژگاریيەکە.

# نَصِيحةٌ عندَ القَبرِ

كانَ النَّبيُّ ﷺ يُكثِـرُ مِـنْ زيـارةِ القُبـورِ، ويـأمُرُ أصحابَهُ بزِيارتِهَا لأخذِ العِظَةِ والاعتِبارِ، وكانَ عِندَمَا يَمُـرُّ علـى القُبـورِ يَقولُ: «السَّلامُ عَليكُمْ أهلَ الدِّيارِ مِـنَ المُـؤمِنينَ والمُسـلِمينَ، وإنَّا إنْ شاءَ اللهُ بِكُـمْ لاحِقُـونَ، نَسـألُ اللهَ لنَـا ولَكُـمُ العافِيـةَ» [مسلم]. وكانَ إذَا زارَ قُبورَ أصحابِهِ دعَا لَهُمْ، وتَرَحَّمَ عَلـيهِمْ، واستَغفَرَ لَهُمْ.

وذاتَ يَومٍ، مَرَّ علَى القُبورِ، فَوجَدَ امـرأةً تَبْكِـي وتَصـيحُ عندَ قبرٍ، فَقالَ لهَـا: «اتَّقِـي اللهَ واصـبِرِي». وكانَـتِ المـرأةُ لا تَعرِفُ النَّبيَّ ﷺ، فَقالَتْ لَهُ: إلَيكَ عَنِّي (ابتعدْ عَنِّي) فَإنَّـكَ لَـمْ تُصبْ بِمُصِيبتِي. فَانصَرَفَ الـنَّبيُّ ﷺ وتركَهَـا، فَقِيـلَ لهَـا: إنَّـهُ النَّبيُّ ﷺ. فَأسـرَعَتِ المـرأةُ لِتَعتـذِرَ لِلـنَّبيِّ ﷺ، وقَالَـتْ: لَـمْ أعرِفْكَ. فَقالَ لهَا النَّبيُّ ﷺ: «إنَّما الصَّبرُ عِندَ الصَّدمَةِ الأُولَـى» [متفق عليه].

---

عَلى الإنسـانِ أنْ يَستَجِيبَ لِنُصـحِ الآخَـرِينَ إذَا وجَـدَهُ راجِحاً، وإنْ تَعارَضَ معَ رأيِهِ الشَّخْصِي.

# ئامۆژگاری لەسەر قەبران

پێغەمبەرﷺ زۆر دەچووە سەر قەبران وە فەرمانی دەکرد بە هاوەڵان کە بچنە سەر قەبران بۆ وەرگرتنی دەرس و ئامۆژگاری، وە کاتێک چونە سەر قەبران بڵێن(سلاوی خواتان لێ بێت ئەی دانیشتووانی ئەم گۆڕستانە لە ئیمانداران و موسوڵمانان بە پشتیوانی خوا ئێمەش دێین بۆ لاتان، خوای گەورە لە ئێمە ئێوەش خۆش بێت)مسلم.هەروەها کاتێک دەچووە سەر گۆڕی هاوەڵان دوعاو نزای بۆ دەکردن، وە بەزەیی دەهاتەوە پێیاندا، وداوای لێخۆشبونی بۆ دەکردن لە خوای گەورە.ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ ڕۆشت بەسەر گۆڕستانەکەدا، بینی ئافرەتێک دەگری و خۆی داوە بەسەر گۆڕەکەدا،پێغەمبەرﷺ فەرموی:(لەخوا بترسەو ئارام بگرە)ئافرەتەکە پێغەمبەری نەناسی و وتی:بڕۆ دورکەوە لێم ئەوەی بەسەر من هاتووە تۆ نەت دیوەو قەت بەسەرت نەهاتووە!پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت و وازی لێهێنا، هاوەڵان چوون بە ئافرەتەکەیان ووت:ئەوە پێغەمبەری خوا بوو چۆن ئاوا قسەت لەگەڵ کرد؟! ئافرەتەکە ڕۆشت بە شوێن پێغەمبەردا ﷺ داوای لێبوردنی لێکردو ووتی نەم ناسی بم بورە.پێغەمبەرﷺ فەرموی:(خۆڕاگری ئەوەیە مرۆڤی موسوڵمان لەبەرامبەر موصیبەتەکەیا ڕاوەستێ لە ساتی یەکەمدا) (متفق علیه).

---

لەسەر مرۆڤ پێویستە گوێ ڕابگرێ بۆ ئامۆژگاری ئەگەر کەسەکە شیاو بوو، هەرچەندە ئەو باس و خواسە بەئارەزوشت نەبێ و لەگەڵ بۆچونتدا ڕێک نەبێت

# قِصَصُ آدابِ النَّصِيحَةِ

قَالَ النَّبيُّ ﷺ: "الدِّينُ النَّصِيحةُ"، فَقالَ الصَّحابةُ رضي اللهُ عنهم: لِمَنْ يَا رسولَ اللهِ؟ قَالَ: «للهِ وَلِرَسولِهِ وَلأئِمَّةِ المُسلِمينَ وَعامَّتِهِمْ» [متفق عليه].

وآدابُ النَّصِيحة كثيرةٌ، منْهَا: أَنْ تَكُونَ بِرِفْقٍ ولِيْنٍ، وَألاَّ تَكُونَ على مَلأٍ مِنَ النَّاسِ إلاَّ إذَا كانَ الأَمرُ يَتطَلَّبُ ذلكَ؛ لأنَّهُ كمَا قِيلَ: النَّصِيحةُ على المَلأِ فَضِيحةٌ. وَلا بُدَّ أنْ تَكُونَ النَّصِيحةُ بِالمَعروفِ، فَالحَقُّ مُرٌّ، وعلى مَنْ يأمُرُ بهِ أنْ يَجْعَلَهُ حُلْواً بِحُسْنِ نَصِيحَتِهِ.

وَالنَّصِيحةُ هِي طريقُ الرُّسُلِ وَالأنبياءِ وَالمُصلِحِينَ في كلِّ زمانٍ ومكانٍ؛ فكُلُّ نَبيٍّ نصَحَ لِقَومِهِ، وَوَضَّحَ لَهُمْ الطَّرِيقَ المستقيمَ، واللهُ عزَّ وجلَّ جعَلَ النَّصِيحةَ هِي طريقُ المُصلِحِينَ بعدَ الأنبياء، فَقالَ تَعالَى: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٤].

فَبالنَّصِيحة تَعْلُو الأُمَّةُ، وَيَقِلُّ الفَسادُ، وَتَنتَشِرُ الأَخلاقُ الحميدةُ، وَتسُودُ أرجاءَ المُجتَمَعِ

* * * * *

# چیرۆکی ئادابی ئامۆژگاری

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:(ئاین دڵسۆزی و ئامۆژگارییە)هاوەڵان وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟فەرموی بۆ خوا، بۆ پێغەمبەری خوا، بۆ گەورەی موسوڵمانان، بۆ هەموو موسوڵمانێك بە گشتی) (متفق علیه).

ئادابی ئامۆژگاری زۆرە لەوانە:

١ بەشێوازی نەرم و نیانی.

٢ لە پێش چاوی خەڵکی ئامۆژگاری کەس مەکە، مەگەر زۆر پێویست بێ،لەبەر ئەوە وتراوە(ئامۆژگاری لە دیار چاوی خەڵکا شکاندنی ئەو کەسەیە نە ئامۆژگاری).

٣/دەبێ ئامۆژگاری بکەی بەچاکەو چاکەخوازی.

٤/ئامۆژگاری بە هەق، هەرچەندە هەق تاڵە،بەڵام دەکرێ وا ئامۆژگاری بکەی ئەو تاڵە شیرین بکەی بە جوان مامەڵە لەکاتی ئامۆژگاریدا.

ئامۆژگاری ڕێگەی پێغەمبەران و پیاو چاکان بووە لە هەمووکاتێکدا هەموو پێغەمبەرێ ئامۆژگاریکەری گەلەکەی بووە،و ڕێگای خوا ناسی و هەقی بۆ ڕون کردونەوە، خوای گەورە ئامۆژگاری کردووە بە ڕێگەی خواناسان لە دوای پێغەمبەران.وەك دەفەرموێ:(پێویستە لە ئێوە ئوممەتێك پێك بێت یاخود با هەموتان ئوممەتێك بن کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە،فەرمان بدەن بە هەمو کارێکی چاکە، وە قەدەغەی هەموو نادروستیەك بکەن،،ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.بەهۆی ئامۆژگاری بەردەوامەوە ئوممەتان بەرز دەبنەوە وە خراپەکاری کەم دەبێتەوە، وە ڕەوشتە جوانەکان بڵاو دەبنەوە وە کۆمەڵگا ئارام و خۆش بەخت دەبێ.

# ئادابی سڵاو کردن

نوسینی : مدحت منصور المظالي

وەرگێڕانی : م. ناصح محمد شارباژێری

# ثَوَابُ السَّلامِ

فِي يومٍ منَ الأيَّامِ.. كانَ النَّبيُّ ﷺ جالِساً مـعَ أصـحابِهِ ـ رضيَ اللهُ عنهم ـ ، فجاءَ رَجلٌ وقالَ: السَّلامُ علَيكم (ولَمْ يُكمِلِ التَّحيَّةَ) فَرَدَّ النَّبيُّ ﷺ ، فجَلَسَ الرَّجلُ، فقالَ ﷺ لأصحابِهِ: «عَشْرٌ» (أي أنَّ ثوابَ هذهِ التَّحيَّةِ عَشرُ حَسَنات).

ثُمَّ جاءَ رَجلٌ آخَرُ فسَلَّمَ قائلاً السَّلامُ علَيكُم ورَحمةُ اللهِ (ولَمْ يَقُلْ وبَركاتُه). فرَدَّ عليهِ النَّبيُّ ﷺ. ثُمَّ جلَسَ الرَّجلُ. فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «عِشْرونَ» (أي: عِشرونَ حسَنَةً).

ثُمَّ دخَلَ رجلٌ ثالثٌ فقالَ: السَّلامُ علَيكُم ورَحمةُ اللهِ وبَركاتُهُ (تحيَّةُ الإسلامِ كامِلةً). فرَدَّ عليهِ ﷺ، ثُمَّ قالَ: «ثلاثونَ». يَقصِدُ انَّهُ كَسَبَ ثلاثينَ حَسَنةً جزاءً لَه على إلقاءِ السَّلامِ. [أبو داود].

---

قالَ ﷺ «إذا انتَهى أحَدُكُم إلى المَجلسِ فلْيُسَلِّمْ، فإذَا أرادَ أنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ، فلَيسَتِ الأُولَى أحَقَّ مِنَ الثَّانيةِ» [أبو داود].

# پاداشتی سلاو کردن

رۆژێك لە رۆژان، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵان (رضي الله عنهم) دانیشتبو، پیاوێك هات ووتی(السلام علیکم) سلاو لەسەر ئێوە، سلاوەکەی تەواو نەکرد،

پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە، پیاوەکە دانیشت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو،"دە" واتە: پاداشتی سلاوی ئەو پیاوە دە چاکە بوو،

پاشان پیاوێکی تر هات وتی:(السلام علیکم ورحمةُ الله) بەڵام ووشەی (وبرکاتە) ـەووت پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی سلاوەکەی دایەوە، پاشان کابرا دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیست، واتە: بیست چاکە

پاشان سێ هەم کەس هات و ووتی: السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە سلاوێکی تەوای ئیسلام) پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی ئەویشی دایەوە، پاشان فەرمووی، سی، مەبەستی ئەوە بوو سی چاکە بۆ ئەو کەسە نوسراوە لەپاداشتی ئەو سلاوەیدا (ابو داود)

---

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: هەریەك لە ئێوە گەشتە کۆڕو دانیشتنێك با سلاو بکات، ئەگەر ویستیشی هەستێت با سلاو بکات، یەکەم شایستە ترو باشتر نیە لەدووەم) واتە هەردوکیان پاداشتیان هەیە (ابوداود)

# سَلامٌ فِي السُّوقِ

كانَ الصَّحابِيَّانِ الجَليلانِ عبدُ اللهِ بنُ عُمَرَ والطُّفَيلُ بنُ كَعبٍ ـ رضيَ اللهُ عنهما ـ صديقَينِ حَميمَينِ؛ يُحِبُّ كُلٌّ منْهُمَا الآخَرَ، وكانَ عبدُ اللهِ يَذهَبُ إلى الطُّفَيلِ، فيُرافقُهُ إلَى السُّوقِ. وكانَ الطُّفَيلُ يَتَعجَّبُ منْ ذلكَ التَّصَرُّفِ؛ لأنَّ عبدَ اللهِ يَذهبُ إلى السُّوقِ دُونَ أنْ يَبيعَ أو يَشتَرِي، ولاَ يَفعَلُ شيئاً سوَى إلقاءِ التَّحيَّةِ علَى كُلِّ مَنْ يُقابِلهُ مِنَ المُسلِمينَ؛ صَغيراً كانَ أو كَبيراً، فَقيراً أو غنيّاً.

وذاتَ يَومٍ طلَبَ عبدُ اللهِ منَ الطُّفَيلِ ـ كالعادَةِ ـ أنْ يَذهَبَ معَهُ إلى السُّوقِ، فحاوَلَ الطُّفَيلُ أنْ يُقنِعَهُ بأنَّهُ لا دَاعِيَ لذلِكَ، فقالَ عبدُ اللهِ للطُّفَيلِ: إنَّمَا نَغْدُو (نَذهَبُ) مِنْ أَجلِ السَّلامِ.. نُسَلِّمُ علَى مَنْ يَلقَانَا. [مالك].

---

قالَ ﷺ: «إنَّ المُؤمِنَ إذا لَقِيَ المُؤمِنَ فسَلَّمَ علَيه، وأخَذَ بيَدِه تَناثَرَتْ خطَايَاهُمَا كما يَتناثَرُ ورَقُ الشَّجَرِ» [الطبراني].

# سلاو لەبازاردا

(عبداللە کوڕی عومەر) و (طوفەیل کوڕی کەعب) (ڕەزای خوایان لێ بێت) کە دوو هاوەڵی ڕێزدار بوون، لەهەمان کاتدا دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی و دڵسۆزی یەکتر بوون، هەریەکێکیان ئەوی تری خۆش دەویست (عبداللە) دەڕۆیشت بۆ لای (طوفەیل) و پێکەوە بەرەو بازاڕ دەڕۆیشتن (طوفەیل) لەم کردەوەیە سەرسام بوو، چونکە (عبداللە) دەچوو بۆ بازاڕ بەبێ ئەوەی شتێ بفرۆشی یان بکڕێت، جگە لەسلاو کردن هیچی تری ئەنجام نەدەدا، بە هەر کەس بگەیشتایە لە موسڵمان سلاوی لێدەکرد جا بچووك یان گەورە، هەژار یان دەڵەمەند بوایە.

ڕۆژێك هەر وەك ڕۆژانی پێشتر، (عبداللە) (رضي الله عنه) داوای لە (طوفەیل) (رضي الله عنه) کرد لەگەڵیدا بڕوات بۆ بازاڕ (طوفەیل) ویستی قەناعەتی پێبکات کە پێویست ناکات، (عبداللە) پێ یفەرموو: ئێمە بۆیە دەچین بۆ بازاڕ لەپێناو سلاو کردن دا، هەرکەسێکمان پێگەیشت سلاوی لێدەکەین (مالك)

---

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: باوەڕدار کاتێك بەباوەڕدارێکی تر دەگات و سلاوی لێدەکات دەست لەناو دەستی یەکتر دەکەن(تەوقە) دەکەن گوناهەکانیان هەڵدەوەرێت وەك هەڵوەرینی گەلای درەخت (الطبراني)

# المُبادَرةُ بالسَّلامِ

كانَ هناكَ صحابِيٌّ اسمُه: الأَغَرُّ بنُ يَسَارٍ المُزَنِيُّ رضي الله عنه. وذاتَ يومٍ، أمَرَ النَّبيُّ ﷺ رَجُلاً مِنَ الأنصارِ أنْ يُعطِيَ الأَغَرَّ كميَّةً مِنَ التَّمرِ كانَتْ عندَهُ.

لكنَّ الأنصارِيَّ كانَ يُماطِلُ الأَغَرَّ فِي إعطائهِ التَّمرَ

فشَكَاهُ إلى رسولِ الله ﷺ ، فقالَ ﷺ: «اُغْدُ يا أبا بكرٍ، فَخُذْ لَهُ تَمْرَهُ». فاتَّفَقَ أبو بكرٍ الصِّدِّيقُ رضي الله عنه معَ الأَغَرِّ أنْ يُقابِلَهُ في المسجد بعدَ صلاةِ الصُّبْحِ، فخَرَجَا معاً.

وفِي الطَّريقِ، كانَ أبو بكرٍ كُلَّمَا رأى رَجُلاً مِنْ بعيدٍ سَلَّمَ عليهِ، ثُمَّ قالَ أبو بكرٍ للأَغَرِّ أمَا ترَى ما يُصِيبُ القَومُ عليكَ مِنَ الفَضلِ؟ لاَ يَسبِقُكَ إلى السَّلامِ أحَدٌ.

فكانَ الأَغَرُّ بعدَ ذلكَ يُسارِعُ إلى إلقاءِ السَّلامِ، ويَقولُ: فكُنَّا إذا طَلَعَ الرَّجلُ مِنْ بعيدٍ بادَرْناهُ بالسَّلامِ قبلَ أنْ يُسَلِّمَ علينَا. [الطبراني].

---

يَجِبُ علَى المُسلِمِ أنْ يَرُدَّ التَّحيَّةَ بأحسَنَ ما يكُونُ، قالَ تعالى: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ﴾ [النساء: ٨٦].

# دەست پێشخەری لەسلاودا

هاوەڵێک هەبوو ناوی (ئەغەرر کوڕی یساری موزنی) بوو ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ) بە پیاوێکی ئەنصاری فەرموو کە بڕێک خورما کەلای بوو، بیبات بۆ ئەغەڕ) بەڵام کابرای ئەنصاری پێدانی خورماکەی دوادەخست و نەیدایە، ئەویش شکاتی لای پێغەمبەر (ﷺ) کرد! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبو بەکر بڕوات خورماکەی بۆ لێ وەرگرێت،

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) لەگەڵ (ئەغەڕ) ڕێکەتن کەلەدوای نوێژی بەیانی یەکتر ببینن و پێکەوە دەرچن، لەڕێگەدا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) هەر کەسێکی ببینایە لەدوورەوە سلاوی لێدەکرد، پاشان ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بە (ئەغەڕ) ی فەرموو: نابینی خەڵک چەند چاکەیان لەسەر تۆ هەیە؟ کەس لەسلاودا پێشت ناکەویت

لەدوای ئەوە (ئەغەڕ) پەلەی دەکرد و دەست پێشخەری دەکرد لە سلاودا، دەیفەرموو: ئیتر هەر پیاوێکمان لەدورەوە ببینایە سلاومان لێدەکرد پێش ئەوەی ئەو سلاو بکات.(الطبرانی)

---

(پێویستە لەسەر موسڵمان کەوەڵامی سلاو بەجوانترین شیواز بداتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ئەگەر سلاوتان لێکرا، ئەوە جوانتر وەڵامی بدەنەوە یان هەروەک خۆی وەڵامی بدەنەوە﴾ النساء: ٨٦

# تحيَّةٌ ماكِرَةٌ

فِي أحَدِ الأيَّامِ.. جاءَتْ جماعةٌ مِنَ اليَهودِ إلى النَّبيِّ ﷺ؛ وكانتْ معَهُ زوجَتُه أمُّ المُؤمِنينَ عائشةَ ـ رضيَ اللهُ عنها ـ فقالُوا: السَّامُ (المَوتُ والهَلاكُ) عليكم. بدَلاً مِنْ: السَّلامُ علَيكُمْ.

فرَدَّ عليهِمُ الرَّسُولُ ﷺ: «وعلَيكُمْ». ولَمْ يَزِدْ علَى ذلكَ.

لكنَّ السَّيِّدةَ عائشةَ ـ رضيَ اللهُ عنها ـ غَضِبَتْ، وقالَت: بلْ عليكُم أنْتُمُ السَّامُ واللَّعنةُ.

فقالَ لَهَا النَّبيُّ ﷺ: «يا عائشةُ، إنَّ اللهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمرِ كُلِّهِ»، وطلَبَ منْهَا أنْ تَهْدَأَ، فقالَت: أَلَمْ تَسمَعْ ما قَالُوا؟! فقالَ لَهَا ﷺ: «وأنَا قلتُ: وعليكُمْ» (أي: رَدَدْتُ عليهم بمثلِ ما كَانَ فِي نيَّتِهِمْ) [مسلم].

---

السَّلامُ بِدايةُ الحُبِّ؛ قالَ ﷺ: «لا تَدخُلونَ الجنَّةَ حتَّى تُؤمِنُوا، ولاَ تُؤمِنُوا حتَّى تَحابُّوا، ألاَ أَدُلُّكُمْ علَى شيءٍ إذَا فعَلتُمُوهُ تحابَبْتُم؟ أَفْشُوا السَّلامَ بينكُمْ» [مسلم].

# سلاوێکی فێلاوی

ڕۆژێک، (گروپێک) کۆمەڵێکی جولەکە هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا خاتوو عائشە (رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەر و دایکی باوەڕداران لەخزمەتی پێغەمبەردابوو

جولەکەکان وتیان(السام عيلكم) لەجیاتی(السلام علیكم) (السام) واتە: مردن و تیاچون بۆ ئێوە!.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (وعليكم) لەسەر خۆتان بێت. ئیتر هیچی زیادەی نەفەرموو!!

بەڵام خاتو عائشە (رضي الله عنها) توڕە بوو وتی: (بل عليكم أنتم السّام واللعنة)

واتە: بەڵکو لەسەر ئێوە بێت تیاچون و مەرگ و نەفرین! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەی عائشە، بێگومان خوای گەورە نەرم و نیانی خۆش دەوێت لە هەموو کارو بارێکدا، وە داوای لێکرد ئارام بێتەوە، عائشە فەرموی: گوێت لێ نەبوو چیان وت؟!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: منیش وتم (وعليكم) واتە: بەهەمان نیەتی خۆیان وەڵامم دانەوە (رواه مسلم)

---

سلاو کردن سەرەتای خۆشەویستی یە

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: تا باوەر نەهێنن ناچنە بەهەشت، باوەڕیشتان تەواو نابێت تا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا فێری شتێکتان بکەم ئەگەر ئەنجامی بدەن، خۆشەویستی نێوانتان دروست دەبیت؟! سلاو بکەن لە یەکتر..(مسلم)

# تَحيَّةٌ فِي رِسالةٍ

أَرسَلَ اللهُ تعالَى محمَّداً ﷺ هِدايَةً ورَحمةً لِلعالَمينَ.

وبعدَ فتحِ مكَّـةَ، استَقرَّتْ شريعةُ الإسـلامِ فِـي مكَّـةَ والمدينـةِ، والـبلادِ المُجـاوِرَةِ، فـاهتَمَّ الـنَّبيُّ ﷺ بِـدَعوةِ المُلوكِ والرُّؤساءِ للإسلامِ، فبَعَثَ برسالةٍ إلى كِسْـرَى مَلِـكِ فارِسَ يقولُ فيها: «بسمِ اللهِ الـرَّحمنِ الـرَّحيمِ، مِـنْ محمَّـدٍ رسولِ اللهِ، ، إلى كِسرَى بنِ هُرْمُزَ مَلِكِ فارِسَ: سَلامٌ علَـى مَنِ اتَّبَعَ الهُدَى، وآمَنَ باللهِ ورَسُولِه، وشَـهِدَ ألاَّ إلـهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَـهُ، وأنَّ محمَّـداً عَبـدُهُ ورَسـولُه. أَدْعُـوكَ بِدُعاءِ اللهِ؛ فأَنَا رسولُ اللهِ إلى النَّاسِ كافَّةً؛ لأُنْذرَ مَـنْ كـانَ حيّاً، ويَحِقَّ القَولُ علَى الكافِرِينَ، فـإِنْ تُسْـلِمْ تَسْـلَمْ، وإِنْ أَبَيْتَ (رفَضْتَ) فإِنَّ إِثْـمَ المَجُـوسِ (الـذينَ يَعبُـدُونَ النَّـارَ) علَيكَ» [ابن إسحاق].

---

المُسلِمُ يُلْقِي التَّحيَّةَ علَى أهلِ الكتابِ مِنَ اليَهودِ والنَّصارَى بقولِـهِ: السَّلامُ علَى مَنِ اتَّبعَ الْهُدَى.

# سلاّو کردن لە نامەدا

خوای گەورە محمد (ﷺ) ی نارد هیدایەت و ڕێنمویی سۆز بۆ گشت جیهان.

لەدوای فەتحی مەککە شەریعەت و پەیامی ئیسلام لە مەککە و مەدینە جێگیر بوو، لەگەڵ وولاّتانی دراوسێ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) گرنگی دا بە بانگەوازی پاشاو سەرکردەکان بۆ ئیسلام، نامەیەکی نارد بۆ کیسرای پاشای فارسەکان تیایدا هاتبوو: بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، لە محمد پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بۆ کیسرای کوڕی هورمز، پاشای فارس: سلاّو لەهەر کەسێك شوێن ڕێنمویی ڕێگەی ڕاست دەکەوێت و باوەڕ بە خواو پێغەمبەرەکەی دەهێنێ و شایەتی دەدات کە هیچ خوایەك نییە جگە لە(اللّه)، تەنهایەو هاوەڵی نییە، وە شایەتی ئەدات کە (محمد) بەندەو پێغەمبەری خوایە، بەبانگەوازی خوا بانگت دەکەم، من پێغەمبەری خوام بۆ لای خەڵك بەگشتی، بۆ ئەوەی زیندووە هۆشداری بکەم و ئاگاداری بکەم، وەفەرمانی خواش بەسەر بێباوەڕاندا بدەم، ئەگەر موسڵمان بێت پارێزراو دەبیت، وە ئەگەر گوێڕایەڵ نەبێت و بەرپەرچم بدەیتەوە ئەوە گوناهو تاوانی هەموو ئاگر پەرستان لەسەر تۆیە (ابن اسحاق)

---

موسڵمان سلاّو لەخاوەن پەڕاوە ئاسمانیەکان (اهل الكتاب) دەکات لە جولەکەو گاورەکان و دەڵێت (سلاّو لەو کەسەی شوێن هیدایەت دەکەوێت).

# تَحيَّةٌ وصَلاةٌ

فِي أحَدِ الأيَّامِ كانَ بعضُ المُسلمينَ مُجتَمعِينَ فِي بيتِ الصَّحابِيِّ الجَليلِ سَعْدِ بنِ عُبَادَة رضي الله عنه، فحَضَرَ النَّبيُّ ﷺ إليهم ففَرِحُوا بِهِ.

فقالَ بَشيرُ بنُ سَعْد بنِ عُبادَة - رضيَ اللهُ عنهما - يا رسولَ اللهِ! أَمَرَنَا اللهُ أنْ نُصَلِّيَ عليكَ، فكيفَ نُصَلِّيْ عليكَ؟

فسكَتَ النَّبيُّ ﷺ بعضَ الوقتِ، حتَّى تمنَّى الجالِسُونَ لو أنَّ بَشيراً لَمْ يسأَلْهُ.

ثُمَّ قالَ ﷺ: «قُولُوا: اللَّهمَّ صلِّ علَى محمَّدٍ وعلَى آلِ محمَّدٍ كمَا صَلَّيتَ علَى آلِ إبْراهيمَ. وبارِكْ علَى محمَّدٍ وعلَى آلِ محمَّدٍ، كما باركْتَ علَى آلِ إبراهيمَ، إنَّكَ حَميدٌ مَجِيدٌ» (والصَّلاةُ هُنَا تعنِي: الدُّعاءَ بالخَيرِ) [مسلم].

---

الصَّلاةُ والسَّلامُ علَى النَّبيِّ ﷺ لهما فَضلٌ كبيرٌ؛ قالَ ﷺ: «ما مِنْ أحَدٍ يُسَلِّمُ عليَّ إلاَّ رَدَّ اللهُ عليَّ رُوحِي حتَّى أرُدَّ عليه السَّلامَ» [أبو داود].

# سلاوێك و نوێژێك

ڕۆژێك هەندێك لە موسڵمانان لە ماڵی هاوەڵی ڕێزدار (سەعدی کوڕی عوبادە) (ﷺ) کۆبونەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) هات و هەموو شادوو دڵخۆش بون،

(بەشیری کوڕی سەعد کوڕی عوبادە) (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە فەرمانمان پێکراوە سلاوات لەسەر تۆ بدەین، چۆن ئەو سلاواتە بدەین؟؟

پێغەمبەر (ﷺ) کەمێك بێدەنگ بوو، تاوای لێهات هەندێ لە دانیشتوان ئاواتیان خواست کە (بەشیر) ئەو پرسیارەی هەرنەکردایە! پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بڵێن: پەروەردگار، خوای گەورە، ڕەحمەتی خۆت بڕێژە بەسەر محمد و کەس و کارو ئالی محمد، هەروەك ڕەحمەتت ڕژاندووە بەسەر ئالی ئیبراهیم، وە بەرەکەت و فەڕو پیرۆزی ببارێنە بۆ سەر محمدو کەس و کاری و ئالی محمد هەروەك باراندوتە بەسەر ئالی ئیبراهیم دا، تۆ گەورەو سوپاسکراویت (مسلم).

---

سەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) زۆر گەورەیەو پاداشتی زۆرە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: هەرکەسێك سلاوم لێبکات خوای گەورە گیانم بۆ دەگێڕێتەوە تاوەلامی سلاوەکەی بدەمەوە (ابو داود).

# تَحيَّةٌ قبلَ الاستِئذان

كانَ النَّبيُّ ﷺ يَزورُ أحَدَ أصحابِهِ في مَنزِلِه ، فعَلِمَ بذلكَ رَجلٌ مِنْ قبيلةِ بَنِي عامرٍ ، فأرادَ الدُّخولَ ، ولَمَّا وقَفَ الرَّجلُ أمامَ بابِ المَنزِلِ قالَ : أأَلِجُ (هل أدخُلُ)؟

فقالَ النَّبيُّ ﷺ لخادمِه : «اخْرُجْ إلى هذَا فعَلِّمْه الاستِئذانَ ، فقُلْ لَهُ : قُلْ السَّلامُ عليكُم .. أأَدْخُلُ ؟».

فَسَمِعَ الرَّجلُ كلامَ الرَّسولِ ﷺ وتَوجِيهَهُ وهوَ واقفٌ بالخارجِ ، فقالَ قبلَ أنْ يَصِلَ الخادِمُ السَّلامُ علَيكُمْ .. أأدخُلُ ؟

فلَمَّا رأى النَّبيُّ ﷺ أنَّهُ قد أحسَنَ الاستئذانَ والدُّخولَ ، وبدأَ كلامَهُ بالسَّلامِ والأمانِ ، أذِنَ لَهُ ﷺ ، فدخَلَ الرَّجلُ وفَرِحَ برُؤيةِ النَّبيِّ ﷺ. [أبو داود].

---

على المُسلمِ أنْ يبدأَ كلامَهُ معَ أخيهِ بالسَّلامِ ، سَواءٌ قابَلَهُ في الطَّريقِ أمْ زارَهُ ، فذلكَ مِنْ أسبابِ دَوامِ الحُبِّ والمودَّة بينهمَا

# سلاو پێش مۆڵەت خواستن

پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی یەکێک لە هاوەڵانی کرد لەماڵەوە، پیاوێک لـە هـۆزی (بەنی عامر) بەمەی زانی، ویستی بڕواتە ژور، کاتێـک پیاوەکـە لەبـەر دەم مـاڵی هاوەڵەکەیدا وەستا ووتی: ئایا مۆڵەت هەیە بێمە ژور؟

پێغەمبەر (ﷺ) بەخزمەت کارەکەی فەرموو: بچۆ دەرەوە بـۆ لای ئـەو پیـاوە، فێری مۆڵەت خواستنی بکەو بڵـێ، بابڵێـت، سـلاوی خواتـان لێ بێـت، ئایـا بێمـە ژورەوە؟

کـابرا گـوێی لەفەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر (ﷺ) بـوو، پـێش ئـەوەی خزمـەت کارەکە بگاتە لای ووتی: سلاوی خواتان لێ بێت، ئایا بێمە ژورەوە؟ جـا پێغەمبـەر (ﷺ) بینی وا مۆڵەت خواستنەکەی تەواو بوو، وە قسەکانی بەسـلاو دەسـتپێکرد، مۆڵەتی داو پیاوەکـەش هاتـە ژورو بـەبینینی پێغەمبـەر (ﷺ) شـادمان بـوو(ابـو داود).

---

دەبێت موسڵمان دەستپێکردنی گفتو گۆی لەگەڵ براکەیـدا بەسـلاو بێـت، جـا لەڕێگە پێی بگات یان سەردانی ماڵیان بکـات، چـونکە ئـەوە هۆکـاری بـەردەوامی خۆشەویستی و بەزەییە لەنێوانیاندا.

# سلامٌ فِي الجنَّةِ

في الجنَّةِ صُورٌ كثيرةٌ مِنَ النِّعَمِ ، وسلامُ الله على عبادِهِ نِعمَةٌ كبيرةٌ وفَضلٌ منْهُ سُبحانَه .

يُحكَى أَنَّهُ عندما يَدخُلُ أهلُ الجنَّةِ الجنَّةَ ، يَسْطَعُ لَهُمْ نُورٌ ، فيَرفَعُونَ رؤُوسَهم يَنظرُونَ ، فإذا اللهُ عزَّ وجلَّ قد اطَّلَعَ عليهمُ مِنْ فوقِهِمْ ونظَرَ إليهِمْ ، فيَقولُ : السَّلامُ عليكمُ يا أهلَ الجنَّةِ

فيَنظُرُونَ إليه ويَنظُرُ إليهِم ، فلاَ يَلتَفتُونَ إلى شَيءٍ مِنْ نَعيمِ الجنَّةِ ما دَامُوا يَنظُرُونَ إليهِ عزَّ وجلَّ حتَّى يَحتَجِبَ عنْهُم ، فيَبقَى نُورُهُ عليهم فِي ديارِهم [ابن ماجه].

وفي ذلكَ يقولُ الحَقُّ ـ سبحانه ـ ﴿سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ [يس ٥٨].

---

السَّلامُ خيرٌ وبركةٌ وأمانٌ؛ فقَدْ سُئِلَ رسولُ اللهِ ﷺ: أيُّ الإسلامِ خيرٌ ؟ فقالَ ﷺ: «تُطعِمُ الطَّعامَ ، وتَقرأُ السَّلامَ علَى مَنْ عرَفْتَ ومَنْ لَمْ تَعرِفْ» [متفق عليه].

# سلاو لە بەهەشتدا

لەنێو بەهەشتدا نمونەی زۆر هەیە لـە نیعمـەت و بەخششـەکان، سـلاوی خـوا لەسەر بەندەکانی بەخششێکی گەورەیـە لەلایـەن خـوای گـەورەوە، دەگێڕنـەوە کاتێک خەڵکی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشت، نورو ڕۆشـناییەک پەیـدا دەبێـت، سەریان بەرز دەکەنەوەو دەڕوانن، خـوای گـەورە خـۆی نیشـانی بەهەشـتییەکان دەدات لەسـەریانەوە سـەیریان دەکـات، دەفـەرموێت: سـلاوتان لێ بێـت ئـەی خەڵکی بەهەشـت، خـوای گـەورە سـەیریان دەکـات و ئـەوانیش سـەیر دەکـەن ئاگایان لە هیچ نیعمەتێکی بەهەشت نامێنێ و ئاوڕی بۆ نادەنەوە، تـاخوای گـەورە دیار نامێنێ، بەلام نورو ڕۆشنایی لەدەم و چاو وشوێنەکانیان دەمێنی (ابن ماجە)

لـەم بارەیـەوە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ سـلاوێک کـە فەرمایشـتی پەروەردگارێکی بەبەزەییە﴾یس ٥٨

---

سلاو چاکەو فەڕو پیرۆزی و ئاسایشە، پرسیار کـرا لـە پێغەمبـەر (ﷺ) کـەکام ئیسلام چاکە؟ فەرمووی: خواردن بەخشین، سلاو کردن لە کەسـێک دەیناسـی وە ئەوەش کە نایناسیت (متفق علیە)

# التَّحيَّةُ الدَّائمةُ

السَّلامُ اسمٌ منْ أسماءِ الله تعالَى، جعَلَهُ اللهُ عُنواناً للمَودَّةَ والرَّحمة، وقَدْ رَضيَهُ اللهُ تحيَّةً لعبادهِ المؤْمنينَ، فحينمَا يَلتَقُونَ يَكُونُ أوَّلُ ما يُفَكِّرونَ فِيهِ هُوَ السَّلامُ.

ولَمَّا خَلَقَ اللهُ عزَّ وجلَّ آدَمَ عليه السلام قالَ لَـهُ: «اذْهَـبْ فسَلِّمْ علَى أُولئكَ فاستَمعْ ما يُحَيُّونكَ به؛ فإنَّهَا تَحِيَّتُكَ وتَحيَّـةُ ذُرِّيَّتِكَ (أبنائِكْ) مِنْ بَعدكَ».

فذهَبَ آدَمُ عليه السلام إلى عددٍ منَ الملائكةِ، وقالَ لَهم: «السَّلامُ علَيكُم».

فرَدَّتِ الملائكةُ عليه، فقالُوا: السَّلامُ عليكُم ورَحمـةُ اللهِ. فزادَتْهُ الملائكةُ: ورَحمةُ اللهِ. [البخارِي].

---

السَّلامُ تحيَّةُ المُسلمينَ فِي الدُّنيَا، وهـو تَحيَّتـهُم فِـي الآخـرةِ في جنَّـةِ الخُلْد؛ قالَ تعـالَى: ﴿دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَـٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَـٰمٌ﴾ [يونس: ١٠].

٨

# سلاوی بەردەوام

(السلام) ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای بالاّ دەست، کردویەتی بەناو نیشانی بەسۆزی ومیهرەبانی خۆی، ڕازییە بکرێتە سلاوی نێوان بەندە باوەڕدارەکان

بۆیە بەیەکتر دەگەن یەکەم شتێک بیری لیّ بکەنەوە (سلاوکردنە)، کاتێک خوای گەورە ئادەمی دروست کرد (علیە السلام) فەرموی: برۆ سلاو لەو کۆمەلە بکە، باگوێیان لەو شتە بێت کە تۆ سلاوی پیّ دەکەیت، چونکە ئەوە سلاوی تۆو سلاوی وەچەکانتە (واتە: نەوەکانت لەدوای خۆت) ئادم(علیە السلام) ڕۆشت بۆ لای کۆمەلێک فریشتە فەرموی: (السلام علیکم)

فریشتەکانیش وەلامیان دایەوە و وتیان: (السلام علیکم ورحمة اللّه) واتە: فریشتەکان(ورحمة اللّه) یان بۆزیاد کرد)(البخاری).

---

(السلام) سلاوی موسلمانە لە دونیا، وەسلاوی باوەڕدارانە لە قیامەت و لەبەهەشتی هەتا هەتایدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿داواو پاڕانەوە یان تەسبیحات و پاک ڕاگرتنی خوایە و سلاویشیان "السلام علیکم" کردنە﴾ یونس/١٠

# تحيَّةٌ وكَرَمٌ

ذهَبَ النَّبيُّ ﷺ لِيَزورَ سَعْدَ بنَ عُبَادةَ رضـي الله عنـه فِـي مَنزِلِه، فوقَفَ ﷺ أمـامَ بـابِ المـنزلِ وقـالَ: «السَّـلامُ علـيكُم ورحمةُ الله وبركاتُهُ». وكانَ سَعْدٌ وابنُهُ قَيْسٌ ـ رضي اللهُ عنـهُمَا ـ بالـدَّاخلِ، فـرَدَّ سَـعْدٌ بِصَـوتٍ غيرِ مَسْـموعٍ؛ فلَـمْ يَسْـمَعْهُ الرَّسولُ ﷺ، فقالَ قَيْسٌ لأَبيه: يا أَبِـي! ألاَ تـأْذَنُ لرَسـولِ الله؟ فقالَ سَعْدٌ: اتركْهُ يُكْثِرُ علينَا السَّلامَ. فَأعادَ الرَّسولُ ﷺ التَّحيَّـةَ مرَّةً ثانيةً، ثُمَّ مرَّةً ثالثةً، وسَعْدٌ يَرُدُّ بِصَـوتٍ مُـنخَفضٍ، فرَجِـعَ رسولُ الله ﷺ، فأسرَعَ سَعْدٌ ولَحِقَ بِهِ، وقالَ: يـا رسـولَ الله، كنتُ أسمَعُ تَسليمَكَ وأرُدُّ عَلَيهِ رَدًّا خفيفاً لِتُكثِرَ علينَـا السَّـلامَ. فعادَ معَهُ النَّبيُّ ﷺ إلى المنزلِ، فاستَضافَهُ سَعْدٌ رضـي الله عنـه وأكرَمَهُ، فدَعَا لهُ النَّبيُّ ﷺ بالبَرَكةِ والرَّحمةِ. [أبو داود].

---

السَّلامُ مَودَّةٌ وصفَاءٌ؛ قالَ ﷺ «ثلاثٌ يُصَفِّينَ لكَ وِدَّ أخيـكَ: تُسَـلِّمُ عليهِ إذا لَقِيتَهُ، وتُوسِّعُ لَهُ فِي المَجلسِ، وتَدْعُوهُ بأحَـبِّ أسمائـهِ إليـهِ» [الطبراني].

# سڵاو و ڕێزگرتن

پێغەمبەرﷺ ڕۆشت بۆ سەردانی (سەعد بن عبادە) ؓلە ماڵەکەی خۆی، لەبەردەرگای ماڵەکەی وەستا و فەرمووی: (السلام علیکم و رحمة الله و برکاته).

سەعدؓ و کوڕەکەی قەیسؓ لە ماڵەوە بوون، وەڵامی پێغەمبەری دایەوە بە دەنگێکی کز و نەبیستراو، لەبەرئەوە پێغەمبەرﷺ نەیبیست، قەیس بە باوکی وت: ئەی باوکە، ئایا ڕێگە بە پێغەمبەرﷺ نادەیت؟ وە سەعد وتی: وازی لێبێنە با زۆر سەلامامان لێ بکات، وە پێغەمبەرﷺ سڵاوەکەی دوبارە کردەوە جارێکی تر، پاشان جاری سێیەم، سەعد هەر بە دەنگی نزم جوابی دەدایەوە، لەبەرئەوە پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە، بەڵام سەعد خێرا دوای کەوت و پێی وت: ئەی پێغەمبەرﷺ من گوێم لە سەلامەکانت دەبوو و جوابم دەدایەوە بە نزمی بۆ ئەوەی سەلامامان زۆر لێ بکەیت!! پاشان پێغەمبەریﷺ هێنایەوە بۆ مالی خۆیان وە سەعدؓ میوانداری کرد و ڕێزی لێگرت، پێغەمبەریشﷺ دوعای بۆ کرد و داوای ڕزق و بەزەیی خوای بۆ کرد. (ابو داود)

---

سڵاو کردن مایەی خۆشەویستی و پاکی دەروونە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: سێ شت خۆشەویستی براکەت بۆ دەستەبەر دەکات، کە پێی دەگەیت سڵاوی لێ بکەیت، لە کۆڕدا جێگەی بکەیتەوە، بە جوانترین ناو بانگی بکەیت (الطبرانی)

# تحيَّةُ أهلِ القُبورِ

ذاتَ ليلةٍ، كانَ النَّبيُّ ﷺ يَبيتُ فِي حُجرةِ زَوجتِهِ السَّيِّدةِ عائِشةَ - رضيَ اللهُ عنها - وبعدَمَا نامَ فِي فراشِهِ، قامَ فِي هُدُوءٍ وخرَجَ، فأحسَّتْ بِهِ السَّيِّدَةُ عائشةُ، فخرجَتْ تمشِي خلْفَهُ حتَّى وصَلَ إِلَى البَقيعِ (المكانِ المُخَصَّصِ لقُبُورِ المُسلمينَ)، فوقَفَ ﷺ وقتاً طويلاً هناكَ، ثمَّ رفَع يديَه بالدُّعاء ثلاثَ مرَّاتٍ، ثمَّ عادَ إلى المنزلِ، وعادَتِ السَّيِّدةُ عائشةُ قبلَهُ، ونَامَتْ فِي فراشِهَا ولَمَّا وصَلَ النَّبيُّ ﷺ سمعَ لِلسَّيِّدةِ عائشةَ شَهيقاً عالياً، فسألَها عنِ السَّبَبِ، فحدَّثَتْهُ بأنَّهَا خرَجَتْ وراءَهُ، فأخبرَهَا ﷺ أنَّ جبريلَ قدْ جاءَهُ وقالَ لَهُ «إنَّ ربَّكَ يأمُرُكَ أنْ تَأتِيَ أهلَ البَقيعِ (الموتَى) فتَستَغفرَ لَهُم». فقالَتْ: وكيفَ أقولُ لَهُم يا رسولَ اللهِ؟ فقالَ لَهَا: «قُولِي: السَّلامُ علَى أهلِ الدِّيارِ مِنَ المُؤمِنينَ، ويَرْحَمُ اللهُ المُستَقدمينَ مِنَّا والمُستأخِرِينَ، وإنَّا إنْ شاءَ اللهُ بِكُم لاحِقُونَ» [مسلم].

---

ذكَرَ لنا النَّبيُّ ﷺ بعْضَ آدابِ السَّلامِ، فقالَ «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ علَى الماشِي، والماشِي علَى القاعِدِ، والماشِيانِ أيُّهُمَا بدأَ فَهُوَ أفضَلُ» [البزَّار وابن حبان].

# سلاو لەخەڵکی گۆڕستان

شەوێک، پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵی خاتو(عایشە)(رضي الله عنها) بوو لەدوای نوستن لەسەر جێگە، بەهێواشی هەستاو لەحوجرەکە ڕۆیشتە دەرەوە، خاتو عائشەرضي الله عنها هەستی کرد، ئەویش هەستاو بەشوێنیدا ڕۆیشت تا گەیشتە(بقیع) (شوێنی تایبەت بە گۆڕستانی موسڵمانان)

پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەکی زۆر لەوێدا ڕاوەستا، سێ جار دەستی بەرز کردەوە و دوعای کرد، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە، خاتو عائشەرضي الله عنها پەلەی کردو پێش ئەو گەیشتەوە بۆ ماڵەوە و لەسەر جێگەی خۆی نوست، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەشتەوە گوێ ی لەهەناسەی بەرزی خاتو عائشەی هاوسەری بوو، پرسیاری لێکرد بۆ وات لێهاتووە؟ ئەویش بۆی باسکرد کە شوێنی کەوتووە!!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: کەجبریل هاتووە بۆ لای، فەرمویەتی: پەروەردگارت فەرمانت پێدەکات کە بچیت بۆ لای مردووانی گۆڕستانی بەقیع و داوای لێخۆش بونیان بۆ بکەیت، عائشە (رضي الله عنها) فەرموی: جا من چی بلێم بۆیان ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی بڵێ: سلاوی خواتان لێ بێت ئەی خەڵکی ئەم گۆڕستانە لەموسڵمانان، خوای گەورە لەپێشینانی ئێمەو لە پاشینانمان ببورێ و بەبەزەیی بێت، ئێمەش ئەگەر خوا بیەوێت پێتان دەگەین. (مسلم)

---

پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ ئادابی سلاومان فێر دەکات و دەفەرموێت: سوار سلاو لەو کەسە دەکات کە پیادەیە (واتە بەپێ دەڕوات) پیادە سلاو لەکەسێک دەکات کە دانیشتووە، پیادە کامیان زوتر سلاوی کرد ئەو باشترە)(البزارو ابن حبان)

# رَدُّ السَّلامِ

ذاتَ يـومٍ، كـانَ عثمـانُ بـنُ عفَّـانَ رضـي الله عنـه في المَسجدِ، فمَرَّ عَلَيه سَعْدُ بنُ أبِي وقَّاصٍ رضي الله عنه، فـألْقَى سَعْدٌ السَّلامَ علَى عثمانَ، فنظَرَ عثمانُ إلَيـه ولَـمْ يَـرُدَّ التَّحيَّـةَ، فذهَبَ سَعْدٌ يَشْكُو ذلِكَ لأمِيرِ المؤمنينَ عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ.

فأرسَلَ عُمَرُ إلى عثمانَ وسألَهُ: ما مَنَعَـكَ مِـنْ رَدِّ السـلامِ علَى أخِيكَ؟

فقالَ عثمانُ: ما فعَلتُ ذلكَ. فقالَ سَعْدٌ: بلْ فعَلْتَ.

فتذكَّرَ عثمانُ أنَّهُ كانَ يَدعُو بِدَعوةٍ إذا ذكَرَها فإنَّهُ لا يَشـعُرُ بِمنْ حَولَهُ؛ تِلكَ هي دَعوةُ نبيِّ اللهِ يُونُسَ عليـه السـلام حينمَـا كانَ فِي بطنِ الحُوتِ؛ حيثُ قـالَ: ﴿لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ [الأنبيـاء: ٨٧]. فاعتَـذَرَ عثمـانُ، وانصرَفَ الأَخوانِ فِي حُبٍّ وصفَاءٍ. [الترمذي].

---

يُستَحَبُّ لِلمُسلمِ أنْ يُلْقِيَ السَّلامَ علَى كُلِّ مَنْ لَقِيَهُ، سَواءٌ عرَفَـه أمْ لَـمْ يَعرِفْهُ، أمَّا رَدُّ السَّلامِ فهو واجِبٌ.

# وەلامی سلاو

ڕۆژێک (عثمان کوری عفان) (رضي الله عنه) لەمزگەوت بوو (سەعد کوڕی ابی وقاص) (رضي الله عنه) بەلایدا ڕۆیشت، سلاوی لێکرد (عثمان) (رضي الله عنه) سەیری کردو وەلامی سلاوەکەی نەدایەوە، سەعد ڕۆیشت بۆ لای گەورەی موسڵمانان(عومەر کوڕی خطاب) و شکاتی لێکرد!

عومەر(رضي الله عنه) ناردی بەشوێن (عثمان) دا (رضي الله عنه) پرسیاری لێکرد بۆچی وەلامی سلاوی براکەت نەدایەوە؟ (عثمان) (رضي الله عنه) فەرموی: شتی وام نەکردووە! سەعد(رضي الله عنه)فەرموی: بەڵکو وابوو ئینجا (عثمان) (رضي الله عنه) یادی کەوتەوە کە ئەو لەکاتی پاڕانەوەیەکدا هەست بە دەرو بەری ناکات، ئەویش دوعاکەی یونس پێغەمبەر (علیه السلام) کە لەناو سکی ماسیەکەدا بوو، فەرموی (لاالە الا انت سبحانك إني كنت من الظالمين) الانبیاء/٨٧

عثمان(رضي الله عنه) داوای لێبوردنی کردو هەردو برا بەخۆشەویستی و دڵپاکی لەیەکتر جیابونەوە، (الترمذی)

---

سوننەتە موسڵمان سلاو لەهەر کەس بکات کە پێی دەگات، جا بیناسێت یان نەی ناسێت، بەلام وەلامی سلاو ئەوە واجبە

# تَحيَّةٌ وقِيَامٌ

تَحكِي أمُّ المؤمنينَ عائشةُ ـ رضيَ اللهُ عنـهَا ـ وتقـولُ: مَـا رأيتُ أحَداً مِنَ النَّاسِ كانَ أشْبَهَ بالنَّبيِّ ﷺ فِـي كلامِـهِ وحَديثِـهِ وجِلْسَتِهِ مِنِ ابنَتِهِ فاطمةَ ـ رضيَ اللهُ عنـهَا ـ ، وكَـانَ الـنَّبيُّ ﷺ إذا رآهَا قادمةً رحَّبَ بِهَا، ثُمَّ قامَ لَهَـا وقبَّلَهـا، ثمَّ أخَـذَ بِيَـدِها وأجلَسَها فِي مكانِهِ.

وكانتْ فاطمةُ إذَا أتاهَا النَّبيُّ ﷺ رحَّبَتْ بهِ، ثُمَّ قامَتْ إليهِ وقبَّلَتْهُ. وقدْ دخَلَتْ علَى النَّبيِ ﷺ في مرَضِهِ الَّذي مـاتَ فِيـهِ، فرحَّبَ بِهَا وقبَّلَها، وأسَرَّ إليهَا بِكَـلامٍ فبكَـتْ، ثُـمَّ أسَـرَّ إليهَـا فضَحكَتْ.

فلَمَّا تُوُفِّيَ ﷺ، سَأَلْتُ فاطمةَ عنْ ذلكَ، فقالَتْ: أخبَرَنـي ﷺ بأنَّهُ سيموتُ؛ فبكَيتُ، ثُمَّ أخبَرَني بـأنِّي سـأكُونُ أوَّلَ مَـنْ يَلحَقُ بِهِ مِنْ أهلِهِ؛ فضَحكتُ. [البخاري].

وهكذَا فإنَّ المُسلِمَ يُمكنُـهُ أنْ يَقُـومَ واقِفـاً حبَّـاً واحتِرامـاً لأَخيهِ المُسلمِ إذَا أرادَ تحيَّتَهُ.

---

المُصافَحةُ باليَدِ لهَا أثرٌ كبيرٌ فِي النُّفُوسِ؛ ولِذلكَ قالَ ﷺ «مِنْ تَمـامِ التَّحيَّةِ الأَخذُ باليَدِ» [الترمذي].

# سلاوێك و هەڵسانێك

دایكی باوەڕداران(خاتو عائشه) (ﷺ) دەفەرموێت: هیچ كەسم نەدیوە لەقسەو گفتو گۆو دانیشتن دا لـە پێغەمبـەر(ﷺ) بچـێت بەئەنـدازەی (فاطمـه) ی كچـی پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەر (ﷺ) كە دەیبینی دێت بۆ لای، زۆر بەگـەرمی بـەخێرهاتنی دەكـردو لەبـەری هەڵدەسـتاو ماچـی دەكـرد، پاشـان دەسـتی دەگـرت و لەجێگـەی خـۆی دایدەنیشاند، هەروەها فاطمه ش (ﷺ) كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەهـات بـۆ لای زۆر بەگەرمی پێشوازی دەكرد، هەڵدەستا لەخزمەتیدا و ماچـی دەكـرد، لـەكاتی نەخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) دا كەوەفاتی كرد

فاطمە (ﷺ) هات بۆ لای، ئەویش پێشوازی لێكردو ماچی كرد، بەنهێنی و چـپە قسەیەكی پێ فەرموو، فاطمە (ﷺ) دەستی كردە گریان! پاشان چـپەیەكی تـری بەگوێدا كرد! دەستی كرد بەزەردە خەنە. كاتێك پێغەمبـەر(ﷺ) وەفـاتی كـرد: پرسیارم لەو بارەیەوە لە فاطمـە(ﷺ) كـرد ووتـی: یەكـەم جـار پێغەمبـەر(ﷺ) هەواڵی پێدام كە دەمرێت، منیش گریام، پاشان هەواڵی پێـدام كـە مـن یەكـەم كەس دەبم لەخێزانەكەی كە پێی دەگەم، منیش پێكەنیم (البخاري).

بەم شێوەیە موسڵمان دروستە وەك خۆشەویستی و ڕێز لەبەر براكەی هەسـتێ ئەگەر ویستی سلاوی لێ بكات.

---

تەوقەكردن شـوێنەواری گـەورەی لـەدەرون دا هەیـە، لەبـەر ئـەوە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویەتی: لەتەواوكاری سلاو كردن دەسـتی یـەكتر گرتنـە واتـە(تەوقـە كردن) (الترمذي).

# الهَديَّةُ

ذاتَ يومٍ، جاءَ رَجلانِ مِنَ الشَّامِ إلى المدينةِ، يَسألانِ عنِ الصَّحابِيِّ الجَليلِ سَلْمَانَ الفَارِسيِّ ـ رضيَ اللهُ عنه ـ، فلَمَّا وصَلاَ إلَيهِ قالا جِئنَاكَ مِنْ عند أخٍ لكَ بِالشَّامِ.

فقالَ منْ هُوَ؟ قالا أبو الدَّرْدَاءِ رضي الله عنه.

فقالَ لهُمَا سَلْمانُ أين هديَّتُهُ الَّتِي أرسَلَهَا معكمَا؟

فقالا لَمْ يُرسِلْ معنَا هديَّةً. فقالَ لَهُمَا اتَّقِيَا اللهَ وأَدِّيا الأمانةَ.

فقالا لَمْ يَبْعَثْ معنَا شيئاً؛ إلا أنَّهُ قالَ لنَا: إنَّ فيكُم رَجلاً كانَ رسولُ الله ﷺ إذَا خَلاَ بِهِ لَمْ يَبْغِ (يَطلُبْ) أحَداً غيرَهُ، إذا أتَيتُماهُ فأَقرِئاهُ (بلِّغاهُ) مِنِّي السَّلامَ. فقالَ سَلْمانُ للرَّجُلَينِ: تِلكَ هِيَ هَدِيَّتُهُ. وأيُّ هديَّةٍ أفضَلُ مِنَ السَّلامِ.. تَحيَّةٌ مِنْ عندِ اللهِ مباركةً طيِّبةً!! [الطبراني].

---

الإكثارُ مِنَ السَّلامِ كلُّهُ خيرٌ وبركةٌ؛ قالَ أنسُ بنُ مالكٍ: إذَا كنَّا معَ رسولِ الله ﷺ فتُفَرِّقُ بيننَا شَجرةٌ، فإذا التَقينَا يُسَلِّمُ بَعضُنا على بعضٍ. [الطبراني].

# دیاری

ڕۆژێک دوو پیاو لەشامەوە هاتن بۆ مەدینە پرسیاریان دەربارەی هاوەڵی ڕێزدار (سلمان الفارسی)ﷺ دەکرد کاتێک پێی گەیشتن وتیـات: لـەلای برایەکتـەوە لـە شامەوە هاتوین بۆ لات فەرموی: کێ یە ئەو کەسە؟ وتیـان: (ابـو الـدرداء) (ﷺ) سەلمان (ﷺ) پێ ی وتن: دیاریەکەی کوا کە بەئێوەدا ناردویەتی؟ وتیان: دیاری بە ئێمەدا نەناردووە!!

پێ ی وتـن: لـەخوا بترسـن و ئەمانـەت بگێڕنـەوە بـۆ خـاوەنی. وتیـان: هیچـی بەئێمەدا نەناردووە تەنها ئەوەنـدە نـەبێت پـێ ی وتـین: پیاوێـک لەناوتاندایـە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بەتەنها بوایە لەگەڵیدا، هەواڵی کەسی تـری داوا نـەکرد، ئەگەر چونە لای سلاوی منـی پێبگەیـەنن. سـەلمان بـەدوو پیاوەکـەی وت: ئـەوە دیاریەکەیەتی، چ دیارییەک گەورە ترە لە سلاو، سلاوێکی پیرۆزو بەبەرەکـەت و پاک لەلایەن خوای گەورەوە. (الطبرانی)

---

زۆر سلاو کردن هەمووی چاکەو پیرۆزییە،

ئەنەسی کوڕی مالیک (ﷺ) دەفـەرموێت: ئەگـەر ئێمـە لەخزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) دا دەبـــوین، درەختێـــک لەیـــەکتری جیادەکردینـــەوە کـــە بەیـــەکتر دەگەیشتینەوە هەندێکمان سلاومان لەهەندێکی ترمان دەکردەوە (الطبرانی).

# قِصصُ آدابِ التَّحيَّةِ

الإسلامُ دِينٌ يَحرِصُ علَى نشرِ المحبَّةِ والتَّآلُفِ بينَ النَّاسِ، حتَّى يَعيشُوا فِي إخاءٍ وصَفاءٍ. ولِذَا شَرَعَ اللهُ تعالَى تحيَّةَ الإسلامِ، وهِي: السَّلامُ علَيكُم ورَحمةُ اللهِ وبركاتُهُ.

والسَّلامُ تحيَّةُ ملائكةِ اللهِ وأنبيائِهِ، وهو دعوةٌ بالرَّحمةِ والبَرَكةِ والخَيرِ.

والسَّلامُ رسولُ المحبَّةِ بين القُلوبِ، يُقَوِّي رَوابِطَ الأُخُوَّةِ.. ويَشِيعُ الحُبَّ بينَ النَّاسِ.

والمُسلِمُ يُلْقِي التَّحيَّةَ علَى كُلِّ مُسلِمٍ؛ عرَفَهُ أو لَمْ يَعرِفْهُ، ويُسَلِّمُ الصَّغيرُ علَى الكبيرِ، والرَّاكِبُ علَى الماشِي، والقَليلُ على الكثيرِ.

وقدْ علَّمَنَا الإسلامُ كيفَ نُسلِّمُ علَى غيرِ المُسلمينَ، وكيفَ نَردُّ تحيَّتَهُمْ؛ حِرصاً علَى دعوَتِهِمْ بالحكْمةِ والمَوعِظَةِ الحسَنةِ.

والمُسلِمُ يَعرِفُ أنَّ إفشاءَ السَّلامِ طريقٌ إلَى الثَّوابِ الكبيرِ؛ كمَا قالَ ﷺ: «لا تَدخُلونَ الجنَّةَ حتَّى تُؤمِنُوا، ولا تُؤمِنُوا حتَّى تَحابُّوا، ألاَ أدلُّكُم علَى شيءٍ إذا فعَلْتُموه تَحابَبْتُم؟ أفشُوا السَّلامَ بينكم» [مسلم].

* * * * *

# لەکۆتاییدا

ئیسلام پەیامێکە سورە لەسەر بڵاو کردنەوەی خۆشەویستی و پێکەوە گونجان لەنێوان خەڵکدا، تا بەبرایەتی و دەرون پاکی پێکەوە بژین، لەبەر ئەوە خوای گەورە سڵاوی ئیسلامی داناوە کە دەوترێت: السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

سڵاو کردن سڵاوی فریشتەکانی خواو پێغەمبەران(عليهم السلام) واتە: داوای ڕەحمەت و بەرەکەت و چاکە، سڵاوکردن نمایندەی خۆشەویستی یە لەنێو دڵەکاندا، پەیوەندی برایەتی بەهێز دەکات و خۆشەویستی لە نێوان خەڵکدا بەدی دەهێنێت، موسڵمان سڵاو لەهەموو موسڵمانێک دەکات، بیناسێت یان نا، بچووک سڵاو لەگەورە دەکات، سوار لەپیادەو کەم لە زۆر،

ئیسلام فێرمان دەکات چۆن سڵاو لەجگە لە موسڵمانان بکەین و چۆن وەڵامی سڵاویان بدەینەوە، ئەمەش لەبەر بانگەواز کردنیان بەجوانیو ئامۆژگاری چاک

موسڵمان دەزانێت کە سڵاو کردن پاداشتی زۆرە، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ناچنە بەهەشت تا باوەڕتان نەبێت، باوەڕیشتان تەواو نیە هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان فێر بکەم کە خۆشەویستی لە نێوانتاندا دروست بکات؟ سڵاو زۆر لەیەکتری بکەن.(مسلم)

# ئادابی سەردان و میوانداری

نوسینی : منصور علی عرابی

وەرگێڕانی : م. فاتح شارباژێڕی

# اسئتذانُ الزَّائرِ

كَانَ النَّبيُّ ﷺ يُعلِّمُ أصحابَهُ آدابَ الاستِئذَانِ، وذَلكَ تَنفيذاً لأمرِ اللهِ عزَّ وجلَّ، قَالَ تَعالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٢٧ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ [النور ٢٧ ـ ٢٨].

وذَاتَ يَومٍ، كَانَ النَّبيُّ ﷺ فِي بيتِهِ ومعَهُ خادِمُهُ أنسُ بنُ مَالكٍ رضي الله عنه، فَجاء رجلٌ، ووَقفَ علَى بابِ البيتِ، وَقالَ: أألِجُ؟ (أي: هَلْ أدخُلُ)؟

فَقالَ النَّبيُّ ﷺ لخادمه: «اخرُجْ إلى هذَا فَعلِّمْهُ الاستِئذَانَ، فقُلْ لَهُ: قُلْ: السَّلامُ عَليكُمْ، أأدخلُ؟».

فَسمعَ الرَّجلُ كلامَ النَّبيِّ ﷺ، فَقالَ: السَّلامُ عَليكُمْ، أأدخلُ؟ فَأذنَ لهُ النَّبيُّ ﷺ بِالدُّخولِ، فَدخَلَ الرَّجلُ. [أبو داود].

---

من آدابِ الزِّيارةِ: عدمُ النَّظرِ داخلَ البَيتِ قبلَ الاستِئذانِ، فَقَدْ كَانَ النَّبيُّ ﷺ إذَا زارَ أحَداً لا يَستَقبِلُ البابَ بوَجهِهِ، ولَكِنْ يَقِفُ بِجَانبِ البابِ. [أبو داود].

# ( مۆڵەت وەرگرتنی میوان )

پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی فێر دەکرد چۆن سەردان بکەن، و فەرمانی خوا جێ بەجێ بکەن.خوای گەورە دەفەرموێ:(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە هیچماڵێکی تر جگە لە ماڵەکانی خۆتان هەتا کارێک نەکەن کە ئەوان ئاگادار بن (وەکو لە دەرگادان یان زەنگ لێدان)پاشان کە مۆڵەت دران سەلام بکەن لە خەڵکی ماڵەکە، ئەوە چاکترە بۆتان و بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن،هەوڵ بدەن لە یادتان بیت ئەو شێوازە فەرامۆش مەکەن(کاتی گونجاوو لەبار هەڵبژێرن بۆ سەردانەکانتان، بۆ ئەوەی میوان و خاوەن ماڵ دڵیان بەیەک بکرێتەوە،جا ئەگەر کەستان نەبینی تیایدا، یاخود هەستتان کرد کەس لە ماڵ نیە، مەچنە ژورەوە هەتا مۆڵەت نەدرێن، ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە (کاتمان نیە، یان کارمان هەیە...)بگەڕێنەوە بەبێ دڵگرانی، ئەوە چاکترە بۆتان، چاکیش بزانن خوا زانایە بە هەمووئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)النور ٢٧-٢٨.

-ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ لە ماڵەوە بوو ئەنەسی خزمەتکاریشی لە لابوو،پیاوێک هات و ڕاوەستا لە بەردەم ماڵی پێغەمبەردا وتی:ئایا بێمە ژورەوە؟پێغەمبەرﷺ بە خزمەتکارەکەی وت:(بڕۆ بۆ لای فێری مۆڵەت وەرگرتنی بکە وە پێی بڵێ:بڵێت(السلام علیکم)سڵاوی خواتان لێبێت،ئیزن هەیە بێمە ژورەوە؟

-پیاوەکە گوێی لەقسەکانی پێغەمبەرﷺ بوو. وتی:سڵاوی خواتان لێ بێ،ئیزن هەیە بێمە ژورەوە؟پێغەمبەرﷺ فەرموی:بەڵێ وەرە ژورەوە.پیاوە کە چووە ژورەوە) (ابو داود).

---

-لە ڕەوشتی سەردانکردندا:پێویستە سەیری ناو ماڵ نەکەی تا مۆڵەت دەدرێیت،پێغەمبەرﷺ:(ئەگەر بە میوانی دەچوو بەرامبەر دەرگا نەدەوەست، بەڵکو لە لایەکی دەرگاکەوە رادەوەستا) (ابو داود).

# الاستِئذَانُ ثلاثاً

أرسَلَ أميرُ المؤمنينَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه إلَى أَبي مُوسى الأَشْعَريِّ رضي الله عنه وَطلَبَ مِنْهُ أنْ يَأتيَهُ.

وَبعدَ مُدَّةٍ، ذَهَبَ أبو مُوسى إلى بيتِ عُمَرَ، فلَمَّا وصَلَ إلى بابِ الدَّارِ وَقَفَ علَى البابِ، وَاستَأذنَ ثلاثَ مَرَّاتٍ، فَلَم يَأذَنْ لهُ أحَدٌ بالدُّخُولِ، فَرجِعَ.

وَفي أثناءِ عَودَتِهِ، وَجَدَ أبَا سَعيدٍ الخُدْرِيَّ رضي الله عنه جَالِساً معَ بعضِ الأنصارِ، فَذهبَ أَبُو مُوسَى إِليهِمْ، وجَلسَ معهُمْ.

وبَعْدَ قليلٍ، جاءَ عُمَرُ رضي الله عنه فَقالَ لهُ: مَا مَنعَكَ أَنْ تَأتِيَني؟

فَقالَ أَبو مُوسى: قَدْ جِئتُ فَاستَأذَنْتُ ثَلاثاً؛ فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، وَقَدْ قالَ رسولُ الله ﷺ: «إذَا استَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلاثاً فَلَمْ يُؤذَنْ لهُ فَلْيَرْجِعْ» [أبو داود].

---

من آدابِ الزِّيارةِ أنْ يستَأذِنَ الزَّائرُ مِنْ صَاحبِ البَيت، ولَهُ أنْ يَستَأذِنَ ثلاثَ مرَّاتٍ، وَلا يَزيدُ على الثَّلاثةِ، فَإنْ أُذِنَ لهُ دخَلَ؛ وإلاَّ انصَرَفَ.

# سێ جار داوای مۆڵەت

گەورەی موسوڵمانان —عومەری کوڕی خەتاب‌ رضي الله عنه ناردی بە شوێن (ئەبی موسای ئەشعەریدا)رضي الله عنه داوای لێکرد کە سەردانی بکات.پاش کەمێک،ئەبی موسا ڕۆشت بۆ ماڵی پێشەوا عومەر، کاتێک گەیشتە ماڵیان لە بەردەم دەرگا وەستاو، سێ جار داوای مۆڵەتی کرد بەڵام کەس جوابی نەدایەوە، ئەویش گەڕایەوە.لە کاتی گەڕانەوەیدا، ئەبی سەعیدی خودری‌رضي الله عنه بینی دانیشتووە لەگەڵ کۆمەڵێ لە پشتیوانان، ئەبو موسا رضي الله عنه ڕۆیشت بۆ لایان و دانیشت لەگەڵیان،پاش کەمێک،پێشەوا عومەررضي الله عنه هات بۆ لایان و فەرمووی:(چی وای لێکردی کە نەیەیت بۆ لام؟ئەبو موسا وتی:هاتم وە سێ جار داوای ڕوخسەتم کرد بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە، منیش گەڕامەوە چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:(هەر یەکێ لە ئێوە ئەگەر چووە بەرماڵێک و سێ جار داوای مۆڵەتی چونە ژورەوەی کرد بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە با بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی) (ابو داود).

---

لە ئادابی سەردان ئەوەیە داوای مۆڵەت بکەی لە خاوەن ماڵ،وە تەنها سێ جار بۆت هەیە داوای مۆڵەت بکەی یان بدەی لە دەرگا یان زەنگ لێ بدەی، بۆت نی یە لە سێ جار زیاتر، ئەگەر مۆڵەتیان دای بچۆرە ژور ئەگەر نا بگەڕێرەوە بۆ ماڵی خۆت.(ئەمڕۆ شێوازی پەیوەندی کردن بە تەلەفۆن شێوازێکی جوانەو پێشتر ماڵەکە ئاگادار دەکەیتەوە، ئەگەر بواریان هەبوو دەچێت ئەگەر بواریان نەبوو، یان لە ماڵ نەبوون، خۆت ماندو ناکەیت و ناچیت) (وەرگێڕ)

# تَخفِيفُ الزِّيارةِ

عِندمَا تزوَّجَ رسولُ اللهِ ﷺ السَّيِّدةَ زَيْنبَ بنتَ جَحْشٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ـ ، صنَعَ وَلِيمةً مِنَ الطَّعامِ، ودَعَا النَّاسَ لِيأكُلُوا، فَجاءَ النَّاسُ وَأكلُوا، ثُمَّ انصرفُوا، وَبقِيَ ثلاثةٌ مِنَ الرِّجالِ، ظَلُّوا جَالِسينَ فِي حُجْرةِ النَّبيِّ ﷺ، فَدخَلَ النَّبيُّ ﷺ الحُجْرةَ، فَوجَدَهُمْ، فَانصَرفَ، ثُمَّ عادَ فَوجَدَهُمْ، فَانصَرفَ، ثُمَّ قَامُوا وَانصرَفُوا، فَذهَبَ أنسُ بنُ مالكٍ رضي الله عنه إلى النَّبيِّ ﷺ وَأخبرَهُ أنَّهُمُ انصرَفُوا، فجاءَ النَّبيُّ ﷺ. ثُمَّ أنزلَ اللهُ عزَّ وجلَّ قُرآناً يُوجِّهُ المُسلِمينَ إلى تَخفيفِ الزِّيارةِ، وَعدَمِ إطالَتِهَا، خاصَّةً بعدَ أن يَنتهِي الزَّائرُ مِن قضَاءِ حَاجَتِه، قَالَ تَعالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ [الأحزاب:٥٣].

---

إذَ زارَ المُسلمُ عَروسَينِ يُستَحَبُّ أنْ يَدعُوَ لَهُمَا بِالخَيرِ، وَمِنْ ذلكَ أنْ يقولَ لكلٍّ مِنْهُمَا: «بَاركَ اللهُ لكَ، وبَاركَ عَلَيكَ، وجمَعَ بينكُمَا فِي خَيرٍ» [الترمذي].

# ئاسانکاری لە سەرداندا

کاتێك پێغەمبەرﷺ خاتوو زەینەبی کچی جەحشی خواست ﵂ نـانێکی زۆریـان ئامـادە کـردو خـەڵکیان بـانگ کـرد بـۆ نـان خـواردن، خەڵکەکـە هـاتن بـە دەم دەعوەتەکەوەو نانیان خوارد و ڕۆشتن،بەڵام سێ کـەس دانیشـتن و نەدەڕۆشـتن مانەوە لە ژوورەکەی پێغەمبەردا، کاتێك پێغەمبـەر ﷺ هاتـە ژورەوە بینـی ئـەم سێ پیاوە هێشتا نەڕۆشتوون، ئەمجارەش ڕۆشـتە دەرەوە، دوای ئـەوە ئـەم سـێ کەسە هەستان ڕۆشتن، ئەنەس کوڕی مالك ﵁هەواڵی برد بۆ پێغەمبەرﷺ کـە ئەو سێ کەسە ڕۆشتن.ئەوجا پێغەمبەرﷺ ڕۆشتە ژورەوە.خـوای گـەورە ئایـەتی ناردە خوارەوە ڕوو بە موسـوڵمانان وە شـێوازی سـەردانی مـاڵی پێغەمبـەری بـۆ دیاری کردن کە زۆر کەم بمێننەوە لە ماڵی پێغەمبەرداﷺ نارەحـەتی مەکـەن بـە تایبەت کە ئێوە بۆ نان خواردن دەعوەت کرابوون،دەبوایە دوای نـان خواردنەکـە ئەو شوێنەتان چۆڵ کردایە.خوا دەفەرموێ:(ئەی ئەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە مەچن بۆ سەردانی ماڵەکانی پێغەمبـەرﷺ مەگـەر مۆڵـەتتان بـدرێت و مۆڵـەت بخوازن، ئەگەر مۆڵەت دران بۆ نان خواردنێك چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن ئەگەر پێنەگەشـتبوو(مەبەسـت ئەوەیـە کـە زوو مەچـن کـە هێشـتا خواردنەکـە پـێ نەگەیشتووە)بەڵام کاتێك بانگکران ئەوە بچنە ژورەوە، جـا کاتێـك نانتـان خـوارد بڵاوەی لێ بکەن و خۆتان بە قسـەوە سـەرگەرم مەکـەن.چـونکە بـە ڕاسـتی ئـەو کارەتان پێغەمبەرﷺ ئـازار دەدات، ئـەویش شـەرمتان لێ دەکـات(داوای چـونە دەرەوەتـان لێ ناکـات)خـوایش شـەرم لـە ڕاگەیانـدنی هـەق و ڕەوا ناکـات) (الاحزاب٥٣).

---

کاتێك موسوڵمان سەردانی بوك و زاوا دەکات دەبێ دوعـاو نـزای خێریـان بـۆ بکات، وە زۆر نەمێنێتەوە لایان.بەم شێوازە دوعا بکات(خـوا لێـت پـیرۆز بکـات و بەرەکەتی بڕێژێ بەسەرتداو لەسەر خێر کۆی کردبنەوە)الترمذی.

# استِطَاعةُ المَزُوْرِ

كَانَ النَّبيُّ ﷺ لا يُكلِّفُ أصحابَهُ مَا لا يُطِيقُونَ، وَذلكَ عَمَلاً بقولِ اللهِ تَعالَى: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ﴾ [البقرة:٢٨٦].

وكَانَ جابرُ بنُ عبد اللهِ رضي الله عنه كَريماً جوَاداً، يُكرِمُ ضُيوفَهُ، ويَدعُو النَّاسَ لِزيارتِه.

وذاتَ يَومٍ، جَاء إلى جابرٍ بعضُ النَّاسِ لِزيارتِهِ، ولَمْ يَكُنْ جابرٌ قَدْ أعَدَّ لَهُمْ طَعاماً، ولَمْ يكُنْ مُستَعِداً لهذِهِ الزِّيارةِ، فَرَحَّبَ بِهِمْ، وَأدخَلَهُمُ الدَّارَ.

ثمَّ دخَلَ جابرٌ رضي الله عنه البيتَ يبحَثُ عَنْ طَعامٍ يُكرِمُ بهِ زَائريهِ، فَلَمْ يَجِدْ سِوى الخُبزِ وَالخَلِّ، فَأحضرَهُ، وَقدَّمَهُ إِليهِمْ، وقَالَ لَهُمْ: كُلُوا؛ فَإنِّي سمعتُ رسولَ الله ﷺ يقولُ: «نِعْمَ الإدامُ (مَا يُؤكَلُ بهِ الخُبزُ) الخَلُّ. إنَّهُ هَلاَكٌ بِالرَّجلِ أنْ يَدخُلَ إليهِ النَّفَرُ مِنْ إخوانهِ فَيَحتَقِرُ مَا في بَيتِهِ أَنْ يُقدِّمَهُ إليهِمْ، وَهلاَكٌ بِالقَومِ أنْ يَحتَقِرُوا مَا قُدِّمَ إِليهِمْ» [الحاكم وأبو يعلى].

---

المُسلِمُ أخُو المُسلمِ، لا يُجْهِدَهُ في طلَبِ مَا لا يستَطيعُ، ولا يُكلِّفَهُ مَا لا يَتحمَّلُ عندَمَا يَزُورُهُ، كمَا أنَّ المُسلِمَ المَزُوْرَ لا يَبخَلُ على أخيهِ بمَا يُمكِنُ أن يُقدِّمَهُ لهُ.

# میوانداری بە گوێرەی توانا

پێغەمبەرﷺ ئەرکی وای نەدەخستە سەر هاوەڵانی کە لە توانایاندا نەبوایە، ئەمەش لە ژێر رۆشنایی ئایەتی خوا کە دەفەرموێت ﴿خوای گەورە ئەرک ناخاتە سەر هیچ کەسێک مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت﴾

-جابری کوڕی عبداللە ﷺ کەسێکی بەخشندەو سەخی بوو، وە زۆر خزمەتی میوانی دەکرد و بەردەوام خەڵکی دەعوەت دەکرد، ڕۆژێکیان کۆمەڵێک ڕۆشتن بۆ سەردانی ماڵی جابر، لەماڵی جابردا هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی وای نەبوو،وە هیچ ئامادەییەکی نەبوو بۆ پێشوازی لەو میوانانە، بەڵام زۆر بە جوانی پێشوازی لێکردن فەرموی لێکردن.جابر چویە ماڵەوەو داوای لە هاوسەری کرد کە چیمان هەیە ئامادەی کە بۆ میوانەکان؟ هاوسەری وتی:تەنها نان و سرکەمان هەیە، جابر فەرموی:ئامادەی بکە، پێشکەش میوانەکانی کردو فەرموی:بخۆن.گوێم لە پێغەمبەر بوە دەیفەرموو:(باشترین پێخۆر و سرکەیە، دەیفەرموو(ئەو پیاوانە بە هیلاک بچن کاتێک میوان دەبەنە ماڵ و لە بەردەم میوانا نان و خواردنەکەیان بە سوکی پێشکەش بە میوانەکان دەکا،وە ئەو میوانانە بە هیلاک بچن کە بەمیوانی دەچن و نانی ئەو ماڵە بە کەم سەیر دەکەن)الحاکم وابویعلی.

---

موسوڵمان برای موسوڵمانە، داوای شتێکی لێ ناکات کە لە توانایدا نەبێت، وە ئەرک ناخاتە سەر ماڵی براکەی لە کاتی سەرداندا، وەنابێ موسوڵمان کە میوانی دەبێت بەخیل و چروک و حەسود بێ بەو نان و خواردنەی پێشکەشی میوانەکەی دەکات.

# إمَامَةُ الزَّائِرِ

كانَ النَّبيُّ ﷺ حَرِيصاً علَى أنْ يُعطِيَ كلَّ ذِي حَقٍّ حقَّهُ، وَمِنْ حَقِّ الرَّجلِ فِي الإسلامِ أنْ يكُونَ سَيِّداً في بَيتِهِ، وَالمُتَصرِّفَ الوحيدَ في شؤُونِه، فَلا يَدخُلُ أحَدٌ بيتَهُ إلاَّ بِإذنِه، وَلا يَجلِسُ أحَدٌ على فِراشِه إلاَّ بإذنِه، وَلا يُصَلِّي بِهِ أحَدٌ في بيتِهِ إلاَّ إذَا أذِنَ لهُ، وقَدْ علَّمَ النَّبيُّ ﷺ أصحابَهُ ذَلكَ.

وكانَ مَالِكُ بنُ حُوَيْرِثَ رضي الله عنه مِنْ صحَابةِ رسولِ اللهِ ﷺ.

وذاتَ يَومٍ، كانَ مالِكٌ يَزورُ بعضَ أصحابِهِ، فَحانَ وَقتُ الصَّلاةِ، وكانَ عندَ هؤلاءِ النَّاسِ مُصَلًّى فِي بَيتِهِمْ، فَأقامُوا الصَّلاةَ وَطلَبُوا منْهُ أنْ يَتَقدَّمَ لِيُصَلِّيَ بهِمْ، فَرَفَضَ مَالكٌ ذَلكَ، وقَالَ لَهُمْ: قَدِّمُوا رَجُلاً مِنكُمْ يُصَلِّي بِكُمْ، وسَأُحَدِّثُكُمْ لِمَ لاَ أُصَلِّي بِكُمْ: سَمِعتُ رسولَ اللهِ ﷺ يَقولُ: «مَنْ زارَ قَوماً فَلاَ يَؤُمَّهُمْ، ولْيَؤُمَّهُمْ رَجلٌ مِنْهُمْ» [أبو داود].

---

لا يَجوزُ لِلزَّائرِ أنْ يُصَلِّيَ بِمَنْ يَزُورُهُمْ في بُيوتِهِمْ إلاَّ بِإذنِهِم، قَالَ ﷺ: «إِذَا زارَ أحَدُكُمْ قَوماً فلاَ يُصَلِّيَنَّ بِهِمْ» [النسائي].

# ئیمامەتی میوان

پێغەمبەرﷺ زۆر داکۆکی دەکرد لەسەر ئەوەی کەهەموو شتێ هەقی خۆی پێ بدرێ، وە هەقی پیاو لە ئیسلامدا ئەوەیە کە گەورەی ماڵ بێت، وە ئەم بۆی هەیە تەصەروف بە ماڵ و حاڵەوە بکات، هیچ کەس بۆی نی یە بچێتە ماڵیەوە تەنها بە مۆڵەتی ئەم نەبێ، وە کەس بۆی نی یە دانیشێ وە پاڵ بکەوێ لە ماڵیا تەنها بە ئیزنی ئەم دەتوانن ئەو کارانە بکەن، و کەس بۆی نی یە نوێژ بکا لە ماڵیا و ئیمامەت بکا بۆ جەماعەتێ تەنها مەگەر ئەم ئیزنیان بدات، پێغەمبەرﷺ بەم شێوەیە هاوەڵانی فێر کردووە.ڕۆژێکیان (مالکی کوڕی حووەیرث) رضي الله عنه کەلە هاوەڵانی پێغەمبەر بووﷺ هەندێ هاوەڵی بەڕێز چونە سەردانی بە میوانی، کاتی نوێژ هات.هاوەڵان شوێنێکیان کردە شوێنی نوێژ کردن وە قامەتیان کردو داوایان کرد کە مالک پێش نوێژیان بۆ بکا،بەڵام مالک ئەمەی ڕەت کردەوە.فەرموی:(کەسێک لە خۆتان پێش خەن با نوێژتان بۆ بکات، وە بۆتان ڕون دەکەمەوە کە من بۆ ئەو کارەم نەکرد:چونکە بیستومە لە پێغەمبەرﷺ کە دەیفەرموو:(هەر کاتێ سەردانی شوێنێکتان کرد با ئیمام لە خۆیان بێ) (ابو داود).

---

دروست نی یە بۆ میوان لە ماڵی خاوەن ماڵدا! پێش نوێژی بکەن تەنها بە ئیزنی خاوەن ماڵ نەبێت، پێغەمبەر دەفەرموێ: (ئەگەر یەکێک لە ئێوە سەردانی کەسانێکی کرد با نوێژیان پێ نەکات (واتە: ئیمامەت نەکات) (النسائي).

# زِيارةُ المُتَحَابِّينَ

دَوامُ الصِّلَةِ والوِدِّ والمَحبَّةِ بينَ النَّاسِ مِنْ أهَمِّ الأُمورِ وَأعظَمِهَا عندَ اللهِ، ومِنْ أسبابِ تحقيقِ ذَلكَ: أنْ يُكثِرَ النَّاسُ مِنْ زيارتِهِمْ لبَعضِهِمْ، وَبذلِكَ يَزِيدُ الحُبُّ بينَهُمْ، كمَا يَحصُلُونَ على الأَجرِ الكبيرِ مِنَ اللهِ.

وقَدْ كانَ لِرَجلٍ صَدِيقٌ يَسكُنُ في قَريةٍ بَعيدةٍ عن قَريَتِه، فخَرَجَ ذلِكَ الرَّجلُ يُوماً لزيارةِ صَديقِه. وَفي الطَّريقِ، قابَلَهُ مَلَكٌ في صُورةِ رَجلٍ، فلَمَّا اقترَبَ منْهُ سأَلَهُ المَلَكُ: أينَ تُريدُ؟

فقالَ الرَّجلُ: أريدُ أخاً لِي في هذِه القَريةِ.

فَقالَ المَلَكُ: هَلْ لكَ علَيهِ مِنْ نِعمَةٍ تَرُبُّهَا (أَيْ: هَلْ لكَ عِندَهُ مَصْلَحةٌ تذهَبُ إليهِ بسببِهَا)؟

فقالَ الرَّجلُ: لا، غيرَ أنِّي أحبَبْتُهُ في اللهِ عزَّ وجلَّ.

فَقالَ المَلَكُ: فَإنِّي رسولُ اللهِ إليكَ، بِأنَّ اللهَ قَدْ أحبَّكَ كمَا أحبَبْتَهُ فيهِ. [مسلم].

---

زِيارةُ الإخوانِ في اللهِ لهَا عندَ اللهِ أجْرٌ عَظيمٌ، قَالَ ﷺ: «قَالَ اللهُ تَعالَى: وَجبَتْ محبَّتِي لِلمُتَحابِّينَ فيَّ (مِنْ أَجْلِي)، وَالمتَجالسِينَ فيَّ، وَالمُتَزاورِينَ فيَّ» [مالك].

# سەردانی لەبەر خوا

بەردەوام بونی خۆشەویستی و تەبایی خەڵکی لەبەر خوا لە هەرە کارە گرنگ و گەورەکانە لای خوای میهرەبان، بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی خوا پێویستە، خەڵکی بەردەوام سەردانی یەکتری بکەن، چونکە بەهۆی سەردانی کردنەوە خۆشەویستییان بۆ یەک زیاد دەبێ وە پاداشتی گەورە بەدەست دەهێنن لای خوای میهرەبان.

-کابرایەک هەبوو برایەکی موسوڵمانی هەبوو لە دێیەکی دور، ڕۆژێکیان لەماڵ دەرچوو بۆ سەردانی ئەم برا موسوڵمانەی، لە ڕێگادا فریشتەیەکی پێگەیشت لە شێوەی مرۆڤدا، کە لێی نزیک بووەوە پرسیاری لێکرد:ئەتەوێ بچی بۆ کوێ؟پیاوەکە وتی:ئەمەوێ سەردانی ئەو برایەم بکەم لە فلانە دێ! فریشتەکە وتی:ئایا هیچ کارو ئیش و مەصڵەحەتێکتان بەیەکەوە هەیە! ئاوا دەچی بۆ لای؟پیاوەکە وتی:نەخێر،تەنها لەبەر خاتری خوا خۆشم دەوێ و سەردانی دەکەم.فریشتەکە وتی:من فریشتەی خوام،خوای گەورە ناردوومی تا پێت بڵێم کە خوای گەورە تۆی خۆش دەوێ چونکە تۆ لەبەر خاتری خوا ئەو برا موسوڵمانەت خۆش دەوێ) (مسلم).

---

سەردانی برای موسوڵمان لەبەر خاتری خوای گەوە پاداشتی گەورەی هەیە،پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(خوای گەورە فەرمویەتی:واجبم کرد لەسەر خۆم خۆشەویستی ئەو کەسانەی یەکتریان لەبەر خاتری من خۆش دەوێ،وە لەبەر من کۆدەبنەوەو دادەنیشن بەیەکەوە، وەلەبەر من سەردانی یەکتر دەکەن) (مالک). ▯

# زِيارةُ الأقَارِبِ

كانَ النَّبي ﷺ يحرَصُ على صِلَةِ الأرحَامِ، وَيأْمُرُ أصحابَهُ بذلكَ، فيقولُ لهُمْ: «مَن كانَ يُؤمِنُ باللهِ وَاليومِ الآخـرِ فَليَصِـلْ رحمَهُ» [متفق عليه].

وكانَ أحـدُ الصـحابة يُنفِّـذُ أمـرَ الـنَّبي ﷺ فيَـزورُ أقاربَـهُ، ويصِلُهُمْ، ولَكنَّ أقارِبَهُ كانُوا لا يَزُورُنَهُ، وَلا يُحسـنُونَ مُعامَلَتَـهُ، فَغَضِب الرَّجلُ مِنْ ذلكَ، وذهَبَ إلى النَّبيِّ ﷺ يَشكُو إليه، وَقالَ لهُ: يَا رسولَ الله! إنَّ لـي قَرَابـةً (أقـارِبَ)، أصـلُهُمْ وَيقْطَعُـونَني (أي: لا يَزورُنَني)، وَأحسنُ إليهِمْ وَيسـيئُونَ إليَّ، وَأحلُـمُ عَـنْهُمْ (أُعاملُهُمْ بالرِّفقِ) وَيجْهَلُونَ عَليَّ (يُعـاملُونَني بالغلْظَـة وَالشِّـدَّة). فَأوصَاهُ النَّبيُّ ﷺ أنْ يَسـتَمرَّ في زِيـارتِهِمْ وَصِـلَتِهِمْ، فَلَـهُ بـذلكَ الأجرُ الكبيرُ، وَعليهِمُ الوِزْرُ وَالذَّنْبُ؛ لسُوء مُعامَلَتهِمْ لهُ، وقَـالَ لهُ النَّبيُّ ﷺ: «لَئنْ كُنتَ كمَا قُلتَ فَكأنَّمَا تَسفُّهُمُ المَلَّ (تُطعمُهُـمُ الرَّمادَ الحـارَّ)، وَلا يـزَالُ معَـكَ مـنَ اللهِ ظَهِـيرٌ (تَأييـدٌ وَتوفيـقٌ مِنَ اللهِ) عَليهِمْ مَادُمْتَ على ذَلكَ» [مسلم].

---

قَالَ رسولُ الله ﷺ: «مَن أحبَّ أن يُبْسَطَ لهُ في رزْقِه وَيُنْسَأَ لـهُ في أَثَـرِهِ (يُبارَكَ له في عُمْرِه، وَيُمَدَّ لهُ في ذِكرَاهُ) فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ» [متفق عليه].

# سەردانی کەسە نزیکەکان

پێغەمبەرﷺ بەردەوام ئامۆژگاری دەکرد لەسەر بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی، وەفەرمانی دەکرد بەهاوەڵان کەلەناو خۆیانا بەسۆز بن،پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: هەر کەس باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با صیلەی ڕەحم بەجێ بهێنێ)متفق علیه.

-هاوەڵێکی پێغەمبەرﷺ ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری بە تەواوی جێ بەجێ کردبوو زۆر سەردانی خزمانی دەکرد وە زۆر بەبەزەیی بوو بۆیان،بەڵام خزمەکانی سەردانی ئەمیان نەدەکرد،وە هەڵس و کەوتیان جوان نەبوو لەگەڵیدا، ئەم هاوەڵە زۆر تووڕەو بێتاقەت بوو،ڕۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ سکاڵای کرد لە دەست خزمانی.ووتی:ئەی پێغەمبەری خوا!من کۆمەڵێ کەسی نزیکم هەیە، سەردانیان دەکەم بەڵام ئەوان سەردانم ناکەن،چاکم لەگەڵیان بەڵام ئەوان بە خراپی مامەڵەم لەگەڵ دەکەن،وەمن بە نەرم و نیانی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەم بەڵام ئەوان زۆر بە ناشیرینی و ڕەقی مامەڵەم لەگەڵ دەکەن.پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری ئەم هاوەڵە بەڕێزەی کردو فەرموی:(بەردەوام بە لەسەردان و بەجێهێنانی صیلەی ڕەحم، چونکە بە هۆیەوە ئەجرو پاداشتی گەورەت دەست دەکەوێ وە ئەوان گوناهباروخەتابار دەبن بە هۆی مامەڵەی ناشیرینیانەوە لەگەڵ تۆ، پێغەمبەر فەرموی:(ئەگەر وابێ ئەوەی تۆ وتت ئەوانەی بێزارت دەکەن سوتوی ئاگر دەخۆن، بەردەوام خوای گەورەت لەگەڵە وە هەر ئەو یارمەتیت دەدات تا تۆ بەردەوام بی لەسەر بەجێ هێنانی صیلەی ڕەحم)مسلم.

---

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: هەرکەس پێی خۆشە ڕزقی زۆر بێ وە پێوەی دیاربێ بەرەکەتی خوا لە تەمەنی و ماڵی وە یادی خێر بکرێ با صیلەی ڕەحم بەجێ بهێنێ)متفق علیه.

# بَشيرُ الخَيرِ

كانَ النَّبيُّ ﷺ يأمُرُ أصحابَهُ ـ رَضِي اللهُ عَنْهُمْ ـ إذَا زَارُوا مَريضاً أنْ يُبشِّرُوهُ بِالخَيرِ، ويَذْكُرُوا عندَهُ الكلامَ الحسنَ الذي يُطَيِّبُ نفسَهُ ويُعطِيهِ الأمَلَ.

وذاتَ يومٍ، خرجَ أحَدُ الصَّحابةِ يَزورُ صديقاً لهُ، لِيَطمئِنَّ على حالِه، فلَمَّا كانَ فِي الطَّريقِ عَلِمَ أنَّ صديقَهُ هذَا مَريضٌ، فَجعَلَ نيَّتَهُ زيارةَ مَريضٍ.

فلمَّا دخَلَ على صديقِهِ المريضِ، قالَ لَهُ: أتَيتُكَ زائِراً، وعائِداً (أيْ أزُورُ المريضَ)، ومَبَشِّراً.

فقالَ لَهُ صَديقُهُ كيفَ جمَعْتَ هذَا كُلَّهُ؟

فقالَ: خَرجْتُ وأنا أُريدُ زيارتَكَ، فعَلِمتُ بِمَرَضِكَ؛ فَكانتْ عِيادةً (أي: زِيارةَ مَريضٍ)، وأُبشِّرُكَ بشَيءٍ سمِعتُهُ مِنْ رَسولِ اللهِ ﷺ، قالَ: «إذَا سَبَقَتْ للعَبدِ مِنَ اللهِ مَنْزِلَةٌ لَمْ يَبلُغْها بِعَملِه؛ ابتَلاهُ اللهُ في جسَدِهِ أو في مالِه أو في ولَدِهِ، ثُمَّ صَبَّرَهُ حتَّى يُبلِّغَهُ المَنْزِلةَ (المَكانةَ العالِيةَ) التي سبَقَتْ لهُ منْهُ» [أحمد].

---

منْ آدابِ زيارةِ المريضِ أن يَدعُوَ الإنسانُ لهُ بالشِّفَاء، ويُذَكِّرَهُ بأجرِ الابتلاءِ بالمَرضِ وثَوابِه، ويَذْكُرَ عندَهُ الكلامَ الطَّيِّبَ، ولاَ يُطِيلَ الجُلوسَ عندَهُ إلاَّ إذا طلبَ المريضُ ذلكَ وكانَ في ذلكَ مؤازرةً لهُ.

# مژدەی خێر بدەن

پێغەمبەرﷺ فەرمانی ئەدا بەسەر هاوەڵاندا:(هەرکات سەردانی نەخۆشتان کرد مژدەی چاك بوونەوەی پێبدەن و دڵی خۆش بکەن،قسانێ بکەن کە ئەو دڵی پێی خۆش بێ وە هیوا بەخش بێ،ڕۆژێکیان، هاوەڵێك لەماڵ دەرچوو بۆ سەردانی هاوڕێیەکی تا دڵ ئارام بێ لە حاڵ و گوزەرانی، کەوتە ڕێ زانی برادەرەکەی نەخۆشە، بۆیە نیەتی لێهێنا سەردانی ئەم نەخۆشە بکات و دڵ خۆشی بکات،کاتێك چوو بۆ ماڵی برادەرە نەخۆشەکەی ووتی:ویستم سەردانت بکەم وە نەمزانی کە نەخۆشی بۆیە بڕیارمدا کە بێم و دڵ خۆشت بکەم،برادەرەکەی وتی:چۆن هەردوکیانت بەیەکەوە کۆکردەوە؟برادەرەکەی وتی:کە دەرچوم لەماڵ بە نیەتی سەردانت هاتم،کە زانیم نەخۆشی وتم: ئەوا عیادەی واجب بوو لە سەرم وە دەبێ مژدەی چاکی و باشیت بدەمێ چونکە بیستومە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:(ئەگەر بەندەیەکی خوا ویستی بە پلەیەکی بەرز بگات بەلأم بەهۆی کارو ئیشەوە پێی نەگەیشت، ئەوا خوای گەورە توشی نارەحەتی و تاقی کردنەوەی دەکات بە نەخۆشی و ماڵ فەوتان و منداڵ مردن، ئەم بەندەش ئارام دەگرێ تا خوای گەورە شادی دەکات بەو پلەیەی کە دەیویست لە پێشدا)احمد.

---

لە ئادابی سەردانی نەخۆش ئەوەیە کە چویتە لای دوعاو نزای چاك بونەوەی بۆ بخوازی، وە یادی بخەیتەوە بەوەی کە خوا تاقی دەکاتەوە تا ئەجرو پاداشتی گەورەی بە نسیب بکات، وە قسەی خۆش و باشی بۆ بکەیت و دڵ خۆشی بکەی، کەم دانیشی لەلای مەگەر نەخۆشەکە خۆی داوا بکاو حەزکا زیاتر بمێنیتەوە)

# زِيارةُ التَّعْزِيةِ

أرسَلَ النَّبيُّ ﷺ جَيْشاً إلى مُؤْتَةَ ـ على حُدود بِلادِ الشَّامِ ـ لتأديبِ الرُّومِ، وكانَ عددُ جيشِ الرُّومِ كثيراً، ولكنَّ المُسلمينَ لَمْ يَخافُوا ذلكَ.

فلَمَّا بَدأَت الحربُ، استُشهِدَ عددٌ كبيرٌ منَ المُسلمينَ، وكانَ ممَّن استُشهِدَ في هذِهِ المَعركةِ: الصَّحَابيُّ الجَليلُ جعفَرُ بنُ أبي طَالبٍ رضي الله عنه؛ ابنُ عَمِّ النَّبيِّ ﷺ فلَمَّا عَلمَ ﷺ باستشهَاد جَعْفَرٍ ذهَبَ إلى بَيتِهِ ليُواسيَ زوجَتَهُ وأبناءَهُ، فلَمَّا دخَلَ الدَّارَ أحضَرَ أولادَ جَعْفرٍ الصِّغارَ، وقَبَّلَهُمْ، فسألَتْهُ أسْماءُ ــ زَوجةُ جَعْفَرَ ـ يَا رسولَ الله! أَبَلغَكَ عَنْ جَعفرَ شَيءٌ؟

فَقالَ ﷺ: «نَعَم. قُتِلَ اليومَ».

فَبكَتْ أسْماءُ على مَوتِ زَوجِهَا وفِرَاقِه، ومَازالَ أولادُهُ صِغَاراً، فَخفَّفَ النَّبيُّ ﷺ عَنْهَا حُزنَهَا، وَوَاسَاهَا، ثمَّ رَجَعَ إلى بَيته، وقَالَ لأهله: «اِصنَعُوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعاماً، فَقَدْ شُغِلُوا عَنْ أنفُسِهِمْ» [الترمذي].

---

للتَّعزيةِ فَضلٌ عَظيمٌ، وأجرٌ كبيرٌ عندَ الله، قَالَ ﷺ: «مَا مِنْ مُؤمنٍ يُعزِّي أخاهُ بِمُصيبةٍ إلاَّ كَسَاهُ اللهُ ــ سُبحانَهُ ـ مِنْ حُلَلِ الكرَامةِ يومَ القِيامةِ» [ابن ماجه].

# سەردانی پرسە

پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی بەڕێ کرد بۆ (موئتە) لەسەر سنوری ولاتی شام تا تەمێی سوپای ڕۆم بکات، بەلام سوپای ڕۆم زۆر زۆر بوو، هەرچەندە موسوڵمانان کەم بوون بەلام هیچ نەترسان لێیان،کاتێک جەنگ دەستی پێکرد، موسوڵمانێکی زۆر شەهید بوو، یەکێ لەوانەی کە شەهید بوو لەم جەنگەدا هاوەڵی بەڕێزو خۆشەویست (جەعفەری کوڕی ئەبی تالب رضي الله عنه) ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ بوو،کاتێک هەواڵ گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ کە جەعفەر شەهید بووە،پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ ماڵی جەعفەر تا دڵخۆشی هاوسەری جەعفەرو منالەکانی بداتەوە، کاتێک چووە ژورەوە، منالەکان بچوکەکانی هاتن باوەشیان کرد بە پێغەمبەردا وە پێغەمبەر ﷺ ماچی کردن.هاوسەری جەعفەر پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی جەعفەر رضي الله عنه چی یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ شەهید کرا. ئەسماء دەستی کردە گریان بۆ مردنی مێردەکەی کە جیا بوتەوە لێی، هێشتا مندالەکانیشیان بچوکن.

-پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو لەسەر ئامۆژگاری و سوک کردنی موسیبەتەکە لەسەر ئەم ئافرەتە،پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بە ماڵی خۆیانی فەرموو:(نان و خۆراک ئامادەکەن بۆ ماڵی جەعفەر وە مەهێڵن ئەوان هیچ کارێک بکەن چونکە ئەوان سەرقاڵن) (الترمذي).

---

لە پرسەدا فەزڵی گەورە هەیە، وە پاداشتی گەورە دەدرێتەوە لە لایەن پەروەردگارەوە.پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(هەر برایەکی موسوڵمان تەعزیە لە براکەی بکات وە ئەو نارەحەتیە سوک بکات لەسەر براکەی خوای گەورە لە دوا ڕۆژدا بەرگی کەرامەت و ڕێز دەکاتە بەر ئەو بەندەیە) (ابن ماجه)

# زِيارةُ الأَبناء

تَزوَّجَ إسمَاعيلُ عليه السلام امرأةً مِنْ قبيلةِ جُرْهُمْ، فذهَبَ إليهِ وَالِدُهُ إبراهيمُ عليه السلام يَزُورُهُ، وَيطمَئِنُّ على حاله، فَلَمْ يَجِدْهُ فِي البيتِ، فسألَ امرأتَهُ عَن حالِهِمْ فَشَكَتْ لهُ الضِّيْقَ وَالفَقْرَ، فَقالَ لهَا: إذَا جاء زوجُك فاقرَئِي عليهِ السَّلامَ وَقولِي لهُ يُغَيِّرُ عَتَبَةَ بابِهِ. فلَمَّا جاء إسمَاعيلُ أخبرتْهُ، فَقالَ لهَا: ذاكَ أَبي، وَقَدْ أمَرَنِي أنْ أُفارقك. فطَلَّقَهَا، ثمَّ تزَوَّج امرأةً أُخْرَى.

وَبعدَ مُدَّةٍ، ذَهَبَ إبراهيمُ عليه السلام يَزُورُهُم، فلَمْ يَجِدْ إسمَاعيلَ فِي البَيت، فسأَلَ زَوجَتَهُ عن حالِهِمْ، فَقالَتْ: نحنُ بخَيرٍ وَسعَةٍ. فدعَا لهَمُ بالخَيرِ والبَركةِ، ثمَّ قَالَ لهَا: إذَا جاء زَوجُك فَاقرَئِي عَليهِ السَّلامَ، وَمُرِيهِ يُثَبِّتُ عَتَبَةَ بابِهِ. فلَمَّا جاء إسماعيلُ أخبَرتْهُ بمَا حدَث، فَقالَ لهَا: ذاكَ أَبي، وَأَنتِ العَتَبةُ، أَمَرَنِي أنْ أُمسِكَكِ (أي: لا أُفارِقَكِ). [البخاري].

---

يُستَحَبُّ للأَبِ وَالأُمِّ زيارةُ أبنائِهمَا للاطمئْنَان على حالِهِمْ، وَمعرفَةِ احتِياجَاتِهِمْ وَمُساعدَتِهِمْ، فَقدْ كانَ النَّبيُّ ﷺ يَزورُ بناتَهُ لِيَطمئِنَّ عليهِنَّ.

# سەردانی منالی خۆت

پێغەمبەر ئیسماعیل (ﷺ)ئافرەتێکی خواست لە قەبیلـەی جورهـەم، ڕۆژێکیـان باوکی ڕیش سپی پێغەمبەر ئیبراهیم دێتە سەردانی مـاڵی کوڕەکـەی، تـا هـەواڵی بزانێت،بەڵام ئیسماعیل لەماڵ نابێت، لە خێزانەکەی لە بارەی حـاڵ و گوزەرانیـان دەپرسێت؟ ژنەکە دەکەوێتە کوڕوزانـەوەو سـکالا کـردن لـە دەسـت فـەقیری و هەژاری! پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) دەفەرموێت:ئەگەر پیاوەکەت هاتـەوە سڵاوی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ قفڵـی دەرگـای ماڵەکـەی بگـۆڕێ.کاتێـک ئیسـماعیل (ﷺ)هاتەوە، ژنە باس و خواسـەکەی بـۆ گێڕایـەوە، ئیسـماعیل (علیـە السـلام) فەرموی:ئەوە باوکم بووە، فـەرمانی کـردووە کەلـە تـۆ جیـا ببمـەوە، تـەڵاقی دا پاشان ژنێکی تری هێنا.پاش ماوەیەکی تر حەزرەتی ئیبراهیم تەشـریفی هێنایـەوە بۆ ماڵی کوڕەکەی، بەڵام ئەم جارەش کوڕەکەی لە ماڵ نەبوو،پرسـیاری کـرد لـە ژنەکەی ئەری حاڵ و گوزەرانتان چۆنە؟ژنەکە وتی:ئیمە لە خێرو خۆشیدا دەژیـن داواکـارم خـوا خێـرو بەرەکـەتی زیـاتر برێـژێ بەسـەرمانا!،حـەزرەتی ئیـبراهیم فەرموی:ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سڵاوی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ دەرگای ماڵەکەی بـاش قـایم بکـات، کاتێـک ئیسـماعیلﷺ هاتـەوە، خێزانـی هەواڵەکـەی پـێ ڕاگەیاند،ئەویش فەرموی:ئەوە باوکم بووەو فـەرمانی پێـداوم کـەباش دەرگـای ماڵەکەم قایم کەم، واتە لە تۆ جیا نەبمەوەو دەستت لێ هەڵنەگرم)البخاری.

---

سوننەتە لەسەر دایک و باوکان سەردانی منالەکانیان بکەن تا دڵنیابن لە بـارەی حـاڵ و گوزەرانیـان، وە پـرس لـە بـارەی پێویسـتیەکانیان تـا بۆیـان دابـین بکەن.پێغەمبەری خوا ﷺ سـەردانی کچـەکانی دەکردتـا ئاگـاداری بـارو دۆخیـان بێت.

# مُدَاعبَةُ أَولادِ المَزُورِ

كانَ النَّبيُّ ﷺ شديدَ التَّواضُعِ، رَفيقاً بِأصحابِهِ، يَزُورُهُمْ وَيَسألُ عَن شُؤُونِهِمْ، ويُداعبُ أولادَهُمْ وَيُلاطِفُهُمْ في حُبٍّ وَتودُّدٍ، وَذلكَ تَأليفاً لقُلوبِهِم، وحِرْصاً على إشاعةِ رُوحِ الحُبِّ والمرحِ بينَهُمْ.

وكانَ ممَّنْ يَزورُهُمْ: أبو طَلْحةَ وزوجَتُهُ الرُّمَيْصاءُ وَابنُهَا أَنَسُ بنُ مالكٍ؛ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ.

وكانَ لأَنسٍ أَخٌ، اسمُهُ: «أبو عُمَيرٍ»، فكانَ النَّبيُّ ﷺ يُحِبُّهُ وَيُداعِبُهُ.

وكانَ لأبي عُمَيرٍ طائرٌ صَغيرٌ، فمَاتَ هذَا الطَّائرُ، فكانَ النَّبيُّ ﷺ يَقولُ لأَبِي عُمَيرٍ مُداعِباً: «يَا أَبَا عُمَيرٍ؛ مَا فعَلَ النُّغَيرُ (الطَّائرُ الصَّغيرُ)»؟

وَاستَمرَّ النَّبيُّ ﷺ يَزُورُهُمْ وَيُصلِّي عندَهُمْ وَيَدعُوْ لَهُمْ بالخَيرِ وَالبَركة حتَّى تُوفِّيَ ﷺ. [متفق عليه].

---

مِنْ آدابِ الزِّيارةِ: إِخلاصُ النِّيَّةِ، وَاختيارُ الوَقتِ المُناسبِ، وَالدُّعاءُ لأهلِ المَزُورِ، ومُلاطَفةُ أطفالِ المَزُورِ ومُدَاعبَتُهُمْ.

# یاری کردن لەگەڵ منالی میوان

پێغەمبەرﷺ زۆر لەخۆ بوردە بوو،زۆر هەڵس و کەوتی دەکرد لەگەڵ هاوەڵاندا،سەردانی دەکردن و پرسیاری دەکرد لە گوزەرانیان،وەیاری دەکرد لەگەڵ منالەکانیان و زۆر دەیدواندن و خۆشی دەویستن و بەم کارەی دڵی منالانی رادەکێشا بەلای خۆیدا و هەمیشە کاری بۆ ئەوە دەکرد رۆحی خۆشەویستی پەرە پێ بدات لە ناویانا.رۆژێکیان ـ ئەبو تەڵحەو خێزانەکەی و هەردوو کورەکەیان واتە(ئەنەس و ئەبو عومەیر هاتن بۆماڵیان)پێغەمبەری خواﷺ عومەیری زۆر خۆش دەویست دەستی کرد بە یاریکردن و گاڵتە لەگەڵ کردنی.عومەیر باڵندەیەکی بچوکی هەبوو یاری لەگەڵ دەکرد، باڵندەکە مرد، پێغەمبەرﷺ زوو زوو هەواڵی دەپرسی و دەیفەرموو عومەیر باڵندەکەت چیکرد؟

پێغەمبەرﷺ بەردەوام سەردانی ماڵیانی دەکردو دوعای خێرو خۆشی و بەرەکەتی بۆ دەکردن تا وەفاتی کرد(متفق علیه).

---

لە ئادابەکانی سەردان:

١/پاک کردنەوەی نیەت واتە لەبەر خوای گەورە بێت.

٢/هەڵبژاردنی کاتی شیاو بۆ سەردان کردن.

٣/دوعا بۆ خاوەن ماڵ یان ئەو میوانانەی کە سەردانت دەکەن.

٤/یاری و گەمە لەگەڵ منالان لەکاتی چونی بۆ ماڵیان، یان هاتن بۆ ماڵتان.

# زِيارةُ أَهلِ الخَيرِ

كَانَ النَّبيُّ ﷺ حَرِيصاً على زيارةِ أهلِ الخَيرِ، وكانَ يَحُثُّ أصحابَهُ على زِيارتِهِمْ وَالجُلوسِ معهُمْ. فَقَدْ كانَ النَّبيُّ ﷺ يَزورُ السَّيِّدةَ أمَّ أيمَنَ ـ رَضِي اللهُ عَنْهَا ـ ويَتَفقَّدُ أحوالَهَا، ويَجلِسُ عِندَهَا، فلَمَّا تُوفِّيَ النَّبيُّ ﷺ قَالَ أبو بكرٍ الصِّدِّيقُ لِعُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: انطَلِقْ بنَا إلى أُمِّ أيمَنَ نَزُورُهَا كمَا كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يَزُورُهَا.

فوافَقَهُ عُمَرُ على ذلكَ، وذهَبَا معاً إلى بَيتِ أُمِّ أيمَنَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

فلَمَّا دخَلاَ عَليهَا وَجلَسَا عندَهَا بكَتْ، فَقالاَ لهَا: مَا يُبكِيكِ؟ مَا عِندَ اللهِ خيرٌ لِرسولِهِ ﷺ.

فقَالَتْ: مَا أَبكِي أَنْ لاَ أَكُونَ أعْلَمُ أنَّ مَا عِندَ اللهِ خَيرٌ لِرَسولِهِ ﷺ (أي: مَا أبكِي لِهذَا السَّببِ)، ولَكِنْ أَبكِي أنَّ الوَحْيَ (نُزولَ القُرآنِ) قَدِ انقَطَعَ مِنَ السَّماءِ. فَبَكَيَا معَهَا على ذلكَ. [مسلم].

---

يُستحبُّ لِلمُسلِمِ أنْ يُداوِمَ على زيارَةِ أهلِ الخيرِ ومجالستِهِمْ، قَالَ تَعالَى: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾ [الكهف:٢٨].

# سەردانی کردنی چاکەکاران

پێغەمبەرﷺ زۆر داکۆکی دەکرد بۆ سەردانی کردنی خەڵکی چاك و باش و دانیشتن لەگەڵیان، وە زۆر هانی هاوەڵانی دەدا کە زیارەتی ئەو کەسانە بکەن و دانیشن لەگەڵیان، پێغەمبەرﷺ زۆر سەردانی -ئوم ئەیمەنی دەکردو پرسیاری دەکرد لە بارەی ژیانیەوە، کاتێک پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد -ابو بکرؓ فەرمووی بە عومەری کوڕی خەتاب -(ؓ)بابچین سەردانی ئوم ئەیمەن بکەین چونکە پێغەمبەرﷺ بەردەوام سەردانی دەکرد.عومەر ڕازی بوو، ڕۆشتن بۆ ماڵی ئوم ئەیمەن ؓکە چونە ماڵی و دانیشتن، ئوم ئەیمەن دەستی کردە گریان.پرسییان بۆچی دەگری؟لای خوای گەورە باشترو چاکترە بۆ پێغەمبەرﷺ فەرمووی:بۆ ئەوە ناگریم کە بۆ پێغەمبەر ئێرەی باشتر بوو یان گەڕانەوەی بۆلای پەروەردگار بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە نیگا وەستا، واتە:ناردنە خوارەوەی قورئان وەستاو کۆتایی پێ هات،ئەبوبکرو عومەریشؓ دەستیان کرد بەگریان لەگەڵ ئوم ئەیمەن) (مسلم).

---

سوننەتە موسوڵمان بەردەوام سەردانی ئەو کەسە چاکانە بکات وە دانیشن لەگەڵیان.خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ئارام بگرەو خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەر زاریانە لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا، مەبەستیانەو دەیانەوێت کە ئەو زاتە لەخۆیان ڕازی بکەن﴾ (سورەتی الکهف ٢٨)

# زِيارةُ القبورِ

ذاتَ يَومٍ؛ كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يَسيرُ معَ أصحابِهِ، فَمَرُّوا علَى قَبرَيْنِ فِيهِمَا رجلانِ يُعذَّبَانِ.

فقالَ رسولُ اللهِ ﷺ لأصحابِهِ: «إنَّهُمَا لَيُعذَّبَانِ، ومَا يُعذَّبَانِ فِي كبيرٍ، أمَّا أَحدُهُمَا فكانَ لا يَستَترُ مِنَ البولِ، وأمَّا الآخرُ فكانَ يَمشِي بِالنَّميمةِ».

ثُمَّ أخذَ رسولُ اللهِ ﷺ جريدةً خضراءَ رطبةً، فشقَّهَا نِصفَيْنِ، ثُمَّ غَرَزَ في كُلِّ قبرٍ واحدةً.

فقالَ الناسُ: يَا رسولَ اللهِ، لِمَ صَنَعتَ هذَا؟

فَقالَ ﷺ: «لعلَّهُ أنْ يُخفَّفَ عنهُمَا مَا لَمْ يَيبسَا (أيْ: يَرحَمُهُمَا اللهُ طَالمَا أنَّ الجريدةَ خَضراءُ لَمْ تَيْبَسْ)» [البخاري].

وهكذَا يُعلِّمُنَا النَّبيُّ ﷺ أنْ لا نَستَهِينَ بِصَغَائرِ الذُّنوبِ، فَمُعظَمُ النَّارِ مِنْ مُستَصغَرِ الشَّرَرِ.

---

قُلْ عندَ زيارةِ القُبورِ: «السَّلامُ عَليكُمْ أهلَ الدِّيارِ مِنَ المُؤمنينَ والمُسلمِينَ، ويَرحَمُ اللهُ المُستَقدمِينَ والمُستأخِرِينَ، وإنَّا إنْ شاءَ اللهُ بِكُمْ لَلاَحقُونَ».

# سەردانی گۆڕستان

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵان چوونە سەردانی گۆڕستان، بە لای دوو گۆڕدا ڕۆشت فەرمووی:(خاوەنی ئەم دوو گۆڕە ئازار دەدرێن،لەسەر گوناهی گەورەش نییە!!،یەکەمیان بەهۆی ئەوەوە کە خۆی لە میز نە پاراستووە (واتە:تاراتی باش نەگرتووە)،دووەمیان بەهۆی گوێگرتن لەقسەی خەڵك و هێنان و بردنی)پاشان پێغەمبەرﷺ چیلکەیەکی تەڕی هێناو کردی بە دوو کەرتەوە هەر چڵەی چەقاند بە گۆڕێکیانا.هاوەڵان ووتیان:ئەی پێغەمبەری خواﷺ بۆچی وات کرد؟پێغەمبەرﷺ فەرمووی:بە ئومێدی ئەوەی سزایان لەسەر سوك بێت.وە خوا ڕەحمیان پێبکات تا ئەو چیلکە وشك دەبێت.)البخاری. هەروەها پێغەمبەرﷺ ئاگادارمان دەکات کە گوناهی بچوك بەکەم نەزانین، چونکە ئەو ئاگرە گەورەی دەبینی سەرەتا ئاگرێکی بچوك و بڵێسەیەك بووە.

---

لەکاتی سەردانی گۆڕستانا بڵێ (سلاوی خواتان لێبێت ئەی کۆمەڵگای ئیمانداران و موسوڵمانان، وە خوا ڕەحم بەوانە بکات کە پێشکەوتوون وە ئەوانەش کە لەمەو دوا دێن،وەبەپشتیوانی خوا ئێمەش دێین بۆ لاتان.

# فَضْلُ الزِّيارةِ

مَرِضَ الحسَنُ بنُ علي بنِ أبي طَالبٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، فذهَبَ أبو مُوسى الأَشعَريُّ رضي الله عنه لِيَزُورَهُ.

فلَمَّا وصَلَ إلى الدَّارِ سألَهُ الإمامُ عليٌّ رضي الله عنه عَن سبَبِ زيارتِهِ لهُمْ، وَهل هِي زِيارةٌ خاصَّةٌ بالمَريضِ أمْ زِيارةٌ عامَّةٌ لأهلِ البيت كلِّهِمْ، فَأخبَرَهُ أبو مُوسى أنَّ المَقصُودَ هو زِيارةُ المريضِ؛ وهُوَ الحسَنُ رضي الله عنه.

فَبَشَّرَهُ عليُّ بنُ أبي طالبٍ بِفَضلٍ عَظيمٍ وَأجْرٍ كَبيرٍ بِسببِ زيارةِ المريضِ، وقالَ لهُ: سمِعتُ رسولَ اللهِ ﷺ يقولُ: «مَنْ عادَ (زارَ) مَريضاً بُكْراً (في الصَّباحِ) شَيَّعَهُ (سارَ معَهُ) سَبْعُونَ ألفَ مَلَكٍ، كُلُّهُمْ يَستَغفِرُ لَهُ حتَّى يُمْسِي، وكانَ لهُ خَريفٌ (مكانٌ) في الجنَّةِ، وَإنْ عادَهُ مَساءً شَيَّعَهُ سَبْعُونَ ألفَ مَلَكٍ، كُلُّهُمْ يَستَغفِرُ لَهُ حتَّى يُصبِحَ، وكانَ لَهُ خَريفٌ فِي الجنَّةِ» [أحمد].

---

لِلزِّيارةِ فَضْلٌ كَبيرٌ، قَالَ ﷺ: «مَن عادَ مَريضاً أو زارَ أخاً لهُ في اللهِ ناداهُ مُنادٍ أنْ طِبْتَ وطَابَ مَمْشَاكَ وتَبَوَّأتَ (نِلْتَ) مِنَ الجنَّةِ مَنزِلاً (مكاناً)» [الترمذي].

# فەزڵی سەردانی نەخۆش

حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب ﷺ نەخۆش دەکەوێ،ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەچێت بۆ سەردانی.کاتێک گەیشتە ماڵیان ئیمام عەلی ﷺ پرسی لە هۆکاری سەردانەکەی، ئایا بەتایبەت هاتوی بۆ سەردانی نەخۆش یان بۆ سەردانی ماڵەوە هاتووی؟ئەبو موسا فەرموی:(بەتایبەت بۆ سەردانی حەسەن هاتووم کە نەخۆشە)

-ئیمامی عەلی مژدەی دا بە ئەبو موسا-کەتوشی فەزڵی گەورەو پاداشتی گەورە بووی بە هۆی سەردانی ئەم نەخۆشەوە.فەرموی —بیستومە لە پێغەمبەرﷺ کە دەیفەرموو(هەرکەس لە ڕۆژدا سەردانی نەخۆش بکات حەفتا هەزار فریشتە دوعای بۆ دەکەن و داوای لێخۆشبونی بۆ دەکەن وە داوای چونە ناو بەهەشتی بۆ دەکەن، ئەگەر سەردانەکەی لە شەودا بوو،ئەوا حەفتا هەزار فریشتە داوای لێخۆش بونی بۆ دەکەن هەتا بەیانی وەداوای چونە بەهەشتی بۆ دەکەن)(احمد).

---

-لەسەردانی نەخۆشا پاداشتێکی گەورە هەیە (هەرکەس سەردانی نەخۆشێ بکا یان سەردانی برایەکی بکا لەبەر خاتری خوا بانگ خوازێک بانگ دەکا دەڵێت پیرۆزت بێ ئەو ڕۆشتنەوە خوا لێت خۆش بێ بە ڕاستی شوێنی بەرز و بڵندت لە بەهەشت بەدەستهێنا) (الترمذی).

# قِصَصُ آدابِ الزِّيارةِ

الزِّيارةُ مِنَ الأُمورِ التي تَجِبُ على كلِّ مُسلمٍ، خَاصَّةً في مناسباتِ الفرَحِ أوِ الحُزنِ، قالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «مَثَلُ المُؤمنينَ في تَوَادِّهِمْ وتراحُمِهِمْ وتعاطُفِهِمْ مَثَلُ الجسَدِ، إذَا اشتكَى مِنْهُ عُضوٌ تَدَاعَى لهُ سائرُ الجسَدِ بالحُمَّى والسَّهَرِ» [متفق عليه].

وَللزِّيارةِ ثَوَابٌ عَظيمٌ عندَ اللهِ، قَالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «إنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يَقولُ: قَدْ حَقَّتْ مَحبَّتي لِلَّذينَ يَتَحابُّونَ مِنْ أجلِي، وَحَقَّتْ مَحَبَّتِي لِلَّذينَ يَتَزاوَرُونَ مِنْ أجلِي» [أحمد].

وَالزِّيارةُ تَشمَلُ زِيارةَ التَّهْنِئَةِ، وَزِيارةَ التَّعْزِيَةِ، وَزِيارةَ المَرِيضِ، وَزِيارةَ القُبورِ.. إلخ، وَلِكُلِّ نَوعٍ مِنْ هذهِ الزِّياراتِ آدابٌ تَخُصُّهَا.

وَهذِهِ القِصَصُ ـ التي قَرَأْنَاهَا ـ تَجمَعُ لنَا الكثيرَ مِنْ آدابِ الزِّيارةِ؛ التي يَجِبُ أنْ يَلتزِمَ بهَا المُسلِمُ أثناءَ زِيارَتِهِ.

* * * * *

# چیرۆکی ئادابەکانی سەردان

سەردان کردن یەکێکە لە ئەرکی موسوڵمان،بەتایبەت لەکاتی خۆشی وناخۆشیدا،پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(وێنەی موسوڵمان لە پشتگیری و خۆشەویستی و سۆزداری وێنەی یەك لاشە وایە،کاتێك ئەندامێکی لاشە بئێشی هەموو لاشە دێشێ و توشی تاو ئازار دەبێت)متفق علیه.

-وەلە سەردانی کردنا پاداشتی گەورە هەیە بۆمان لەلایەن خوای گەورەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(خوای گەورە فەرمویەتی (خۆشەویستیم واجب بوو بۆ ئەو کەسانەی کەلەبەر من یەکتریان خۆش دەوی،وە خۆشەویستی من واجبە بۆ ئەو کەسانەی کەسەردانی یەکتر دەکەن لەبەر خاتری من) (احمد).

سەردانی کردن چەند جۆرێکە:

١/سەردانی خۆشی و شادی. وەك: ژن هێنان و شوکردن و منداڵ بوون و گەڕانەوە لە سەفەرو....

٢/سەردانی تەعزیەو پرسەو ناڕەحەتی.

٣/سەردانی نەخۆش.

٤/سەردانی گۆڕستان.

٥/سەردانی ئاسایی بۆ دروست کردنی گیانی تەبایی.

وە چەندین سەردانی تر....وەهەریەکێ لەم جۆرانە ئاداب و ڕەوشتی تایبەتی خۆی هەیە ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانەی خوێندتەوە —بریتی یە لە کۆکردنەوەی چەندین ئادابی سەردانەکان،پێویستە موسوڵمان پەیوەست بێ بەم ئادابانەوە لەکاتی سەردانەکاندا.

# ئادابی زانست و زانیاری

نوسینی: أشرف عبدالرؤوف قدح

وەرگێڕانی: م. ناصح محمد شاربازێری

# التَّواضعُ

ظنَّ نبيُّ اللهِ مُوسى عليه السلام أنَّهُ لا يُوجَدُ أحدٌ مِنَ النَّاسِ أعلَم منْهُ، فَأوحَى اللهُ إليهِ بأنَّ هُناكَ مَنْ هُوَ أَعلَمُ منْهُ، ودلَّهُ علَى مكانِه، وأمرَهُ أنْ يَحملَ معَهُ حُوتاً، وأخبرَهُ اللهُ بأنَّهُ سيُقابِلُ الرَّجلَ الصالِحَ العالِمَ في المَكانِ الذي سَيفقدُ فيهِ الحوتَ.

وفعلَ مُوسى عليه السلام مَا أمرَهُ اللهُ بهِ، وسارَ إلى المَكانِ المُحدَّدِ علَى ساحِلِ البَحرِ

وبعدَ فترةٍ مِنَ السَّيرِ، سَألَ مُوسَى خادِمَهُ عَنِ الحوتِ، فَقالَ الخادِمُ: ﴿قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَـٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾ [الكهف: ٦٣].

فَقالَ مُوسى عليه السلام: ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ﴾ ورجعَ مُوسَى عليه السلام وخادِمُهُ إلى المَكانِ الذي تركَا فيهِ الحوتَ، فَوجَدَا الرَّجلَ الصالِحَ العالِمَ "الخضرَ"

وتعلَّم مُوسى منْهُ أشياءَ كثيرةً، لَمْ يكُنْ يَعلَمُهَا مِنْ قَبْلُ. [البخاري].

---

أمرَنَا اللهُ ـ سبحانهُ ـ بِأنْ نطلُبَ العِلْمَ دَائماً، مَهمَا بلغنَا مِنْ مَراتبِ العِلْمِ. قالَ تَعالى: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾ [طه: ١١٤].

# خۆبەکەم زانی

پێغەمبەرموسی (علیه السلام). وا گومانی برد کە لەناو خەڵك دا کەس لەو زانا تر نییە، خوای گەورە وەحی(نیگا)ی بۆ کرد کە کەسێك هەیە لەو زانا ترە، وەشوێنی ئەو کەسەی بۆ دیاری کرد و فەرمانی پێکرد ماسیەك لەگەڵ خۆی ببات کە ماسیەکەی لێ ون بوو، توشی پیاو چاك و زاناکە دەبێت.

موسا(علیه السلام) ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردبوو ئەنجامیدا و بەرەو شوێنی دیاری کراو لەکەناری دەریا بەڕێکەوت، پاشماوەیەك لەڕۆیشتن، موسا (علیه السلام) پرسیاری لە خزمەتکارەکەی کرد کە ماسیەکە چی لێهات؟ وتی: ئەزانی کاتێك چوینە لای بەردەکە بۆ ئیسراحەت، ماسیەکە زیندو بووەو خۆی خستە ناو ئاوەکەو ڕۆیشت، بەڕاستی شەیتان لەبیری بردمەوە کە بەتۆی بڵێم، موسا (علیه السلام) فەرموی: ئەوە ئەو شوێنەیە کە ئێمە بۆی هاتوین ئینجا لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی ماسی یەکەی تیا بەجی هێشتبو، توشی پیاو چاك و زاناکە بون، (خضر) ی داناو زانا

موسا(علیه السلام) شتی زۆرری لێوە فێر بوو کەپێشتر نەیدەزانی (البخاري)

---

خوای گەورە فەرمانی پێکردوین کە هەمیشەو بەردەوام بەشوێن زانستدا بگەڕێین با پلەی زانستمان هەرچەند بێت، خوای گەورە دەفەرموێت ((بڵی پەروەردگار زانستم زیاد بکەیت)) (طه/ ١١٤)

# ثَوابُ العلمِ

ذاتَ يـومٍ، دخـلَ رسـولُ اللهِ ﷺ المَسـجدَ، وَحـدَّثَ الصحابةَ الذينَ كَانُوا في المسجِدِ، فقالَ: «أيُّكُـمْ يُحِـبُّ أَنْ يَغْدُوِ كلَّ يومٍ إلى بُطْحَانَ أو العقيقِ (مَكانَانِ)، فَيأتِي بِناقتَينِ كَوْمَاوينِ (لهُمَا سَنامَانِ عَاليانِ، يَعنِي أَنَّهُمَـا مُتميزتَـانِ) فِـي غَيرِ إِثمٍ وَلا قَطْعِ رَحمٍ؟».

فأُعجِبَ الصَّحابةُ بهذَا العَرضِ الـذِي عَرَضَـهُ الرَّسـولُ عَليهِمْ، وَقالُوا يَا رسولَ اللهِ كُلُّنَا نُحِبُّ ذلكَ.

فَقالَ ﷺ «أفَلا يَغدُو أَحدُكُمْ إلى المَسـجدِ فـيَعْلَمَ أو يَقرأَ آيتينِ مِنْ كِتابِ اللهِ خيرٌ لهُ مِنْ نَاقتَيْنِ، وَثلاثـاً خَـيرٌ لَـهُ مِنْ ثلاثٍ، وَأربعاً خيرٌ لَهُ مِـنْ أربـعٍ، وَمِـنْ أعـدادِهِنَّ مِـنَ الإبِلِ» [مسلم].

---

قالَ عليٌّ بنُ أَبي طالبٍ ـ كرَّمَ اللهُ وجهَهُ ـ : العِلْمُ خَيرٌ مِـنَ المَـالِ؛ العِلْمُ يَحرسُكَ وأنتَ تَحرسُ المالَ. [أبو نعيم في الحلية].

# پاداشتی زانست

ڕۆژێکیان پێغەمبـەری خـواﷺ چـوە مزگەوتـەوە کاتێـک هـاوەڵان لەمزگەوتـدا قسەیان دەکرد، پێغەمبەرﷺپێ فەرموون: کام لەئێوە؟ پێ ی خۆشە بەیانیان زوو بۆ{بطحان، یان العقیق} کە دوو جێگا بوون لە دەرەوەی مەدینە، بەدوو حوشـتری قەڵەوی بەرز واتە زۆر چاک بهێنێ توشی گوناە و تاوانیش نەبێت

هـاوەڵان زۆر سـەریان سـوڕما لـەم پێشـنیارە باشـەی پێغەمبـەرﷺ هـەمویان وتیان: بەڵێ گشتمان پێمان خۆشە، فەرموی: ئایا نازانن کـە بـەیانیان زوو بچـن بۆ مزگەوت دوو ئایـەت فێـربن یـان بخـوێنن لـەقورئانی پـیرۆز باشـترە لـە دوو حوشتر، وەخوێندنی سێ ئایەت لە سێ حوشتر چاکترە، وە چوار لە چـوار وە هـەر کەسێ وبیەوێ زیاتر بکات وشترەکانی زۆرتر دەبێت (مسلم)

---

پێشەوا (علی) ﷺ دەفەرموێت: زانست چاکترە لە مـاڵ زانسـت پارێزگاریـت دەکات، بەڵام ماڵ دەبێت پارێزگاری لێ بکەیت. (أبو نعم فی الحلیة)

# طَالبُ العِلْمِ

كَانَ قَبيصَةُ بنُ المُخارقِ رضي الله عنه شَيخاً كَبيراً، ولَكنَّ كِبرَ السِنِّ لَمْ يَمنعْهُ مِن طَلَبِ العلْمِ.

وذَاتَ يومٍ، ذهبَ إلى رسولِ اللهِ ﷺ، فلَمَّا رآهُ ﷺ قَالَ لَهُ: «مَا جاءَ بِكَ؟!».

فَقالَ قُبيصَةُ: كَبُرَ سنِّي، وَرَقَّ عظمِي؛ فَأتيتُكَ لتُعَلِّمَني مَا يَنفَعُني اللهُ به.

ففرحَ رسولُ الله ﷺ بإقبال قُبيصه على العِلْمِ وهوَ شيخٌ كبيرٌ؛ فَقالَ لهُ: «مَا مررتَ بحَجَرٍ ولا شَجَرٍ ولا مَدَرٍ (يعني الطُوبَ اللَّبِنَ) إلاَّ استغفَرَ لكَ».

ثم بدأ الرَّسولُ ﷺ يُعلِّمُهُ مَا يَنفعُهُ، فَقالَ لَهُ: «يَا قُبيصَةُ! إذَا صلَّيتَ الصُّبحَ، فَقُلْ ـ ثلاثاً ـ سُبحانَ الله العَظيمِ وبِحمدِه.. تُعَافَى مِنَ الْعَمَى والجذامِ والفَالجِ، يَا قُبيصَةُ! قُلْ: اللهمَّ إنِّي أسألُكَ ممَّا عندَكَ، وأَفضْ عليَّ مِنْ فضلكَ، وانْشُرْ عليَّ مِنْ رَحمَتِكَ، وأنزِلْ عليَّ مِنْ بَركتكَ» [أحمد].

---

العِلْمُ طَرِيقٌ إلى مَعرِفَةِ اللهِ وخَشيتِهِ، قَالَ تَعالَى: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾[فاطر:٢٨].

# فێرخواز

(قوبیصە کوڕی المخارق) ڕەزای خوای لێ بێت پیاوێکی پیر بوو، بەڵام بەسالاً چونەکەی وای نەکرد واز لە وەرگرتنی زانست بێنێت. چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بۆچی هاتوی؟ قوبەیصە ووتی: تەمەنم زۆر بووە، ئێسکەکانم لاواز بووە، هاتوم شتێکم فێر بکەی سوودم پێبگەیەنێ لای خوای گەورە! پێغەمبەر ﷺ دڵخۆش بوو کە بەپیری هاتووە زانست وەربگرێ. پێی فەرموو: {بەلای هیچ دارێك و بەردێکدا و دیوارێکدا نەڕۆیشتوی هەمویان داوایی لێ خۆش بونیان بۆ کردویی} دوایی پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەفێر کردنی ئەوەی سودی پێی دەگەیەنێ فەرموی: {ئەی قوبیصە! کاتێك نوێژی بەیانیت کرد سێ جار بڵێ(پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە وە ستایشی ئەو دەکەم کە پاراستومی لە نابینایی و گولی و ئیفلیجی، ئەی قوبیصە بڵێ: خوایە داوای ئەوە دەکەم کە لەلای تۆیە، وە برێژە بەسەرما لە فە ضلی خوَت، وە بەر سوزی خۆتم بخە، وە بم خەرە بەر بەرەکەتی خۆت،)} (أحمد)

---

زانست ڕێگەی ئاشنا بونە بە خوا دەبێتە مایەی خەشیەتی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: تەنها زاناکان لەناو بەندەکاندا لەخوا ترسن ملکەچی خوات.

# الرِّفقُ فِي التَّعلِيمِ

صلَّى رسولُ الله ﷺ بالنَّاسِ يَوماً، فَعطَسَ رَجلٌ في أثناءِ الصَّلاةِ، فقالَ لهُ مُعاويةُ بنُ الحَكَمِ رضي الله عنه: يَرحمُكَ اللهُ. فنظرَ إليهِ بَعضُ النَّاسِ ليَسكُتَ. فقالَ مُعاويةُ لهُمْ: مَا لكُمْ تَنظرونَ إليَّ هكذَا؟!

فَضربَ الصَّحابةُ بأيديهِمْ علَى أفخاذِهِمْ؛ لِينبِّهُوهُ إلى عدمِ الكلامِ في الصَّلاةِ، فسكتَ.

وبعدَ الصَّلاةِ، قالَ لهُ النَّبيُّ ﷺ: «إنَّ هذهِ الصَّلاةَ لا يَصلُحُ فِيهَا شيْءٌ مِنْ كَلامِ النَّاسِ، إنَّما هِي التَّسبيحُ وَالتَّكبيرُ، وقِراءةُ القُرآنِ».

قَالَ مُعاويةُ: فَواللهِ مَا رأيتُ أحداً قبلَهُ ولا بعدَهُ أحسنَ تَعليماً منْهُ؛ فَواللهِ مَا كَهَرنِي (أي: مَا عَبسَ فِي وَجهِي)، وَلا ضَرَبَنِي، وَلا شَتَمَنِي. [مسلم].

---

يجبُ علَى طالبِ العلْمِ أن يستَفيدَ مِنْ ملاحَظاتِ العُلَماءِ، وعلَى المُعَلِّمِ أنْ يكُونَ رَفيقاً بالمُتعلِّمِ مِنْ غيرِ تَهَاونٍ، قويّاً مِنْ غيرِ قَسْوةٍ.

# نەرم و نیانی لە فێرکردندا

ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد بۆ خەڵکی، لەکاتی نوێژەکەدا پیاوێک پژمی، (معاویە کوڕی الحکم) ﷺ فەرموی: (خوا ڕەحمەت پێ بکات) هەندێک لەهاوەڵان تەماشایان کرد تاکو بێدەنگ بێت. بەڵام معاویە ووتی: بۆچی سەیرم دەکەن بەم شێوەیە؟ هاوەڵان کێشایان بەڕانیاندا تا ئاگاداری بکەنەوە لەکاتی نوێژ خوێندندا قسەکردن قەدەغەیە تا بێ دەنگ بیت، ئەویش بێدەنگ بوو.

لەدوای نوێژ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((لەکاتی نوێژ خوێندن دا نابێت هیچ قسەیەک بکەیت لەگەڵ خەڵکیدا، تەنها تەسبیحات و الله و اکبر و خوێندنی قورئان نەبێت)) معاویە ﷺ فەرموی: (سوێند بەخوای گەورە هیچ کەسێکم نەدیوە ئەوەندەی پێغەمبەر بەباشی فێرت بکات و(اللّه) نەڕوی گرژ کرد، نەلێی دام، نەقسەشی پێ ووتوم)

---

پێویستە فێرخواز سوود لە تێبینیەکانی مامۆستاکەی وەربگرێت، لەسەر مامۆستاش پێویستە نەرم و نیان بێت بە فێرخوازەکە و کەمتەرخەم نەبێت، بەهێز بێت بەڵام توند نەبێت.

# حُبُّ العِلْمِ

طلَبَ الأطفالُ مِنْ زَميلِهِمْ أنْ يلعَبَ معَهُمْ؛ فرفَضَ، فلَمَّا أخذُوا يُلِحُّونَ عليهِ وَيحاوِلُونَ إجبَارَهُ على اللَّعبِ معهُمْ بكَى.

وَرآهُمْ شيخٌ كبيرٌ صالحٌ، فاقترَبَ مِنهُمْ، وعرَفَ أنَّهُمْ يُرِيدُونَ أن يأخذُوا زميلَهُمْ لِيلعَبَ معَهُمْ، ولكنَّهُ كانَ يَبكِي لِيَترُكُوهُ كَي يتفرَّغَ لقراءة القرآنِ؛ التي كانَ يُفَضِّلُهَا على اللَّعبِ معَ أصحابِهِ.

أُعجِبَ الشَّيخُ بهذَا الصَّبيِّ، وذهَبَ إلى مُعلِّمِهِ وَوالِدِهِ، وقَالَ لَهُمَا: إنِّي أَرجُو أنْ يَكُونَ هذَا الصَّبيُّ أعلَمَ أهلِ زمانِه وَأزهَدِهِمْ.

وَمنذُ ذلكَ اليومِ، اهتَمَّ والِدُ الصَّبيِّ بابنِهِ، وَفرَّغَهُ لطلَبِ العِلْمِ.

وَلمَّا كَبُرَ الصَّبيُّ أصبَحَ مِنْ كبارِ عُلَماءِ الدِّينِ.. إنَّهُ الإمامُ يَحيَى بنُ شَرَفِ النَّوَويُّ، صَاحِبُ كتابِ (رياضِ الصَّالحينَ)، وَشارِحُ صَحيحِ الإمامِ مسلمٍ

---

إذَا أخطأَ المُعَلِّمُ في مسألةٍ مِنَ المسائلِ، فعَلَى المتَعلِّمِ ألاَّ يستَحِيْ، ويُراجِعَهُ فيسألَهُ عَنِ الخطأ وَالصَّوابِ بأسلوبٍ مُهذَّبٍ.

# خۆشەویستی زانست

کۆمەڵێک منالْ داوایان کرد لە هاوڕییەکیان یاریان لەگەڵ بکات، بەلاّم یاری لەگەڵ نەکردن، دوای ئەوەی زۆریان لێکرد هەتا یاریان لەگەڵدا بکات بۆیە گریا.

پیاو چاکێ پیر بینی، بەلایەوە سەیر بوو ئەم ناچێت یاری لەگەڵ منالەکاندا بکات، ئەم منالە دەگری تا هاوەڵەکانی وازی لی بێنن دەس بکات بە قورئان خوێندن بەلایەوە بەرزو پیرۆز تر بوو قورئان بخوێنی نەک لەگەڵ هاوڕێکانیدا یاری بکات.

بۆیە پیاوە پیرەکە چووە لای و باوکی مامۆستاکەیی، ئامۆژگاری کردن پێی وتن: ئومێدم وایە ببێتە زاناو لەخوا ترسی سەردەمی خۆی، ئیتر باوکی لەو کاتەوە گرنگی زۆری بە منالەکەی دا، دوای ئەوەی ئەم منالە گەورە بوو، بووە یەکێک لەزانا گەورەکانی ئەو سەردەمە.. ئەویش ئیمامی نەوەوی بوو (يحي بن شرف النوي) خاوەنی کتێبی (رياض الصالحين) وشرح (صحيح الامام مسلم)

---

ئەگەر مامۆستا لە بابەتێکدا بە هەڵەدا چوو، پێویستە قوتابی و فێرخواز شەرم نەکەن و دوبارەی لێبکاتەوە و بەشێوازێکی جوان پرسیاری ڕاستی یان هەڵەی بابەتەکەی لێ بکات.

# إكرامُ العلمَاءِ

كَانَ صحابةُ رسُولِ الله ﷺ أشدَّ حِرْصاً على معرفةِ أُمورِ دِيْنِهِمْ، فَكانُوا يُقبِلُونَ على طَلَبِ العِلْمِ، وَيواظِبُونَ على حُضُورِ مَجالسِ العلْمِ.

وقَدْ علَّمَهُمْ رسولُ الله ﷺ أنَّ احتِرامَ العُلماءِ واجِبٌ على كلِّ مُسلِمٍ ومسلِمَةٍ.

وَفي يومٍ مِنَ الأيَّامِ، صلَّى زَيدُ بنُ ثابتٍ رضي الله عنه على جِنَازةٍ، ثُمَّ أحضَرُوا لهُ بغلَتَهُ ليَركَبَهَا.

فلمَّا رَأى الصَّحابيُّ الجَليلُ عبدُ اللهِ بنُ عبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ ذلكَ، أسرَعَ وَأمسكَ رِكَابَ البَغْلَةِ حتَّى يركَبَهَا زَيدٌ. فلَمَّا رأى زَيدٌ ذلكَ قَالَ: اترُكْهُ يا بنَ عَمِّ رسولِ الله ﷺ.

فَقالَ ابنُ عبَّاسٍ: هكذَا نفعَلُ بالعُلماءِ وَالكُبَراءِ.

فَقبَّلَ زيدُ بنُ ثابتٍ يدَ ابنِ عبَّاسٍ، وقَالَ: هكذَا نفعَلُ بأهلِ بيتِ نبيِّنَا ﷺ. [الحاكم والطبراني].

---

يجبُ على المسلِم أنْ يحترِمَ مُعلِّمَهُ، ويُوَقِّرَهُ، ولَقدْ قالُوا قَديماً: مَن عَلَّمنِي حَرفاً، صِرْتُ لهُ عَبداً. وَيجُوزُ لِلمُسلم تَقبِيلُ يَدِ العُلماءِ وَالصَّالحينَ.

# رێز گرتنی زانا

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆر هەوڵیان دەدا فێریی کاروباری دینەکەیان بن، ئامادەی کۆڕی زانایان دەبوون و زانستیان وەردەگرت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فێری دەکردن کەرێز لێگرتنی زانا پێوستە لەسەر هەموو موسڵمانێک پیاو یان ژن

.جارێکیان زەیدی کوڕی ثابت (رضي الله عنه) نوێژی کرد لەسەر مردویەک دوایی ولاخەکەیان بۆ ئامادە کرد تا سوار بێت و بڕوات.

کاتێک عبداللە کوڕی عباس(رضي الله عنه) بینی بەپەلە ڕۆیشت و ڕەشوی ولاخەکەی بۆ گرت، کاتێک ئەمەی بینی زەید فەرموی: وازبێنە ئەی کوڕی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ!!، عبداللە فەرموی: ئێمە وارێز لەزاناو گەورەکانمان دەگرین!!

زەید دەستی ماچ کرد و فەرموی: ئێمەش ئاوا دەبین لەخزمەت خانەوادەی پێغەمبەردا ﷺ. (رواه والحکم والطبراني)

---

پێویستە لەسەر موسڵمان ڕێزی مامۆستاکەی بگرێت، بەگەورە بۆی بڕوانێت، لەزووەوە وتراوە: هەرکەس پیتێکم فێر بکات، دەبمە بەندەی.

دروستە موسڵمان دەستی زانایان و پیاوچاکان ماچ بکات.

# السَّعْيُ لِلعِلْمِ

فِي يَومٍ مِن الأيَّامِ قَالَ عبدُ اللهِ بنُ عبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ لصاحبٍ لهُ مِنَ الأنصارِ: تعالَ نَسأَلْ أصحاب رسول الله ﷺ؛ فَإِنَّهُمُ اليومَ كثيرٌ.

فَلَمْ يستجِبْ صاحبُهُ لدعوَتِهِ، وَتعجَّبَ مِنْ رغبَتِهِ فِي تلَقِّي العِلْمِ عَنِ الصَّحابةِ، وقَالَ لَهُ: عجبًا لكَ يَا بنَ عبَّاسٍ! أتَرَى النَّاسَ يَفتَقرُونَ إليكَ (يَحتاجُونَ إليكَ)، وَفِي النَّاسِ مِنْ أصحابِ رسول الله ﷺ منْ فِيهِمْ؟!

فَلَمْ يهتَمَّ ابنُ عبَّاسٍ بما قالَهُ صاحِبُهُ، وظلَّ يَطلُبُ العِلْم حتَّى أصبحَ عالماً يجتَمعُ النَّاسُ حولَهُ لِيسألُوهُ.

ولمَّا رأى صاحِبُهُ الأنصاريُّ ذَلِكَ، قَالَ: هذَا الفتَى كان أعقَل منِّي. [الحاكم والطبراني].

---

قَالَ عبدُ الله بنُ مسعودٍ رضي الله عنه: إنَّ الرَّجُلَ لا يُولَدُ عالِماً، وإنَّمَا العِلْمُ بِالتَّعَلُّم. [ابن عبد البر].

# ڕۆیشتن بۆ زانست وەرگرتن

جارێکیان عبداللە ی کوڕی عباس ﷺ بە هاوەڵێکی ئەنصاری ووت: وەرە بابچینە خزمەت هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لی بکەین، ئەمڕۆ زۆرن.

بەڵام هاوەڵە ئەنصاریەکە وەڵامی نەدایەوەو لەگەڵی نەهات، بەلایەوە سەیر بوو ئەم زۆر سورە لەسەر زانست وەرگرتن، بۆیە پێی ووت: بەتەمایی خەڵکی پێویستیان بێت و بێن پرسیارت لێ بکەن، لەگەل ئەوەشدا کۆمەڵێ زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەژیاندا ماون؟! بەڵام (ابن عباس) گوێی نەدا بە قسەی هاوڕێکەی، زیاتر سوور بوو لەسەر وەرگرتنی زانست تا وایی لی هات بووە زانایەکی گەورە، خەڵکی لە چواردەوری کۆ دەبونەوە و پرسیاریان لێدەکرد.

کاتێک هاوەڵە ئەنصاریەکە ئەمەی بینی ووتی: بەڕاستی ئەم گەنجە لەمن ژیرتر بوو(الحاكم، والطبراني)

---

عبداللە ی کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت پیاو بە زانایی لە دایک نابێت، بەڵکو زانست بە فێر بوونە (ابن عبدالبر)

# الانتِظَارُ

كانَ عبدُ الله بنُ عبَّاسٍ - رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا - مِنْ أشَدِّ النَّاسِ حِرْصاً علَى طلَبِ العِلْمِ، ومِنْ أكثَرِهِمْ طَلَباً لهُ.

وذاتَ مرَّةٍ، ذَهبَ ابنُ عبَّاسٍ إلى بيتِ أحدِ الصَّحابةِ؛ لِيَسألَهُ عنْ حديثٍ سمعَهُ الصَّحابيُّ مِنْ رسولِ الله ﷺ. وكانَ الوقتُ وقتَ رَاحةٍ، فَلَمْ يَطْرُقِ ابنُ عبَّاسٍ البَابَ، وقرَّرَ أنْ يَنتَظِرَ أمامَ البابِ حتَّى يَخرُجَ الرَّجلُ. ولَمَّا طالَ انتظَارُهُ، بَسَطَ رِداءَهُ، ونَامَ عَليهِ، وكانَتِ الرِّيحُ شَديدةً تُلقِي علَيهِ التُّرابَ.

وظلَّ ابنُ عبَّاسٍ هكذَا حتَّى خرَجَ الصَّحابيُّ مِنَ الدَّارِ. فلَمَّا رأَى الصَّحابيُّ ابنَ عبَّاسٍ قالَ لهُ: يا بنَ عم رسولِ الله، مَا جاءَ بكَ؟! هَلاَّ أرسَلْتَ إلي فآتيكَ؟!

فقالَ ابنُ عبَّاسٍ: لا، أنَا أحَقُّ أنْ آتيَكَ. ثُمَّ سألَهُ عَن حديثٍ سَمعَهُ الصَّحابيُّ مِنْ رسولِ الله ﷺ، فلَمَّا أخبَرَهُ الصَّحابيُّ بِمَا سمِعَهُ مِنْ رسولِ الله ﷺ عادَ ابنُ عبَّاسٍ رَاجِعاً.

---

مِنْ آداب طلَبِ العِلْمِ: عدَمُ مُقاطَعة المُعَلِّمِ أثناءَ الشَّرحِ، وإذَا سُئِلَ المُعَلِّمُ أثناءَ إلقائِهِ، فَعلَيه أنْ يُتِمَّ حديثَهُ، ثمَّ يُجيبَ السَّائلَ.

# چاوەڕوانی

عبداللّه کوڕی عباس(ڕەزایی خوای لیٚ بیٚت) زۆر زانستی وەردەگرتو لەهەموو خەڵک بەپەرۆش تر بوو بۆ وەرگرتنی. جاریٚک ویستی بجیٚتە خزمەت یەکیٚک لە هاوەڵانی پیٚغەمبەری خواﷺ پرسیاری فەرمودەیەک بکات، لە دەرەوەی دەرگاکە چاوەڕیی کرد، کاتی حەوانەوە بوو، بۆیە لەدەرگای نەداو زۆر چاوەڕیی کرد ئینجا پۆشاکەکەی داخست و لەسەریی نوست، بایەکی بەهیٚزی هەبوو کە خۆڵەکەی دەکرد بەسەریدا.

بەم شیٚوەیە مایەوە تاهاوەڵە بەڕیٚزەکە لەماڵەوە دەرچوو، پیٚ ی فەرمووو: ئەی کوڕی مامی پیٚغەمبەرﷺ بۆ هاتوویی، جوابت بناردایە من دەهاتم بۆ خزمەتت! (ابن عباس)رضي الله عنه فەرموی: نەخیٚر پیٚویستە من بیٚم بۆ خزمەتت، بویە پرسیارەکەیی کردو دوایی وەڵامی دایەوە کە ئەو فەرمودەی لە حەزرەت بیستووە پاشان(ابن عباس) گەڕایەوە بۆ ماڵ.

---

لە ئادابی فیٚر خواز ئەوەیە: لەکاتی وانەدا باسەکە بە مامۆستا نەبڕیٚت، وە ئەگەر مامۆستا پرسیاری لیٚکرا، دەبیٚت قسەکانی تەواو بکات، پاشان وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە.

# لا حرجَ في العلمِ

كانت الصَّحابيَّاتُ - رَضيَ اللهُ عَنْهُنَّ - يـذهَبْنَ إلى رسـولِ الله ﷺ يسألنَهُ عنْ أُمورِ الدُّنيَا والآخرةِ.

وكانَ كثيرٌ منهُنَّ يَستَحي مِنْ سؤالِ الرَّسولِ، فَكانَ الحَيَـاءُ يمنَعُهُنَّ عَن معرفة بعضِ الأُمورِ التي تَشغَلُ بالَهُنَّ.

وذات يومٍ، ذَهبتْ أمُّ سُلَيمٍ - رضِي اللهُ عَنْهَا - إلى رسـولِ الله ﷺ، لتسألَ عن مسألة منْ مَسائلِ الدِّينِ، فَقالَتْ: يَا رسـولَ الله! إنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي منَ الحَقِّ، فَهَلْ على المـرأةِ مـنْ غُسْـلٍ إذَا احْتَلَمَتْ؟

فقالَ لهَا رسولُ الله ﷺ: «إذَا رأَت الماء».

وكانتِ السَّـيِّدةُ أُمُّ سَـلَمَةَ ــ رَضِـي اللهُ عَنْهَـا ـ حَاضِـرةً، فَغَطَّتْ وَجْهَهَا ــ حَيَـاءً وخجَـلاً ـ وقالَـتْ: يَـا رسـولَ الله! أوَ تَحتَلمُ المرأةُ؟! فقالَ ﷺ. «نَعَم ـ تَرِبتْ يَمِينُـكِ ـ فَـبِمَ يُشْـبِهُهَا ولَدُهَا؟!» [البخاري].

---

يَجبُ ألاَّ يَمنَعَ الحياءُ المُتَعلِّمَ منْ طلَبِ العِلْمِ وسؤالِ مُعَلِّمِه، فـإنْ لَـمْ يَستطعْ أَنْ يُغالبَ حيَاءَهُ، فعلَيهِ أنْ يَطلُبَ مِنْ غَيرِه أنْ يَسألَ نِيابةً عنْهُ.

# شەرم نیە لەزانست وەرگرتن

ئافرەتانی هاوەڵی پێغەمبەری خواﷺدەچونە خزمەت پێغەمبەرﷺ پرسیاری کاروباری دونیاو دوارۆژیان دەکرد زۆریان شەرمیان دەکرد ئەوەی لەدڵیاندایە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکەن تا شارەزا بن، ئەم شەرم کردنە، وای لێکردبوون هەندێک شت نەزانن وەزانست وەرنەگرن. ڕۆژێکیان (ام سُلیم) چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: خوای گەورە شەرم لە دەربڕینی هەق ناکات، لەسەر ئافرەتان پێویستە خۆیان بشۆن کاتێک خەو ببینن؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: {کاتێک ئاو ببینن} وەدایکی ئیمان داران (ام سلمە) لەوێ بوو بۆیە دەم و چاوی داپۆشی زۆر شەرمی کرد، فەرموی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بۆ ئافرەت خەو دەبینێ؟ فەرموی: { بەڵێ، دەستت بەخۆڵدا بچێت، ئەی چۆن منالەکەی لەخۆی دەچێت } البخاري

---

پێویستە شەرم نەبێتە ڕێگر لە فێرخواز لە فێربوونی زانست و پرسیارکردن لە مامۆستاکەی، ئەگەر نەیتوانی زاڵ بێت بەسەر شەرمەکەیدا دەبێت بە کەسێکی تر بڵێت لە جیاتی ئەو پرسیار بکات.

# الرِّحَلَـةُ

كانَ الصَّحَابيُّ الجَلَيلُ جـابِرُ بـنُ عبـدِ اللهِ رضـي الله عنـه حَريصاً على جَمْعِ أحاديثِ الرَّسولِ ﷺ بعدَ وفاتِه.

وذاتَ مـرَّةٍ عَلِـمَ جـابِرُ أَنَّ هنـاكَ حَـديثاً عنـدَ رَجُـلٍ مِـنَ الصَّحابةِ يسكُنُ الشَّامَ. فَاشتَرَى بَعِيراً، وسَافَرَ إلى بلادِ الشَّامِ.

ولمَّا وصَلَ جابِرٌ إلى بيت الصَّحابيِّ، قَالَ لِخَادمِهِ: قُلْ لَهُ: جابِرٌ علَى البابِ.

فَخرَجَ إليهِ الرَّجُـلَ وَاحتَضَـنَهُ، فقـالَ جـابرٌ: بَلَغَنـي أَنَّـكَ سمِعتَ حَـديثاً مِـنْ رسـولِ اللهِ ﷺ، فَخشِـيتُ أَنْ تَمُـوتَ؛ أَو أَموتَ قبلَ أنْ أَسْمَعَهُ.

فَرحَّبَ بهِ الرَّجُلُ، وَأَخبَرَهُ بحديثِ رسولِ اللهِ ﷺ، فَفَـرِحَ بهِ جابِرٌ فَرَحاً شَديداً، ثُمَّ شكَرَهُ، ورَكِبَ بَعيرَهُ عَائِداً إلى بلادِهِ. [الطبراني].

---

أنفَعُ العُلومِ مَا كانَ يُقرِّبُ مِنْ رِضَا اللهِ ـ سبحانَهُ ـ قَـالَ ﷺ: «مَـنْ يُـرِدِ اللهُ بهِ خَيراً يُفقِّهْهُ في الدِّينِ» [البخاري].

^

# گەشت

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ (جابری کوڕی عبـدالله) رضي الله عنه زۆر سـور بـوو لەسەر کۆکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەدوای وەفاتی.

جارێک زانی فەرمودەیەک هەیە لەلای پیاوێک کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە لـە شامە، بۆیە چوو وشترێکی کڕی، چـوو بـۆ شـام، کاتێـک گەیشـتە دەرگـای مـاڵی هاوەڵەکە، بەخزمەت کارەکەی ووت بڵێ: جابر لەبەر دەرگا چـاوەڕێتە! هاوەڵـە بەڕێزەکە هاتە خزمەت جـابر، میوانـداری کـرد و باوەشـی پێـداکرد، فـەرموی: بیستومە کە تۆ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ فەرمودەیەکت بیستووە، ترسـام بمریت و لەناوبچێت، یان من بمـرم گـوێم لێ نـەبێ، زۆر کـەیفی خـۆش بـوو وە پێشوازی لێکرد، پاشان فەرمودەکەی پێ ووت، جابر زۆر دڵخـۆش بـوو، سوپاسـی کردو، سواری وشترەکەی بوو گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی (الطبراني)

---

بـە سـودترین زانسـت ئەوەیـە کـە لەڕەزامەنـدی خـوا نزیکـت بکاتـەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەرکەس خوای گەورە ویستی خێری پێ هـەبێت کـە دین شارەزای دەکات (البخاري).

# العِلْمُ وَالتَّقوَى

كَانَ الإمامُ الشَّافعيُّ ـ رَحِمَهُ اللهُ ـ شديدَ الذَّكاءِ، قَويَّ الحفْظ. وَيحكِي البعضُ أنَّهُ كانَ إذَا قرأَ كتاباً خبَّأَ الصَّفْحةَ المُقابلةَ بيَده حتَّى لا يختَلطَ حفْظُ الصَّفحة اليُمنَى معَ الصَّفحة اليُسرَى؛ فكانَ سريعَ الحفْظ، قَوِيَّ الذَّاكِرَة.

وذَات يومٍ، ذهَب الشَّافعيُّ إلى أُستاذِهِ وكيعٍ، وشكَا إليهِ أنَّهُ لَمْ يَعُدْ يَحفَظُ العلْم جيِّداً كمَا كانَتْ عادَتُهُ.

فَكَّرَ وكِيعٌ لحظةً، ثُمَّ قَالَ لِلشَّافعيِّ: إنَّ سببَ سُوءِ حفْظه رُبمَّا كانَ بسببِ ارتكابِهِ معصِيَةٍ تُغضِبُ اللهَ.

وفِي ذَلكَ قَالَ الشَّافعيُّ

شَكَوْتُ إلى وكيعٍ سُوْءَ حِفْظِي ... فَأرشَدَنِي إلى تَـرْكِ المَعَاصِـي
وَأخبرَنِي بـأنَّ العـلْمَ نُـورٌ ... ونُـورُ اللهِ لا يُهْـدَى لِعَاصِـي

---

العلْمُ فَضْلٌ ورزقٌ يَهَبُهُ الله سبحانَهُ لِمَنْ يَشاءُ مِنْ عبادِهِ، خاصَّةً الأَتقِياءِ؛ قَالَ تَعالَى: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ﴾ [البقرة:٢٨٢]

# زانست و پارێزگاری

پێشەوا شافعی (ڕەزای خوایی لێبێت)، زۆر بەخیرایی زانست فێر دەبوو، وە لەبیری نەدەچووەوە، ئەگەر بێت و پەرتوکێکی بخوێندایەتەوە دەستی دەخستە سەر لاپەڕەکەی تر تا نەبادا بیبینێ ئەویش لەبەر بکات و لێی تێک بچی لەبەر بەهێزی لەبەر کردن و بیر تیژی، ڕۆژێک چووە خزمەت مامۆستاکەی پی ووت: کە وەک پێویست شتم بۆ لەبەر ناکری بیر تیژیم نەماوە؟ ئەویش وتی: پی دەچێ هۆی کردنی تاوانێک بێت، سەرئەنجام بیرت لاواز بوو، بۆیە پێشەوا شافعی ئەم هۆنراوەی فەرمو:

سکالای خۆم بردە لای مامۆستاکەم لە خراپی بیرم

ڕێنمونی کردم بۆ واز هێنان لە خراپە

پێ ووتم کە زانست روناکییە

وەروناکی خوایی بۆ کەسێکی تاوانبار نابێ

---

زانست ڕێزە و ڕۆزی یە، خوای گەورە دەیبەخشێ بەهەرکەس بیەوێت لەبەندەکانی بەتایبەت، لە خواترسان و پارێزگاری (وأتقوا الله ويُعلمكم الله) البقرة/ ٢٨٢

# شَجاعةُ المتَعلِّمِ

كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يَجلِسُ ذاتَ يومٍ معَ أصحابِهِ، فَقالَ لَهُمْ: «إنَّ مِنَ الشجَرِ شجرةً لا يَسقُطُ ورَقُهَا، وَهِيَ مَثَلُ المُسلِمِ.. حَدِّثونِي مَا هِيَ؟».

فَكَّرَ الحَاضِرُونَ لَكنَّهُمْ لَمْ يَعرِفُوهَا، وكانَ عبدُ اللهِ بنُ عمرَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ حَاضِراً، فَقالَ في نفسِهِ إنَّهَا النَّخْلَةُ، وَاستَحيَا أنْ يُجيبَ عنِ السُّؤالِ، وَفي المَجلِسِ مَنْ هُوَ أكبرُ مِنْهُ.

فقالَ النَّاسُ: يَا رسولَ اللهِ! أخبرْنَا بِهَا. فَقالَ ﷺ: «هِيَ النَّخلَةُ».

وَبعدَ ذَلِكَ أخبَرَ عبدُ اللهِ أَبَاهُ عُمرَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَ ـ بَما دارَ في نفسِهِ، فَقالَ عُمَرُ: لأَنْ تكُونَ قُلتَهَا أحَبُّ إليَّ. [البخاري].

---

يَجبُ علَى مَنْ عَلِمَ عِلْماً أَنْ ينفعَ بِهِ مَنْ لا يَعلَمُهُ، قَالَ ﷺ: «... لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الغائِبَ؛ فإنَّ الشَّاهِدَ عسَى أن يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى لَهُ مِنْهُ» [البخاري].

# ئازایەتی فێرخواز

ڕۆژێک هاوەڵان لەحزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشت بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: موسڵمان وەک دارێک وایە کە گەڵاکانی ناوەرێن ئەوداره چییە؟ ئامادەبوان هیچیان نەیان زانی، عبداللە کوڕی عمر رضي الله عنه، لەوێ بوو، بەڵام شەرمی کرد وەڵام بداتەوە لەدڵی خۆیدا ووتی: دار خورمایە، (لە ڕوویی نەهات باسی بکات چونکە لە هەمویان بچوکتر بوو).

خەڵکی ووتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێمان بڵێ فەرموی: (خورمایە)، دوایی کوڕەکەی پێشەوا عمر بە باوکی ووت، (ڕەزایی خوایان لێ بێت): من دەمزانی بەڵام لە ڕووم نەهات باسی بکەم عمر رضي الله عنه فەرموی: ئەگەر باست بکردایە زۆرم پێ خۆش بوو (البخاري)

---

پێویستە کەسێک کەشتێک فێر دەبێت، بیگەیەنێت بە کەسێک کە نازانێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: با ئەوەی ئامادەیە بیگەیەنێت بەوەی ئامادە نیە، زۆر جار هەیە فەرمودەیەک دەیگەیەنێت بەکەسێک لە خۆی باشتر لێ ی تێدەگات (البخاري)

# العِلْمُ الوَاضِحُ

كانتِ السَّيِّدةُ عَائشةُ ـ زوجَةُ النَّبيِّ ﷺ ـ تُحبُّ العلْم، وإذَا جَهِلَتْ شَيئاً سَألتْ عَنْهُ وراحَتْ تسألُ فِيهِ حتَّى تَعرِفَهُ بوُضوحٍ.

وذاتَ مرَّةٍ، سمعت النَّبي ﷺ يقولُ: «مَنْ حُوسب عُذِّبَ».

فَقالَتْ لَهُ السَّيِّدةُ عَائشةُ أوَلَيسَ اللهُ تَعالَى يَقولُ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾ [الانشقاق: ٧ ـ ٨].

فَقالَ ﷺ: «إنَّما ذَلكَ العَرْضُ (أي: أنَّ الأعمالَ تُعْرَضُ على كلِّ إنسانٍ فَيتَذَكَّرُهَا دُونَ أَنْ يُحاسبَ عَليهَا)، ولَكِنْ مَنْ نُوقِشَ الحسابَ يَهْلَكُ» [البخاري].

---

يَجِبُ على المُتَعلِّمِ أنْ يَفهَمَ مَا يتَلقَّاهُ مِنَ العلْمِ جيِّداً؛ فَإذَا صعُب عليهِ شيءٌ، فَعليهِ أنْ يسألَ المُعَلِّمَ، وَيطْلُبَ مِنْهُ شَرْحَ الصَّعبِ مرَّة أُخرَى، حتَّى يستَوضِحَ الغَامض.

# زانستێکی روون و ئاشکرا

دایکی باوەڕداران خاتو (عائشە) ﵂ زۆر حەزی لە زانست بوو، ئەگەر شتێکتت لێ بپرسایە دەچو پرسیاری دەکرد تا بەتەواوی و ڕونی بیزانیایە، ئەنجا وەڵامی دەدایەوە. جارێک پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((هەرکەسێک لەڕۆژیی دوایی بە ووردیی لێ پرسینەوەی لەگەڵ بکرێت ئەو سزا دەدرێ))!!

عائشە﵂ فەرموی: ئایا خوای گەورە نافەرموێت: {ئینجا ئەوەیی کە خاوەن ئیمان و کردەوەی چاک بێت، نامەی کردەوەکانی بدرێتە دەستی ڕاستی، ئەوە پرسیاریی سوک و ئاسانی لی دەکرێت و. بەهۆی ئیمان و کارە جوانەکانی دەکەوێتە بەر ڕەحمەتی خوا خۆی} (٧-٨)الا حقاف

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەوە نامەی کردەوە وەرگرتنە نەک ئاژمار لەگەڵ کردن، هەرکەسی بە ووردیی لێپرسینەوەی کردەوەکانی لەگەڵ بکرێت ئەوا یان دەرناچێ یان زۆر ماندو دەبێت (البخاری)

---

پێویستە فیر خواز ئەو زانستەی وەری دەگرێت بە چاکی لێ ی تێبگا، ئەگەر شتێکی لەلا گران و قورس بوو، دەبێت پرسیار لە ماموستاکەی بکات، جارێکی تر داوای لی بکات ڕاڤەی بۆ بکاتەوە تا بۆی ڕۆشن بێتەوە.

# الثَّلاثَةُ وَالعِلْمُ

فِي يَـومٍ مِـنَ الأيَّـامِ، جَلَـسَ الـنَّبِيُّ ﷺ في المَسـجدِ مـعَ أصحابِهِ في مجلِسِ عِلْـمٍ، فمَـرَّ ثلاثـةٌ مِـنَ النَّـاسِ علـى بـابِ المسجدِ، ورَأى أحدُهُمْ مكاناً خَالياً وَسَطَ الحَلْقةِ التي يَجلِسُ فِيهَا الصَّحابةُ؛ فَاتَّجهَ إليهِ، وَجلَسَ فيهِ، حِرْصاً منْهُ على سَمَاعِ العِلْمِ وَالاستِفادةِ منْهُ.

ودَخَـلَ الرَّجُـلُ الثَّـانِي، فَجَلَـسَ في مكـانٍ بَعيـدٍ خَلْـفَ الحَلْقةِ.

وأمَّا الرَّجُلُ الثَّالثُ فقَدِ انصرَفَ ولَمْ يَحضُرْ مَجلِسَ العِلْمِ.

فلَمَّا أنْهَى الرَّسولُ ﷺ حديثَهُ، قَالَ: «ألاَ أُخبِرُكُمْ عنِ النَّفَـرِ الثَّلاثة: أمَّا أحَدُهُمْ؛ فَأوَى إلى اللهِ؛ فآوَاهُ اللهُ (يعنِي: الذي اقترَبَ حِرْصاً عَلى العِلْمِ). أمَّا الآخَـرُ، فاسـتَحْيَا مِـنَ اللهِ، فَاسـتَحْيَا اللهُ مِنْهُ، أمَّا الآخَرُ فَأعْرَضَ؛ فَأعْرَضَ اللهُ عنْهُ» [البخاري].

يَعنِي أنَّ اللهَ أعطَى كُلاًّ مِنْهُمْ ثَواباً بِقَدْرِ إقبالِهِ على العِلْمِ.

---

طَلَبُ العِلْمِ وَالإقبالُ على التَّعلُّمِ فَرِيضةٌ على كـلِّ مُسـلِمٍ. وَاللهُ سَيَسْـأَلُ كُلاًّ مِنَّا عنْ عِلْمِهِ: ماذَا فعَلَ بهِ.

# زانست و سێ کەس

ڕۆژێک هاوەڵە بەڕێزەکانلە خزمەت پێغەمبەری خـواداﷺ دانیشـت بـوون تـا فێری زانست بین، سێ کەس هاتنە لایـی دەرگـای مزگـەوت یـەکێکیان بینـی لـە ناوەڕاستی کۆڕەکەدا جێگایەکی بەتاڵ هەیە چووە ئـەوێ وە گـوێی گـرت بـۆ فێـر بـوونی زانسـتەکە وەسـوودی لێـوەرگرت، بـەڵام پیـاوی دووەمیـان لـە دووری کۆمەڵەکە دانیشت، سێ هەمیان ڕۆشت و ئامادەی کۆڕەکـە نـەبوو! دوای تـەواو بونی پێغەمبەرﷺ لە فەرمایشتەکەی فەرموی: {پێتـان بڵـێم نمونـەیی ئـەم سـێ کەسە، یەکێکیان پەنای بۆ خوا هێنا، خوا پەنای دا، دووەمیان شەرمی کـرد لـەخوا خوا ڕێزی لێگرت سێ هەمیان پشتی کردە خوا خوا ڕوی ڕەحمـەتی لێ وەرگێـڕا} (البخاری)

واتە: هەرکامێکیان پاداشتی خۆی وەرگرتەوە بە ئەندازەی وەرگرتنی زانست.

---

هەوڵی فیر بوونی زانست پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێک، خوای گـەورەش پرسیار لەهەر یەکێک لە ئێمە دەکات کە ئایا کارمان بە زانستەکەمان کردووە.

# آدابُ طَلَبِ العِلْمِ

العِلْمُ فَضْلٌ مِنَ اللهِ، يَهَبُهُ لِمَنْ يَشاءُ مِنْ عِبادِه، ولِطلَبِ العِلْمِ آدابٌ، حرَصَ النَّبيُّ ﷺ على أنْ يُعَلِّمَنَا إيَّاهَا؛ حتَّى نستَطيعَ أنْ ننتَفعَ بِمَا تعلَّمناهُ، وأنْ نَنْفَعَ مُجتَمعَنَا به.

وعلَى طالبِ العِلْمِ أن يُقْبِلَ على فَهْمِ أسرارِ هذَا العِلْمِ، وَيحتَرِمَ مُعلِّمَهُ، ويَحرَصَ على أن يَجعَلَهُ قُدْوَةً لَهُ في كُلِّ خَيرٍ يَعْلَمُهُ.

وَعلى طالبِ العِلْمِ أنْ يَحْرَصَ على أنْ يَنفَعَ النَّاسَ بما آتَاهُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ، وبِمَا استَودَعَهُ مِنْ أسرارِ ذلكَ العِلْمِ.

وَهذِهِ بعضُ القَصصِ التِي تُوضِّحُ لنَا بعضَ الآدابِ التي يجبُ أنْ يَتحَلَّى بهَا طالِبُ العِلْمِ؛ حتَّى يُبارِكَ اللهُ لَهُ فيمَا تعَلَّمَهُ، فَيَحصَلَ بذلكَ علَى خَيرِ الدُّنيا وَخَيرِ الآخِرَةِ.

*****

# ئادابی وەرگرتنی زانست

زانست بەهرەیەکی خوایە، کی بیەوێت پـی ی دەبەخشـێ لـە بەنـدەکانی، بـۆ وەرگرتنـی زانســت شـێوازی خــۆی هەیــە پێغەمبــەر(ﷺ) زۆر بایــەخی داوە بەزانست، وە دەبێت سوودی لێ وەربگرین نەك فێر بوون بێ و بەس، وە سوود بگەیەنین بە کۆمـەڵگاش، ئـەو کەسـەی زانسـت وەردەگرێـت دەبێـت لـەنهێنی زانست تێ بگات، وەرِێزی مامۆستاکەی بگرێ، وە بیکاتە پێشەوا، لەهەموو شتێکی چاکەدا چاو لە مامۆسـتاکەی بکـات، سـور بێـت لەسـەر ئـەوەی سـود بەخـەڵکی بگەیەنێ بەزانستەکەی، لەوەیی خوا پـێ بەخشـیوە، ئـەو زانسـتە بەسـپاردەیەك بزانی لە ئەستۆیدا. وە ئەم پەندوبەسەرهاتانە روونـی کـردەوە دەبێـت ئـەوەی زانست وەردەگرێ ڕازاوە بێت بەم ڕەوشتە جوانانە، هەتا خـوا بەرەکـەت بخاتـە زانستەکەیەوە. بەمە خۆش بەختی ژیانی دنیاو دوارِۆژی بەردەکەوێ.

# ئادابی یادی خوا

نوسنی: مصطفى أحمد علي

وەرگێڕانی: م. جعفر محمد ألماس

# النِّداءُ الخَفِيُّ

خَرَجَ النَّبيُّ ﷺ وَصحابَتُهُ ـ رُضوانُ الله عَليهِمْ ـ في سَفرٍ، فَجعَلَ الصَّحابةُ يَجْهرُونَ بالذِّكرِ وَالتَّكبيرِ كلَّمَا صَعَدُوا مُرتَفَعاً أَو نزَلُوا وَادِياً، وكانَ أَعلاَهُمْ صَوتاً ذاكَ الذِي كُلَّمَا صَعَدَ أَو هبَطَ نادَى: لا إلهَ إلاَّ الله، وَالله أكبرُ

وَرأَى رسُولُ الله ﷺ مَا كَانَ مِن أصحابِهِ مِنَ الصَّخَبِ وَالضَّجيجِ، فَلَمْ يُعْجِبْهُ مَا صنَعُوا، فَإنَّ مَا صَنَعُوا؛ وَإنْ جَازَ فِي حَقِّ الغَائبِ وَمن بِهِ صَمَمٌ، فإنَّهُ لا يَجُوزُ فِي حقِّ الله؛ فإنَّهُ ـ سُبحانَهُ ـ ليس بغائبٍ ولا أصَمَّ، بَل سَميعٌ قَريبٌ مُجيبٌ، فَبيَّنَ لَهُمُ النَّبيُّ ﷺ سوء مَا صَنعُوا، ودَلَّهُمْ على مَا هُوَ خيرٌ لَهُمْ عندَ ربِّهِمْ وَأَزكَى، فَقالَ ﷺ: «أيُّها النَّاسُ، ارْبَعُوا علَى أَنفُسِكُمْ (ارْفقُوا بِهَا، فَاخْفِضُوا مِن أَصواتِكُمْ)، إنَّكُمْ ليسَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غائِباً، إنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعاً قَرِيباً، وهُوَ مَعَكُمْ» [مسلم].

---

مِنْ آدابِ الذِّكْرِ خَفْضُ الصَّوتِ، لِمَا في ذلِكَ مِنَ التَّوقيرِ لله تَعالَى الذي يعلَمُ السِّرَّ وأَخْفَى، وحتَّى لا تَخْتَلِطَ الأصواتُ وتَتَداخَلُ، أَو تُشَوِّشُ الفكر.

# بانگێکی شاراوەی لەسەرخۆ

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا دەرچوو بۆ سەفەرێک، هاوەڵان لەو سەفەرەدا زیکرو (اللّه أكبر)یان بە دەنگی بەرز دەچڕی، هەرکاتێک هەڵدەگەڕان بۆ بەرزاییەک یان شۆڕدەبونەوە بۆ ناو دۆڵێک بەدەنگی زۆر بەرز دەیان فەرموو (لااله الا اللّه و اللّه اكبر).

پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەی بینی لە هاوەڵان لەو دەنگە دەنگ‌و قاڵە قاڵە، هیچ دڵخۆش نەبوو بەوەی دەیکەن، ئەوەی دەیکەن گەر بۆ کەسێک بێت کە ون بێت‌و نادیار بێت‌و کەڕ بێت باشە، بەڵام ئەمە بۆ خوا هەرگیز دروست نیە، چونکە خوای گەورە نە وون‌و نادیارە نە کەڕیشە، بەڵکو ئەو زۆر بیسەرو نزیکەو وەڵام دەریشە. بۆیە ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوە کە کارێکی خراپ دەکەن وە ڕێنمونی کردن لەسەر ئەوەی چاک‌و باشە خوا پێی خۆشە فەرموی: ((ئەی خەڵکینە دەنگتان هێواش بکەنەوە)). ئێوە بانگی زاتێ ناکەن کە کەڕ بێت یان غائیب بێت ئێوە بانگی خوایەک دەکەن بیسەرەو نزیکەو لەگەڵتاندایە.(مسلم).

---

لە ئادابی زیکرە دەنگی هێواش، وە ڕێزو گەورەیی دانانە بۆ خوای گەورە کە ئاگای لە پەنهان‌و ئاشکرایە، هەتاکو دەنگەکان تێکەڵ نەبن ژاوەژاو دروست نەبێت‌و بیرو هۆش تێک بچێ.

# سِبَاقُ الحَسَنَاتِ

ذهَبَ فقراءُ المهَاجِرينَ إلى النَّبيِّ ﷺ فَقـالُوا: ذهَـبَ أهـلُ الدُّثورِ (أصحابُ الأَموالِ) بالـدَّرَجَاتِ العُـلاَ وَالنَّعـيمِ المُقـيمِ: يُصلُّونَ كمَا نُصَلِّي، ويَصُومُونَ كمَا نَصُـومُ، وَلَهُـمْ فَضـلٌ مِـنْ أموالٍ فَيَحُجُّونَ وَيعتَمِرُونَ وَيجاهِدُونَ ويتَصَدَّقُونَ.

فَقالَ ﷺ: «ألاَ أُعَلِّمُكُمْ شَيئاً تُـدرِكُونَ بـهِ مَن سَبقَكُمْ، وَتسبِقُونَ بهِ مَنْ بعدَكُمْ، وَلا يكُونُ أحَدٌ أفضَلَ مـنْكُمْ؛ إلاَّ مَـنْ صنَعَ مثلَ مَا صنَعتُمْ؟» قَـالُوا: بَلَـى يَـا رسـولَ الله. فَقـالَ ﷺ: «تُسَبِّحونَ، وتَحمـدُونَ، وتُكبِّـرونَ، خَلْـفَ كُـلِّ صَـلاةٍ ثَلاثـاً وثَلاثــينَ». أي تقولُــونَ: سُـبحانَ اللهِ وَالحمـدُ للهِ واللهُ أكبَـرُ فَخَرَجُوا مِنْ عنْدِهِ ﷺ فَرِحِينَ بمَا تعلَّمُوهُ.

وبعدَ فَتْرةٍ، رجَعُوا إلى الـنَّبيِّ ﷺ فَقـالُوا: سَـمعَ إخوانُنَـا أهلُ الأَموالِ بمَا فَعلْنَا ففَعَلُوا مِثلَهُ. فَقالَ رسولُ الله ﷺ: «ذلـكَ فَضْلُ اللهِ يُؤتِيْهِ مَنْ يَشاءُ» [متفق عليه].

---

مِنْ آدابِ الذِّكْرِ المُواظَبةُ عليهِ في أحوالٍ مُعَيَّنةٍ، مِنْهَا: خَلْـفَ الصَّـلاةِ المكتوبَةِ، وقبلَ طُلوعِ الشَّمسِ وقبلَ غُروبِهَا، وفِي جَوْفِ اللَّيلِ.

٨

# پێش برکێی چاکەکردن

هەژارەکانی کۆچەران چونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتیان: خاوەن ماڵو سامانەکان پلەی بەرزو بڵندیان بەدەست هێناوە، نازو نیعمەتی بەهەشتیان بچڕیوە بۆ خۆیان، نوێژ دەکەن هەر چۆن ئێمە نوێژ دەکەین، ڕۆژوو دەگرن هەرچۆن ئێمە ڕۆژو دەگرین، بەڵام ئەوان فەزڵیان بەسەر ئێمەدا هەیە ماڵیان هەیە حەج دەکەنو عەمرە دەکەنو لە پێناو خوادا پارە دەبەخشنو تێدەکۆشنو ئێمە نیمانە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ئایا شتێکتان فێر بکەم کە بگەنەوە بەوانەی پێشتان کەوتون، و ئەوانیش دوای ئێوە دێن، وە کەس پلەی بەرزتر نەبێت لە ئێوە، مەگەر کەسێک وەک ئێوە بکات))؟ ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی ﷺ لە دوای هەموو نوێژێک سیو سێ جار (سبحان اللّه)و سیوسێ جار (الحمد اللّه)و سیو سێ جار (اللّه اکبر) بڵێن. ئیتر لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەرچون بە دڵخۆشی کە فێری ئەو زیکرە بوون.

پاش ماوەیەک چونەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: براکانمان گوێیان لێ بوو ئێمە چیمان دەوت ئەوانیش ئێستا وەکو ئێمە دەڵێن.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ئەوە فەزڵە خوا دەیبەخشێت بە هەرکەسێک ویستی لێ بێت)) (متفق علیه).

---

لە ئادابی زیکر: پابەند بوون بە کاتە دیاریکراوەکانەوە لەوانە لە دوای نوێژە فەرزەکان. پێش خۆرهەڵهاتنو پێش ئاوابونی خۆر وە لە نیوە شەودا.

# ذِكْرٌ واستِجابَةٌ

فِي واحد من مجالسِ الذِّكْرِ، قالَ أحَدُ الحاضرِينَ: إنِّي لأَعلَمُ متَى يَذْكُرُنِي ربِّي. وإذَا بمَقَالَتِه تَنزِلُ على أسماعِ رفاقِه كالصَّاعقة، إذْ كيفَ يَدَّعِي عابِدٌ ذلكَ لنفسه؟ فَسألُوهُ مُتعجِّبِينَ: تقولُ أنَّكَ تَعلَمُ حينَ يَذكُرُكَ ربُّكَ؟! فَقالَ في ثِقة: نَعَم! قَالُوا: ومتَى؟! قَالَ: إذَا ذَكَرْتُهُ ذَكَرَنِي، ثُمَّ تَلاَ: ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ﴾ [البقرة:١٥٢]. فذهَبَ عَنْهُمْ مَا تَعَجَّبُوا منْهُ، وعَلِمُوا أنَّهُ قَدْ صَدَقَهُمْ.

ثمَّ عادَتْ كلِماتُ العابدِ مِنْ جديد تقطَعُ حديثَهُمْ فقَالَ: وإنِّي لأعلَمُ متَى يستَجِيبُ لِي ربِّي! فقَالُوا: تعلمُ حينَ يستَجِيبُ لَكَ ربُّكَ؟! قَالَ: نَعَم!! قَالُوا: وكيفَ تَعلَمُ ذَلكَ؟! قَالَ: إذَا وَجِلَ قلبِي، واقشَعَرَّ جِلْدِي، وفَاضَتْ عَيْنَايَ، وفُتِحَ لِي في الدُّعاء، فَثَمَّ أعلَمُ أنْ قَدِ استُجِيبَ لِي.

فَعَلِمُوا أنْ قَدْ صدَقَهُمْ هذه المرَّةَ - أَيضاً -

---

المُسلِمُ يَعلَمُ أنَّهُ يَكُونُ جَلِيسُ ربِّه حينمَا يَذْكرُهُ، فَيَتَطَهَّرُ، ويَلبَسُ لمَجلِسِه أحسَنَ ثيابِه، ولاَ يَقولُ إلاَّ حَقّاً، ويَتَدَبَّرُ مَا يَقُولُ.

# زیکرو وەڵامدانەوەی

لە یەکێک لە کۆڕی زیکردا، یەکێک لە ئامادەبوان ووتی: من دەزانم کەی خوای گەورە یادم دەکات!! کاتێک ئەوەی وت لەسەر گوێگرانی هاوەڵی وەك بزیسکەیەک وابوو، چۆن دەبێت خوا پەرستێك ئیدیعای وا بکات بۆ خۆی؟ بۆیە زۆر بەسەر سورمانەوە پرسیان؟ ووتت: تۆ دەزانی کەی خوای گەورە یادت دەکات؟! کابراش بە متمانەوە وتی: بەڵێ! وتیان چۆن؟! ووتی: هەر کاتێک من یادم کرد ئەویش یادم دەکات پاشان فەرموی: ((فأذكروني أذكركم)) البقرة ١٥٢ سەرسورمانەکەیان نەما کە بیستیان‌و زانیان کە ئەو ڕاست دەکات.

پاشان خواپەرستەکە وتەیەکی نوێی ووت دیسان قسەی پێ بڕین ووتی: وە من دەزانم کەی خوای گەورە وەڵامم دەداتەوە! ووتیان: دەزانی کەی خوای گەورە وەڵامت دەداتەوە؟! ووتی: بەڵێ. ووتیان: چۆن ئەوە دەزانی؟! ووتی:کاتێک دڵە خورپەم بێت، پێستم گرژ بێت‌و چاوم فرمێسك بڕێژێ وە دەست بکەم بە دوعاو پاڕانەوە دەرگای دوعام بۆ بکرێتەوە، پاشان دەزانم خوای گەورە وەڵامم دەداتەوە. هاوەڵانی زانیان ئەم جارەش ڕاست دەکات.

---

موسوڵمان دەزانێت کاتێک یادی خوا دەکات لە خزمەت خوادایە بۆیە دەستنوێژ دەگرێ، جوانترین پۆشاك دەپۆشێت بۆ مەجلیسی زیکر و قسەی ڕاست دەکات، وە ئەوەی دەیڵێت باش بیری لێدەکاتەوە.

# صَاحِبُ الكَلِمةِ

كانَ رسُولُ الله ﷺ جَالساً وحولَهُ صحَابتُهُ الكرامُ ـ رِضوانُ الله عَليهِمْ ـ فَقالَ واحدٌ منْهُمْ الحمدُ لله حمداً كَثيراً طَيِّباً مُباركاً فيهِ. فَسَمِعَهُ رسُولُ اللهِ ﷺ فَقالَ «مَن صَاحِبُ الكلمةِ؟».

وهَنَا تَخوَّفَ الرَّجُلُ ألاَّ يكُونَ أحسَنَ الثَّناءَ على اللهِ ـ جلَّ وَعَلا ـ أو أَنْ يكُونَ قَدْ أخطَأَ خطأً كَرِهَهُ النَّبيُّ ﷺ، فآثَرَ السُّكُوتَ ولَمْ يَرُدَّ وعَلِم النَّبيُّ ﷺ بمَا يَدُورُ في نفسِ الرَّجُلِ فَأعادَ سُؤالَهُ مُطَمْئناً لَهُ قَائلاً «مَنْ هُوَ؟ فإنَّهُ لَمْ يَقُلْ إلاَّ صَوابَاً».

فَاطْمَأنَّ الرَّجلُ فَأسرَعَ يقولُ أنَا قُلتُهَا يَا رسولَ الله، أَرجو بِهَا الخَيرَ

فقالَ رسُولِ اللهِ ﷺ: «وَالذِي نفسِي بيَدِهِ، لَقَدْ رأَيتُ ثَلاثةَ عشر مَلَكاً يَبْتَدِرُونَ كلِمَتَكَ (يُسْرِعُونَ إِليهَا)؛ أَيُّهُمْ يَرفَعُهَا/ إِلى اللهِ تبارَكَ وتَعالَى» [الطبراني].

---

عَلى المُسلِمِ أَنْ يَتَعلَّمَ كيفَ يُحسِنُ الثَّناءَ على الله عزَّ وجلَّ، وَأَنْ يُريدَ بِذكْرِهِ للهِ الخَير على الدَّوام

# خاوەنی ووتەکە

پێغەمبەری خواﷺ جارێکیان دانیشتبوو، هاوەڵانیﭫ بە دەوریدا دانیشتبوون یەکێک لە هاوەڵان ووتی ((الحمد الله حمداً كثيراً طيبا مباركاً فيه)) واتە: سوپاس بۆ خوا سوپاسێکی زۆرو پاک‌و موبارەک)). پێغەمبەر ﷺ گوێی لێبوو فەرموی: ((خاوەنی ئەو وتەیە کێ بوو))؟! ئەو هاوەڵە ترسا لەوەی کە ستایشێکی جوان‌و باشی خوای گەورەی نەکردبێت یان هەڵەی کردبێت لە ستایشەکەیدا بۆ خوای گەورەو پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بێت، بڕیاریدا بێدەنگ بێت و وەڵام نەداتەوە، پێغەمبەر ﷺ زانی چی گوزەرا بە دەرونی ئەو هاوەڵەدا بۆیە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە تا دڵنیابێت لەوەی کە ووتی فەرمووی کێ بوو؟ بەڕاستی ئەوەی وتی: ((ڕاست‌و دروست بوو)).

کاتێک پیاوەکە دڵنیا بوو بە پەلە ووتی: من ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئومێدم خێربوو. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە بە ڕاستی بینیم سیانزە فریشتە پێشبڕکێیان دەکرد لەوەی کامیان زوتر ئەو وتە بەرز بکەنەوە بۆ لای خوای گەورە))(الطبراني).

---

لەسەر موسوڵمانە کە بزانێت چۆن بە جوانی ستایشی خوای گەورەی خۆی دەکات، وە مەبەست لە یادی خوا ئەوە بێت لەسەر چاکە بەردەوام بێت.

# الملائِكةُ ومجَالسُ الذِّكْرِ

إنَّ لله مَلائكةً مُوكَّلِينَ بمَجالسِ الذِّكْرِ، فإذَا وجَدُوا أُناساً يَذكُرُونَ اللهَ تَعالَى جاؤُوا وقعَدُوا معَهُمْ، فإذَا تفرَّقَ الذَّاكِرُونَ تَفرَّقَتِ الملاَئكةُ عائِدةً إلى ربِّهَا.

فَيَسألُهُمْ ربُّهُمْ وهُوَ أعلَمُ بِهِمْ: «مِنْ أينَ جِئْتُمْ؟».

فَيقولُونَ: مِنْ عند عِبَادٍ لكَ فِي الأرضِ يُسبِّحُونَكَ وَيكبِّرُونَكَ وَيهَلِّلونَكَ وَيحْمَدُونَكَ وَيسألُونَكَ.

فيقولُ تَعالَى: «وماذَا يَسألُونِي؟». فَيقولُونَ: يَسألونَكَ جنَّتَكَ. فيقولُ تَعالَى: «وهَلْ رأُوا جنَّتِي؟». فَيقولُونَ: لاَ، أَيْ رَبِّ. فيقولُ تَعالَى: «فَكيفَ لَو رأُوا جنَّتِي؟». فَيقولُونَ: وَيسْتَجِيرُونَكَ. فَيقولُ تَعالَى: «وَمِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي؟». فَيقولُونَ: مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ.

فيقولُ تعالَى: "وهَلْ رأُوا نَارِيْ؟». فَيقولُون: لا فَيقولُ تَعالَى: «فَكيفَ لَو رأُوا نَارِي؟». فَيقولُونَ: وَيستَغْفِرُونَكَ. فَيقولُ تَعالَى: «قَدْ غفَرتُ لَهُمْ فأَعطَيتُهُمْ مَا سَأَلُوا، وَأجَرتُهُمْ مِمَّا استَجَارُوا» [متفق عليه].

---

المُسلِمُ يَحرَصُ علَى أَنْ تَكُونَ مَجالسُهُ مُشتَملةً على التَّسبيحِ وَالتَّحميدِ وَالتَّهليلِ وَالتَّمْجيدِ وَالاستِغفارِ وسُؤالِ الجنَّةِ وَالاستِعَاذةِ مِنَ النَّارِ.

# فریشتەو کۆڕی زیکر

بەڕاستی خوای گەورە کۆمەڵێک فریشتەی هەیە، بریکارن بۆ کۆڕی زیکر، هەرکاتێک خەڵکیان بینی کۆبونەتەوەو زیکری خوا دەکەن دێنو لەدەوریان دادەنیشن، وە کاتێک کۆڕە زیکرەکە کۆتایی هاتو بڵاوەیان کرد فریشتەکانیش کۆڕەکە جێدەهێڵنو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە (خوای گەورە زاناترە). پرسیاریان لێدەکات ((لە کوێ بون))؟ دەڵێن: لای بەندەکانت بووین لەسەر زەوی (سبحان اللّٰه واللّٰه اکبر و لا إله الا اللّٰه و الحمد لله)یان دەکردو لە تۆ دەپاڕانەوەو داوایان دەکرد.

خوای گەورە فەرموی: ((داوای چییان کرد))؟ دەڵێن: داوای بەهەشتیان دەکرد.خوای گەورە فەرموی: جا بەهەشتیان بینیوە؟ دەڵێن: نەخێر. خوای گەورە فەرموی: جا ئەگەر بەهەشت ببینن چۆن داوای دەکەن؟ هەروەها دەڵێن: داوای پەنایان دەکرد. خوای گەورە فەرموی: لەچی داوای پەنایان دەکرد لە من؟! دەڵێن: داوای پەنایان دەکرد ئەی خوای گەورە لە ترسی ئاگری دۆزەخ. خوای گەورە فەرموی: ئایا ئەوان ئاگری منیان دیوە؟ دەڵێن: نەخێر. خوای گەورە فەرموی: ئەگەر ئاگر ببینن چۆن داوای پەنا دەکەن. دەڵێن: داوای لێخۆش بوونیان دەکرد. خوای گەورە فەرموی: ((بەڕاستی لێیان خۆش بووم وە داوای چییان کردووە پێمبەخشین و پەنایان لەچی گرت پەنام داون))(متفق علیه).

---

دەبێت موسوڵمان سور بێت لەسەر ئەوەی لە هەر کۆڕێکدابوو زیکرو یادو تەسبیحاتی خوای تێدا بێت وە داوای بەهەشتو پەنای ئاگرو داوای لێخۆش بوون بکات.

# لَيتَهُ لَمْ يَتَكلَّمْ

جلَسَ رسُولُ الله ﷺ ومعَهُ بعضُ صحَابتِهِ، والنَّاسُ مِن حَولِهِمْ حِلَقٌ يَذْكرُونَ اللهَ تَعالَى.

ثُمَّ حدَثَ مِنْ رسولِ الله ﷺ أمرٌ، شَدَّ انتباهَ الجالسِينَ حولَهُ، وأثارَ فُضُولَهُمْ، حيثُ رَفَعَ النَّبيُّ ﷺ بصرَهُ إلى السَّماءِ، ثمَّ عادَ يُرجعُ بِبَصَرِهِ إلى الأرضِ، كأنَّهُ يَنظُرُ إلى شيءٍ هَابطٍ مِنَ السَّماءِ إلى الأَرضِ، يَراهُ؛ ولاَ يَرَاهُ النَّاسُ مِنْ حَولِهِ. ثمَّ عادَ ﷺ يرفَعُ البَصَرَ نحوَ السَّماءِ كأنَّما يُوَدِّعُ بهِ شَيَئاً صَاعِداً نحوهَا. فَلَمْ يَمْلكْ بعضُ مَنْ لاحَظَ ذلكَ نفسَهُ، فَسَأَلُوا رَسُولَ الله ﷺ عَنْ ذلكَ، فَقالَ ﷺ: «إنَّ هؤلاءِ القومَ ــ وأشارَ إلى أهلِ مجلسٍ أمامَهُ ـ كانُوا يَذْكُرُونَ اللهَ ــ تَعالى ـ فنَزلَتْ علَيهِمُ السَّكِيْنَةُ تَحْمِلُهَا الملائكةُ كَالقُبَّةِ، فلَمَّا دَنَتْ مِنهُمْ، تكَلَّمَ رَجلٌ مِنْهُمْ بِباطلٍ، فَرُفِعَتْ عنْهُمْ» [ابن المبارك].

---

الذَّاكرُ لاَ يَتكَلَّمُ في مجلِسِهِ إلاَّ بخَيرٍ، فَإنَّ الملائكَةَ المُوكَّلةَ بمجَالسِ الذِّكْرِ لا تَحْضُرُ المَجلِسَ الذِي يَتحَدَّثُ فيهِ النَّاسُ بالبَاطِلِ.

٨

# خۆزگە قسەی نەدەکرد

پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو وە هەندێ لە هاوەڵانی لەگەڵ بوو، خەڵکیش بە دەوریاندا ئەڵقەی زیکریان بەستبوو، یادی خوایان دەکرد. پاشان ڕوداوێک هات بەسەر پێغەمبەردا ﷺ دانیشتووانی دەوری پێغەمبەر بە زوویی بە ئاگا هاتن و سەرسام بوون، کاتێک پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان پاشان چاوەکانی گەڕاندەوە بۆ سەر زەوی، وەک ئەوەی سەیری شتێک بکات لە ئاسمانەوە دابەزێتە زەوی، ئەو دەیبینێ بەڵام خەڵکی دەوروبەری نایبینن.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەکانی گێڕایەوە بۆ ئاسمان وەک ئەوە خواحافیزی لە شتێک بکات کە سەر دەکەوێت، هەندێک لەو خەڵکە ئاگای لەخۆی نەمابوو هێندە وورد چاویان بڕیبویە حاڵەتەکە، بۆیە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەو ڕوداوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ((ئەو کۆمەڵە خەڵکە –ئاماژەی کرد بۆ ئەوانەی لە بەردەمیدا دانیشتبوون- یادی خوایان دەکرد کۆمەڵێک فریشتە سەکینەو ئارامییان لە شێوەی گومەزەیەک هەڵگرتبوو، کاتێک نزیک بونەوە کەسێک لە ناو خەڵکەکە قسەی بەتاڵی کرد سەکینەو ئارامیەکەشی بەرز کرایەوە)).(ابن المبارەک).

---

یادکەر نابێت لە مەجلیسی زیکردا بیجگە لە خێر هیچی تر بڵێت، چونکە فریشتە گەڕۆکەکان لای کۆڕێک لانادەن قسەی پڕوپوچ و بەتاڵی تێدا بکرێت.

# حَلقاتُ الذِّكْرِ

ذاتَ يَومٍ ، كانَ الرَّسُولُ ﷺ جَالِساً مـعَ أصـحابِهِ في حَلْقةٍ في المَسجدِ ، فَأقبَـلَ ثَلاثـةُ رِجـالٍ ، فَابتَعَـدَ رَجـلٌ مِنْهُمْ وخَرَجَ مِنَ المَسجدِ ، وَاقتَرَبَ رَجُـلانِ مـنَ الحَلْقـةِ فَرأى أحَدُهُمَا مَكاناً خَالِياً في الحَلْقة فَجلَسَ فيـه ، وَأمَّـا الثَّانِي فَلَمْ يَجَدْ مَكاناً فَاستَحْيَا أنْ يُزاحِمَ وجَلَسَ خَلفَهُمْ

فَقالَ النَّبيُّ ﷺ: «ألاَ أُخبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاثـةِ أمَّـا أحَدُهُمْ فَأوَى إلى اللهِ فآواهُ اللهُ (أيْ ضَمَّهُ اللهُ إلى رَحمتـه ورِضْوانه). وأمَّا الآخرُ فَاستَحْيَا فَاستَحْيَا اللهُ منْـهُ (رحمَـهُ ولَـمْ يُعاقِبْـهُ)، وأمَّـا الآخَـرُ فـأعرَضَ فَـأعرَضَ اللهُ عَنْـهُ (سَخِطَ عليه)» [البخاري].

---

قَالَ ﷺ: «لاَ يَقْعُدُ قَومٌ يَذْكُرونَ اللهَ إلاَّ حَفَّتْهُمُ الملائكـةُ وَغشِـيَتْهُمُ الرَّحمةُ ونزلَتْ عَليهِمُ السَّكِينَةُ وذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِندَهُ» [مسلم].

# کۆڕی زیکر

ڕۆژێکیان، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا لە مزگەوت کۆڕییان گرتبوو، سێ پیاو هاتنە لایان یەکێک لەو پیاوانە دوورکەوتەوەو چویە دەرەوەی مزگەوت، دووانەکەی تر نزیک بونەوە لە کۆڕەکە، یەکێکیان جێگەیەکی خاڵی بینی‌و لێی دانیشت، ئەوی تر جێگەی نەدییەوە و شەرمی کرد ئازاری کۆڕەکە بدات، بۆیە لە پشتەوە دانیشت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((ئایا هەواڵتان بدەمێ لەسەر ئەو سێ کەسە: ئەمەیان کە هاتە ناو کۆڕەکە ڕویکردە خوا، خوای گەورەش بەڕەحمەت‌و ڕازی بوونی خۆی گرتی. ئەوەیان کە شەرمی کرد خوای گەورەش شەرمی لێکرد. (ڕەحمی پێکردو سزای نادات). بەڵام ئەوەیان پشتی هەڵکردو ڕۆشت خوای گەورەش پشتی لێکردو لێی توڕە بوو.(البخاری).

---

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هیچ گەلێک کۆنابنەوە کە زیکری خوا بکەن ئیلا کۆمەڵێک فریشتە دەوریان دەگرن‌و ڕەحمەتی خوایان بەسەردا دەبارێنن‌و سەکینەت‌و ئارامییان بۆ دادەبەزێنن وە خوای گەورەش یادیان دەکات لای فریشتەکان.(مسلم).

# مَجلِسٌ وذِكْرَى

خرجَ أميرُ المؤمنينَ مُعاويةُ بنُ أبي سُفيانَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ إلى المَسجدِ فَوجَدَ جَماعةً منَ المُسلمينَ يَجلسُونَ في دائرةٍ ، فَاقتربَ منْهُمْ وسَأَلَهُمْ ما أَجلَسَكُمْ؟ قَالُوا جَلَسْنَا نذْكُرُ اللهَ. فَاستَحْلَفَهُمْ رضي الله عنه عَلَى مَا قَالُوا. فقَالُوا : وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إلاَّ ذاكَ . فَأَخبَرَهُمْ مُعاويةُ رضي الله عنه أَنَّهُ لَمْ يَسْتَحْلِفْهُمْ تُهْمةً لَهُمْ.

ثُمَّ حكَى لَهُمْ أَنَّ رسُولَ اللهِ ﷺ خرجَ علَى حَلْقةٍ منْ أصحابِهِ ، فقالَ «مَا أجْلَسَكُمْ؟». قَالُوا : جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللهَ ونحمَدُهُ علَى مَا هَدانَا لِلإسلامِ ومَنَّ به عَلينَا . فَقالَ ﷺ: "آللهِ مَا أجْلَسَكُمْ إلاَّ ذاكَ ؟». قَالُوا واللهِ مَا أجْلَسنَا إلاَّ ذاكَ . فقالَ «أمَا إنِّي لَمْ أَستَحْلِفْكُمْ تُهْمةً لَكُمْ ، ولَكنْ أَتاني جبريلُ فَأَخبَرَني أنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يُباهي بِكُمُ الملائِكةَ (يُبيِّنُ لَهُمْ فَضْلَكُمْ وحُسْنَ أعمالِكُمْ)». [متفق عليه].

---

مِنْ آدابِ الذِّكرِ : الإخلاصُ ، وَالاجتماعُ علَى الذِّكْرِ ، وأَنْ يكُونَ في المَسجدِ ، فهذَا ممَّا يُقَرِّبُ المُسلِمَ مِنْ ربِّهِ .

# کۆڕێك و یادەوەرییەك

ئەمیری موسوڵمانان (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت، چوو بۆ مزگەوت، بینی کۆمەڵێك لە موسوڵمانان لە مزگەوت کۆبونەتەوە بازنەیەکیان دروستکردووە، نزیك بویەوە لێیان و پرسیاری لێکردن: بۆچی دانیشتوون؟ ووتیان: دانیشتووین زیکری خوا دەکەین. ئەمیری موسوڵمانان سوێندی دان لەسەر ئەوەی ووتیان. ئەوانیش ووتیان: سوێند بەخوا بۆ ئەوەنەبێت بۆ هیچی تر دانەنیشتووین، موعاویە هەواڵی دانێ کە سوێندم دان بۆ تۆمەت نەبوو لەسەرتان.

پاشان گێڕایەوە بۆیان کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر لای هەندێ لە هاوەڵەکانی. فەرمووی بۆچی دانیشتوون؟ وتیان: دانیشتووین زیکری خوا دەکەین و سوپاسی دەکەین لەسەر ئەوەی هیدایەتی داین بۆسەر ئیسلام و منەتی خستە سەرمان. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: توخوا کۆبونەتەوە تەنها بۆ ئەوە؟ ئەوانیش ووتیان: سوێند بەخوا تەنها بۆ ئەوە کۆبوینەتەوە. فەرمووی: ((من سوێندم نەدان کە گومانم لێتان هەبێت، بەڵام جوبرەئیل هاتە لام و هەواڵی دامێ کە خوای گەورە شانازیتان پێوە دەکات لەناو فریشتەکانیدا، ڕێزو کردەوەی جوانتان باس دەکات لایان)) (متفق علیه).

---

لە ئادابی زیکرە: دڵسۆزی بۆ خوا، وە کۆبونەوە لە کۆڕی زیکر لە مزگەوتدا، ئەوە دەبێتە هۆی نزیك بونەوەی موسوڵمان لە خوای خۆی.

# الصَّلاةُ في بَطْنِ الحُوتِ

أرسَلَ اللهُ ـ جَلَّ وعَلاَ ـ يُونُسَ عليه السلام إلى قَومِه يَدْعُوهُمْ إلى عبادةِ الله ـ تَعالَى ـ وَحْدَهُ، فَلَمْ يَستَجِيبُوا لَهُ زَماناً طَويلاً.

ولَمَّا رأى يُونُسُ عليه السلام إصْرَارَهُمْ على الكُفرِ؛ تَركَهُمْ وَاتَّجَهَ إلى الشَّاطِئِ لِيَرْحَلَ عَنْهُمْ. فركِبَ سَفينَةً، فلَمَّا سَارَتْ هَاجَتِ الرِّيحُ، وَارتفَعتِ الأَمواجُ، وظَنَّ أصحابُهَا أَنْ لاَ نَجاةَ لَهُمْ إلاَّ بالتَّخلُّصِ مِنْ بعضِ الأحمالِ وَالرُّكابِ، فَأَجْرَوا لأَجلِ ذلكَ قُرْعَةً، وكانَ يونُسُ عليه السلام مِنْ بينِ مَنْ أصابَتْهُمُ القُرْعَةُ، فَأَلقَوهُ في البَحرِ، فَجاءَ حُوتٌ كبيرٌ فابتَلَعَهُ.

ولَمْ يَنْسَ يونُسُ عليه السلام ـ رُغْمَ مَا نَزَلَ بهِ مِنْ كَرْبٍ ـ ذِكْرَ ربِّهِ ـ جَلَّ وعَلا ـ فكانَ يَذْكُرُهُ هناكَ في بطنِ الحُوتِ قَائلاً: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [الأنبياء:٨٧].
فَاستجَابَ لَهُ ربُّهُ ونَجَّاهُ مِمَّا حَلَّ بهِ مِن كَرْبٍ وغَمٍّ.

---

قَالَ ﷺ عن دَعْوةِ ذي النُّونِ [يونُس عليه السلام] وهُوَ في بَطنِ الحُوتِ: «فإنَّهُ لَمْ يَدْعُ بها رَجُلٌ مُسلِمٌ في شيءٍ قَطُّ إلاَّ استَجابَ [اللهُ] لَهُ» [الحاكم].

# پاڕانەوە لە سکی نەهەنگدا

خوای گەورە (یونس) پێغەمبەری نارد بۆ سەر گەلەکەی تا بانگیان بکات بۆ خوا پەرستی بە تاکو تەنیا. ماوەیەکی زۆر وەڵامیان نەدایەوە. پێغەمبەر (یونس) (علیە السلام) بینی سورن لەسەر کوفر، بەجێی هێڵان‌و بەرەو قەراغ دەریا کەوتە ڕێ تا کۆچ بکات، سواری کەشتیەک بوو، ماوەیەک ڕۆشتن، پاشان ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵیکرد، شەپۆلی دەریا بەرز بویەوە هاوەڵەکانی پێیان وابوو ڕزگاریان نابێت مەگەر هەندێ باری کەشتیەکە سوک بکەن‌و کەسێکیشیان لە کەشتیەکە دەرکەن، بۆ ئەو مەبەستە تیروپشکیان کرد. پێغەمبەر یونس (علیە السلام) لەناو ئەوانەدا بوو تیرو پشکیان بۆ کرد ئەو بەرکەوت لە تیروپشکەکەدا. بۆیە فڕێیان دایە ناو دەریاکەوە، خێرا نەهەنگێک هات‌و قوتیدا. پێغەمبەر (یونس) لەگەڵ ئەو پەژارەو گرفتەی بۆی هات —یادی پەروەردگاری لەبیر نەچوو. ئەو لەناو سکی ئەو نەهەنگەدا کەوتە یادی خوا فەرموی:﴿ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (الانبياء ٨٧).

واتە: جگە لەتۆ پەرستراوێکی تر نیە، پاک‌و بێگەردی بۆ تۆ، من کۆمەڵی ستەمکارانم.

خوای گەورەو میهرەبان وەڵامی پێغەمبەر یونسی دایەوە و ڕزگاری کردو غەم‌و پەژارەکەی بۆ لابرد.

---

پێغەمبەر ﷺ لەسەر نزاکەی پێغەمبەر یونس که لەسکی نەهەنگەکەدا بوو فەرموی:(بەڕاستی هەرکەسێک بە نزاکەی (یونس) پێغەمبەر داوا بکات ، خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە))) (الحاكم).

# الذِّكْرُ الدَّائمُ

جَاءَت امـرأةٌ مِـنْ بَنِـي أَسَـدٍ إلى أُمِّ المـؤمنينَ السَّـيِّدةُ عَائِشةَ بنتِ أَبي بكرٍ ـ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا ـ تَزُورُهَا، فَبينَمَا هِي عِندَهَا إِذْ دخَلَ رسُولُ اللهِ ﷺ، فلَمَّا رأى المرأةَ سَأَلَ عَائِشةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ـ قَائلاً: "مَن هذِهِ؟"

قَالتْ عائشةُ: فُلانَةُ، لا تَنامُ اللَّيلَ.

ثمَّ راحَتْ تَذْكُرُ مِنْ صَلاتِهَا وَصبْرِهَا على العِبادةِ.

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «عَليكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَواللهِ لا يَمَلُّ اللهُ حتَّى تَملُّوا».

وَأخبَرَتِ السَّيِّدةُ عَائشةُ ــ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا ـ أنَّ أحَـبَّ الدِّينِ إلى النَّبيِّ ﷺ مـا كَـانَ يُـداوِمُ عَليـهِ صـاحِبُهُ. [متفـق عليه].

---

مِنْ آدابِ الذِّكرِ ألاَّ يَتكلَّفَ المَرءُ مِنَ الذِّكرِ مَا لاَ يُمكنُـهُ الاستِدَامةُ عليهِ، فَلاَ يَحْسُنُ بالمُسلِمِ أنْ يكُونَ على عبادةٍ وذِكْرٍ ثُمَّ يترُكُهَا.

# زیکری بەردەوام

ئافرەتێکی تیرەی بەنی ئەسەد دەهاتە لای دایکی موسوڵمانان خاتوو عائشەی کچی ئەبوبەکر ﵁ بۆ دیدەنی. جارێکیان لە لای حەزرەتی (عائشە)﵂ بوو پێغەمبەر ﷺ چووە لای حاتوو عائشە، کە ئەو ئافرەتەی بینی فەرموی: عائشە ئەوە کێیە؟ خاتوو عائشە فەرموی: ئەمە فلأن کەسە، کە بەشەو ناخەوێت پاشان ئافرەتەکە ڕۆشت،و خاتوو عائشە باسی نوێژو ئارامگری کرد لەسەر خوا پەرستی، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لەسەر ئێوەیە ئەوەی لە تواناتان دایە. سوێند بە خوا، خوای گەورە ماندوو نابێت بەڵکو ئێوە ماندو دەبن)).

خاتوو عائشە ﵂ هەواڵیدا کە خۆشەویسترین دینداری بەلای پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێت.(متفق علیه).

---

لە ئادابی زیکرەکە: زاکیر زۆر لە خۆی نەکات تا بتوانێت بەردەوام بێت، جوان نیە بۆ موسوڵمان کە ماوەیەک لەسەر خواپەرستیو زیکرکردن بێتو پاشان وازی لێ بێنێت.

# مَجالِسُ الخيرِ

كانَ الصَّحَابيُّ الجَليلُ عبدُ اللهِ بنُ رَوَاحةَ رضي الله عنه عَاشِقاً لمجالسِ الذِّكْرِ، حَرِيصاً على إقامَتِهَا، فكانَ يَخرُجُ مِنْ بَيتِهِ بَاحِثاً عَنْهَا وداعِياً إليهَا، وكانَ إذَا لَقِيَ رَجلاً مِنْ أصحابِ رسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ لهُ تَعالَ نُؤْمِنُ بربِّنَا ساعةً

فخرَجَ ذاتَ يومٍ، فَلقِيَهُ رَجلٌ مِن أصحابِهِ، فَقالَ لهُ عبدُ الله رضي الله عنه: تَعالَ نُؤْمِنُ سَاعةً. فَغَضِبَ الرَّجلُ مِنْ مَقالَتِهِ، وذَهَبَ إلى النَّبي ﷺ فقالَ: يَا رسُولَ اللهِ! ألاَ تَرَى إلى ابنِ رَوَاحَةَ يُرغِّبُ عَن إيمانكَ إلى إيمانِ سَاعةٍ؟!

فَقالَ النَّبيُّ ﷺ: «يَرحَمُ اللهُ ابنَ رَوَاحَةَ؛ إنَّهُ يُحِبُّ المَجَالِسَ التي تَتَباهَى بهَا الملائِكةُ» [أحمد].

---

قَالَ رسُولُ اللهِ ﷺ عَن ثوابِ الذينَ يجتَمعُونَ على الذِّكْرِ "نَادَاهُمْ مُنادٍ مِنَ السَّماءِ أَنْ قومُوا مَغْفوراً لَكُمْ، قَدْ بُدِّلَتْ سَيِّئَاتُكُمْ حَسَنَاتٍ» [أحمد].

# کۆڕی چاکە

عبداللە کوڕی ڕەواحە ﷺ یەکێک بوو لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە زۆر عاشقی کۆڕی زیکر بوو، سوربوو لەسەر بەستنی کۆڕی زیکر، ئەو هەرجارێک لەماڵ دەردەچوو هەواڵی کۆڕی زیکری دەپرسی خەڵکی بۆ بانگ دەکرد، کە ئەگەر بگەشتایە بە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەیوت: وەرە با چەند ساتێک ئیمان بەخوا نوێ بکەینەوە. بۆیە ڕۆژێکیان لەماڵ دەرچوو گەیشت بە پیاوێک لە هاوەڵان پێی ووت: وەرە با ساتێک ئیمان بهێنین! کابرا توڕە بوو لەو قسەیەو چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبینی لای عبداللە کوڕی ڕەواحە ئارەزوی لە ئیمانت نیەو باس لە ئیمانی ساتێک دەکات. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((خوای گەورە ڕەحم بکات بە ئیبن ڕەواحە، ئەو کۆڕێکی خۆش دەوێت کە تێیدا شانازی پێ بکرێت بەسەر فریشتەکاندا))(ئیمام أحمد).

---

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لە پاداشتی ئەوانەی کۆڕی زیکر دەبەستن بانگ کەرێک لە ئاسمانەوە بانگ دەکات هەستن هەموتان بەخشراون، گوناهەکانتان گۆڕاوە بە چاکە).(أحمد).

# دُمُوعُ النَّبيِّ ﷺ

ذاتَ يومٍ، قَالَ النَّبيُّ ﷺ لعبدِ اللهِ بنِ مَسعودٍ رضي الله عنه: «اقرَأْ عليَّ». وكانَ رضي الله عنه مِنْ أعلَمِ الصَّحابةِ بالقُرآنِ وأنْداهُمْ بِهِ صَوتاً. فَاحتَارَ عبدُ الله فيمَا سَمعَ، وقَالَ مُعبِّراً عَن حَيْرَتِهِ: يَا رسولَ اللهِ؛ أقرأُ عَليكَ وَعليكَ أُنزِلَ؟

فيَقُولُ النَّبيُّ ﷺ: «إنِّي أُحبُّ أنْ أسْمَعَهُ مِنْ غَيرِي».

فَيستَجيبُ عبدُ الله رضي الله عنه مِنْ فَوْرِهِ ويَبدأُ في القِراءةِ، فيفتَتِحُ سُورةَ النِّساءِ يَقرأُ مِنْهَا، حتى بلَغَ قولَهُ تَعالَى: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ [النساء:٤١]. فَيَسْتَوقِفُهُ رسُولُ اللهِ ﷺ قائلاً: «حَسْبُك». قَدْ قالَهَا في نَبْرةٍ غلَبَ عَليهَا الحُزْنُ وبَدا فيهَا أثَرُ البُكاءِ.

ويتوقَّفُ ابنُ مَسعودٍ رضي الله عنه، وقَدْ هالَهُ مَا ظهَرَ في صَوتِ النَّبيِّ ﷺ مِنْ حُزْنٍ وبُكاءٍ، ثُمَّ يَرْفَعُ بصَرَهُ إلى حَبيبِهِ ﷺ فإذَا هُوَ يَبْكِي. [متفق عليه].

---

مِنْ آدابِ الذِّكْرِ: استِماعُهُ مِنَ الغَيرِ؛ فإنَّ الاستِماعَ أيْسَرُ وأكثَرُ عَوْناً علَى الفَهمِ والتَّدبُّرِ، كمَا أنَّ في الذِّكْرِ الجَمَاعيِّ تَجْدِيداً لنَشاطِ الذَّاكِرينَ. -

# فرمێسکی پێغەمبەر ﷺ

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرموی بە عبداللە کوڕی مەسعود رضي الله عنه ((قورئانم بەسەردا بخوێنە)) (عبداللە لە شارەزاترینی هاوەڵانی بوو لە قورئان‌و دەنگێکی کەمەندکێشی هەبوو). عبداللە سەرسام بوو لەوەی کە بیستی. بۆیە زۆر بەسەرسامیەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من بۆت بخوێنم کە بۆ سەر تۆ دابەزیوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((پێم خۆشە لەکەسێکی ترەوە گوێم لە قورئان بێت)). دەست بەجێ عبداللە دەستی کردە قورئان خوێندن لە سەرەتای سورەتی (النساء) تا گەیشتە ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿جا چۆن دەبێت کاتێک لە هەر گەلێک شایەتێک دەهێنین تۆش شایەت دەبیت بەسەر ئەواندا﴾(النساء ١٤١). پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاندی فەرموی: بەسە.

بەڕاستی کە ئەوەی فەرموو بە ئاوازێکی پڕ لە پەژارەو قورگی پڕ لە گریان (ئیبن مەسعود) رضي الله عنه وەستا لە خوێندنەکەی لەبەر دەنگی حوزن‌و گریانی پێغەمبەر ﷺ پاشان چاوی بەرزکردەوە بۆ لای خۆشەویستەکەی بینی کە پێغەمبەر ﷺ دەگریا. (متفق علیه).

---

لە ئادابی زیکرە: گوێگرتن لە کەسێکی دی، چونکە گوێگرتن ئاسانترو زیاتر یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن‌و تێڕامان. هەروەها زیکر بە کۆمەڵ دەبێتە هۆی نوێبونەوەی چالاکی زیکر کاران.

# المِيـزَانُ

صلَّى رسُولُ اللهِ ﷺ بأصحابِهِ صلاةَ الصُّبحِ، ثُمَّ انصَرَفَ فَدَخلَ على زَوجِهِ أُمِّ المُؤمنينَ جُوَيْرِيَّةَ بنتِ الحارِثِ ـ رَضِي الله عَنْهُمَا ـ فإذَا هِي جالِسةٌ تَذْكُرُ اللهَ عزَّ وجلَّ، فَتَرَكَهَا وشَأْنَهَا ومَا شَغَلَتْ بهِ نفسَهَا مِنْ تَسبيحٍ وَتكبيرٍ وَتحميدٍ وَتهليلٍ وسُؤالٍ وَاستِغفَارٍ، وَخرَجَ ﷺ.

فلمَّا ارتفَعَ الضُّحَى ـ قَريباً مِنْ مُنتَصَفِ النَّهارِ ـ رجَعَ ﷺ فَوجَدَ أُمَّ المُؤمنِينَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ـ على الحالِ التي تركَهَا عَلَيْهَا مِنَ الذِّكْرِ، فقالَ ﷺ: «مَا زِلْتِ اليومَ على الحالِ التي فَارَقْتُكِ عليهَا؟» قالَتْ: نَعَم.

فَقالَ ﷺ: «لَقَد قُلْتُ بعدَكِ أربعَ كَلماتٍ ـ ثلاثَ مرَّاتٍ ـ لَو وُزِنَتْ بمَا قُلْتِ منذُ اليومَ لوَزَنَتْهُنَّ: سُبحانَ الله وبحمدِهِ، عددَ خلْقِهِ، ورِضَا نفسِهِ، وزِنةَ عَرْشِهِ، ومِدادَ كلماتِهِ» [مسلم].

---

مِنْ آدابِ الذِّكْرِ: ذِكْرُ اللهِ بالجوامعِ مِنَ الذِّكْرِ، وَتكْرارُ الذِّكْرِ ثَلاثاً، فَذلِكَ أدْعَى لِلتَّفكُّرِ وَالتَّدبُّرِ في مَعانِي الذِّكْرِ.

# تەرازوو

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی لەگەڵ هاوەڵاندا ئەنجامدا. پاشان ڕۆیشتو چووە لای خێزانی (دایکی موسوڵمانان) جوەیریەی کچی حاریث ﵂ لە کاتێکدا ئەو دانیشتبوو زیکری خوای گەورەی دەکرد، وازی لە پێغەمبەر هێناو خەریکی خۆی بوو سەرقاڵ بوو بە تەسبیحاتو تەکبیرو الحمدالله –لاإله إلا الله-دوعاو – داوای لێبوردن. پێغەمبەری خوا ﷺ جێی هێڵاو دەرچوو کاتێک خۆر بەرز بویەوە بۆ کاتی چێشتەنگاو پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە ماڵەوە، دایکی موسوڵمانانی دی ﵂ هەر سەرقاڵی زیکری خوا بوو بەو جۆرەی کە جێی هێڵابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەو کاتەی جێم هێڵاوی ئەمڕۆ هەر خەریکی زیکری خوا بویت؟ فەرمووی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی لە دوای تۆ چوار وشەم وتووە، سێ جار. ئەگەر بکێشرێت بەوەی کە تۆ ئەمڕۆ وتوتە بە ئەندازەی ئەوە دەبێت کە ئەویش ((سبحان الله و بحمده عدد خلقه ورضاء نفسه وزنه عرشه ومداد كلماته)) (مسلم).

---

لە ئادابی زیکرە: زیکرکردنی خوا بە کۆی زیکرەکان وە سێ بارەکردنەوەی زیکر. لەبەر ئەوە داخوازە بۆ تێڕامانو بیرکردنەوە لە واتاکانی زیکر.

# التَّسبِيحُ وَالنَّوَى

ذَاتَ يَومٍ، جَلَسَتْ أُمُّ المُؤمنينَ صَفيَّةُ بِنتُ حُيَي ـ رَضِي الله عَنْهَا ـ تُسَبِّحُ ربَّهَا، وقَدْ أحضَرَتْ بينَ يدَيْهَا أربعةَ آلافِ نَوَاةٍ، كُلَّمَا سبَّحَتْ تَسبيحةً أخذَتْ نواةً مِمَّا أمَامَهَا فأبعدَتْهَا.

وجَاءَ رسُولُ الله ﷺ فَدخَلَ عَليهَا وَهِيَ تَصنَعُ ذَلِكَ، فَقالَ: «يَا بِنتَ حُيَيٍّ مَا هذَا؟». قَالَتْ: أُسبِّحُ بِهِنَّ.

فَقالَ ﷺ: «قَدْ سَبَّحْتُ (الآنَ) منذُ قُمْتُ على رأسِك، أكثَرَ مِنْ هذَا»، فَقالَتْ أُمُّ المؤمِنينَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: عَلِّمْنِي يَا رسُولَ الله. قَالَ: «قُولِي: سُبحانَ الله عددَ مَا خلَقَ مِنْ شَيءٍ». [الحاكم].

---

يَجُوزُ عَدُّ وحسابُ الذِّكرِ بكل وَسيلةٍ مَشْروعَةٍ للعَدِّ: كالحَصى أوِ المسْبَحة، إلاَّ أنَّ عَقْدَ الذِّكْرِ وعَدَّهُ بالأَنامِلِ أَفضَلُ.

# تەسبیحاتو وردە بەرد

رۆژێک دایکی باوەڕداران (صەفیە کچی حویەی) ﵂ دانیشتبو، تەسبیحاتی خوای دەکرد، لەو کاتەدا چوار هەزار وردە بەردی دانابوو، هەر تەسبیحاتێکی دەکرد، بەردێکی لە پێش خۆی هەڵدەگرتو دوری دەخستەوە.

پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لایو چووە ژورەوە بینی وادەکات، فەرموی: (ئەی کچی حویەی) ئەمانە چین؟ فەرموی: تەسبیحاتی پێدەکەم.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: من لەو کاتەوە لەلای تۆ هەستام تا ئێستا لەوە زیاترم تەسبیحات کردووە. دایکی باوەڕداران فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەش فێری من بکە. فەرموی: بڵێ: پاکو بێگەردی بۆ خوا بە ئەندازەی ئەو شتانەی دروستی کردووە. (الحاکم).

---

دروستە ژماردنو حسابکردنی زیکری خوا بە هەموو وەسیلەو ڕێگەیەکی شەرعی. وەک وردە بەرد یان تەسبیح. بەڵام زیکرو بژاردنی بەسەری پەنجەکان باشترە.

# قَصصُ آدابِ الذِّكْرِ

مَا أَحلَى ذكر الله عَلى أَلسنَة الذين يَذْكُرُونَ الله كَثيراً، وَأَرقَّهُ علَى أَسماعِهِم، وَأَسعَدَهُمْ بهِ فِي الآخرةِ عندَ لقاء ربِّهِمْ، قَالَ رسُولُ الله ﷺ لأصحابِهِ ـ رضوانُ الله عَليهِمْ ـ «أَلا أُنبِّئُكُمْ بخَيرِ أَعمالكُمْ، وَأَزكَاهَا عندَ مَلِيككُمْ، وَأَرفَعِهَا فِي دَرجاتكُمْ، وَخيرٍ لَكُمْ مِن إنفَاقِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ (الفضَّة)، وَخيرٍ لَكُمْ مِنْ أنْ تَلقَوْا عدُوَّكُم فَتضْرِبُوا أعناقَهُمْ ويضْرِبُوا أعناقَكُمْ؟». قَالُوا: بَلَى. قَالَ: «ذِكْرُ الله تَعالَى» [الترمذي وأحمد].

وَمجَالسُ الذِّكْرِ تُورِثُ القلبَ طُمَأنينةً وَأَمْناً، قَالَ تَعالَى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ [الرعد:٢٨].

وَهِي تَملأُ القَلبَ رِقَّةً وتَزيدُهُ إيماناً وحتَّى يُؤتِي الذِّكْرُ ثِمَارَهُ، فَلا بُدَّ لِلذَّاكِرِ مِنْ عِلْمٍ يتعَلَّمُهُ، وَآدابٍ يَتحَلَّى بِهَا، وَفِي هذَا الكتابِ قَدَّمْنَا بعض هذه الآدابِ، في صُورَةٍ مُختَصَرَةٍ وَطَريقةٍ مُيَسَّرَةٍ، عسى أَنْ يَنتَفِـع بهَا كُلُّ مُسلمٍ وَمُسلِمَةٍ.

❊ ❊ ❊ ❊

# چیرۆكی ئادابەكانی یادی خوا

یادی خوای گەورە چەند جوان‌و شیرینە لەسەر زوبانی ئەوانەی یادی خوا زۆر دەكەن. ئەو یادە لەڕۆژی دواییدا بەختەوەریان دەكات. كاتێك بە دیداری خوا شاد دەبن. پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: هەواڵتان بدەمێ بە چاكترین كردەوەتان و پاكترین كردەوە لای پاشاو گەورەتان، وە بەرزترین پلەی قیامەتتان، بەڵكو زۆر چاكترو گەورەتریشە لە بەخشینی ئاڵتون و زیو لە پێناو خوادا، بەڵكو زیاتر لەوەش چاكترو باشترە لەوەی ڕوبەڕوی دوژمنتان ببنەوەو لە گەردنیان بدەن یان لە گەردنتان بدەن؟ وتیان: بەڵێ. فەرموی: یادی خوای گەورە (الترمذي و أحمد).

كۆڕی زیكرو یادی خوا ئارامی دەبەخشێت بە دڵ، دەرون ئارام دەكاتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دڵیان بە یادی خوا ئارام دەكەنەوە جا با بزانن بە یادی خوا نەبێت دڵەكان ئارام نابنەوە. (الرعد ٢٨).

یادی خوا دڵ نەرم دەكاتەوە، باوەڕ زیاد دەكات تا ئەو كاتەی یادی خوا بەرهەمی خۆی دەبەخشێت، بۆیە پێویستە كەسێك یادی خوا دەكات فێری زانستێك ببێت، وە بەكۆمەڵێك ئاداب خۆی برازێنێتەوە، لەم پەڕاوەدا هەندێك لەو ئادابانەمان پێشكەشكرد، بە شێوازێكی كورت‌و پوخت‌و ڕێگەیەكی ئاسان.

بە ئومێدی سودمەندبوونی هەموو پیاوو ئافرەتێكی موسوڵمان.

# الاسمُ الأعظَمُ

جَلس النَّبيُّ ﷺ يوما مع أصحَابِه فجاء رجُلٌ فقـامَ يُصـلِّي في المسجِدِ، فلَمَّا ركَع وسجدَ، تشَهَّدَ ودَعَا، فَقالَ بـينَ يَـدَيْ دُعائه اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّ لكَ الحمْدَ، لا إلهَ إلاَّ أنتَ، بَديعَ السَّموات والأَرضِ، يَا ذَا الجَلالِ والإكرامِ، يَا حَيُّ يا قَيُّومُ.

فقالَ النَّبيُّ ﷺ «لَقَـدْ دعـا باسـمِ الله الأَعظَـمِ الـذِي إذَا دُعِيَ بِهِ أجاب، وإذَا سُئِل بهِ أعْطَى».

وجاءَ آخَرُ فصـلَّى، ثُـمَّ افتَـتَح دُعـاءَهُ قـائلاً اللَّهـمَّ إنِّـي أسأَلُكَ بِأنَّكَ أنتَ اللهُ لا إلهَ إلاَّ أنتَ، الأَحَدُ الصَّمَدُ الـذِي لَـمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَـمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أحَدٌ.

فقالَ النَّبيُّ ﷺ أيضاً «لَقَدْ دعَا اللهَ باسمِـه الأَعظَـمِ الـذِي إذَا سُئِل بِهِ أعْطَى، وإذَا دُعِي بهِ أجابَ». [أبـو داود والترمـذي والنسائي وابن ماجه].

---

سُئِلَ أَنسٌ رضي الله عنه عَن أكثرِ مَا كانَ يَدْعُو بهِ النَّبيُّ ﷺ، فقـالَ: كـانَ يقولُ: اللَّهـمَّ آتنَا فِي الدُّنيَا حسَنَة وفِي الآخـرة حسـنةً وقِنَـا عـذابَ النَّـارِ [مسلم]

# ناوە گەورەکەی خوا

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان لەگەڵ هاوەڵانیدا لە مزگەوت دانیشتبوو، کابرایەکیش هاتە مزگەوتو دەستی بە نوێژکردن کرد. کاتێک ڕکوعو سوجدەی بردوو تەحیاتی خوێندو دوعای کرد، وە لە ناودوعاکانیدا ووتی: ((ئیلاهی من لێت دەپاڕێمەوەو داوات لێدەکەم بەوەی کە هەموو سوپاسگوزاریەکو حەمدێک بۆ تۆیە، هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە تۆ، بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویت، ئەی خاوەنی جەلالو ڕێزو ئیکرام، ئەی خوایەک کە (حەیی‌و قەیومی))) هەموو شتێ بوونی بەستراوە بە تۆوە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (بەڕاستی بەناوی گەورەی خوا پاڕایەوە، ئەو ناوەی کە ئەگەر پێی بپاڕێتەوە وەڵامت دەداتەوە، ئەگەر داوای لێبکەیت پێت دەبەخشێت). پاشان کەسێکی دی هات نوێژی دابەست، پاشان پاڕانەوەکەی بەم وتانە دەست پێ کرد((پەروەردگار، داوات لێدەکەم، بەوەی کە تۆ تەنها خوایت، هیچ خوایەکو پەرستراوێک نیە جگە لە تۆ، تەنهاو بێ پێویستی‌و بێهاوتای، کەست لێنەبووەو لە کەس نەبویتو کەس هاوشانت نیە)).

پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەها فەرموی: (بەڕاستی لەخوا پاڕایەوە بە ناوە گەورەکەی ئەو ناوەی ئەگەر داوای لێبکەیت پێت دەبەخشێت وە ئەگەر بانگی بکەیت وەڵامت دەداتەوە) (ابو داود و ترمزی و نەسائی و ئیبن ماجە) ڕیوایەتیان کردووە.

---

پرسیار کرا لە ئەنەس ﷺ لەسەر زۆرترین ئەو دوعایەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی دەپاڕایەوە فەرموی: ئەو دەیفەرموو: ((اللهم اتنا فی الدنیا حسنة وفی الاخرة حسنة وقنا عذاب النار)).(مسلم). واتە: پەروەدگار لە دنیا خێرو چاکەم بدەریو لە ڕۆژی دوایش خێرو چاکەم بدەریو بمپارێزە لە سزای ئاگر.

# العَجَلةُ وَالصَّلاةُ

يروِي فُضَالَةُ بنُ عُبَيد رضي الله عنه هذه القصَّةَ، فيَقولُ: بينمَا كانَ رسولُ الله ﷺ قَاعِداً إِذْ دخَلَ رَجلٌ فصَلَّى.

ثمَّ قالَ بعدَمَا فرَغَ منْ تَشَهُّده: اللَّهمَّ اغفِرْ لي وَارحَمْني، ثمَّ قامَ لِينصرِف، فَدعَاهُ رسولُ الله ﷺ وقالَ لَهُ: «عَجِلْتَ أيُّهَا المُصلِّي.. إذَا صَلَّى (دعَا) أحَدُكُمْ فَليبَدأْ بتَحمِيد ربِّهِ والثَّناء عليه، ثمَّ لِيُصَلِّ علَى النَّبيِّ ﷺ، ثمَّ يَدْعُو مَا شاءَ» [أبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجه].

ثمَّ دخَلَ رجلٌ آخَرُ بعدَ ذلكَ، فصَلَّى ودَعَا؛ فَحَمِدَ اللهَ (وأَثْنَى عليه)، وَصلَّى على النَّبيِّ ﷺ، فقالَ لَهُ النبيُّ ﷺ: «أيُّهَا المُصَلِّي، أُدْعُ تُجبْ».

---

يَفتَتِحُ المُسلمُ دُعَاءَهُ ويخْتمُهُ بحمد الله تَعالَى وَالثَّناء عليهِ، وَالصَّلاة والسَّلام على النَّبيِّ ﷺ.

# نوێژ و پەلەکردن

فوضالەی کوڕی عوبەید ﷺ ئەم چیرۆکەمان بۆ دەگێرێتەوە، دەڵێت: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو لە مزگەوت کەسێک هاتە مزگەوتەو دەستی کرد بە نوێژکردن پاشان کە لە نوێژەکەی بوویەوەو سەلامی دایەوە ووتی: (خوایەگیان لێم خۆشبەو ڕەحمم پێبکە پاشان هەستاو ویستی بڕوات، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و فەرموی: پەلەت کرد ئەی نوێژ خوێن...ئەگەر نوێژت کرد پاشان دوعات کرد سەرەتا بە حەمدو سەناو سوپاسگوزاری خوا دەست پێبکە پاشان صەلاوات بدە لەسەر پێغەمبەرەکەت دوای ئەوە بۆ خۆشت بپاڕێرەوە بە ویستی خۆت) (ابوداود و ترمذي و نەسائی و ئیبن ماجە) ڕیوایەتیان کردووە.

کەسێکی تریش دوای ئەو کەسە هاتە مزگەوت نوێژی کردو پاشان پاڕایەوە. سەرەتا بە حەمدو سوپاس و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (ئەی نوێژ خوێن دوعا بکە خوا وەڵامت دەداتەوە).

---

دەبێت موسوڵمان سەرەتاو کۆتایی دوعاکانی بە سوپاس و ستایش بۆ خواو درودو سڵاوات بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دەست پێبکات و کۆتایی پێدەهێنێت.

# ذُو النُّـورِ

قَدِمَ الطُّفَيلُ بنُ عَمرٍو الدَّوْسِيُّ رضي الله عنه ـ وكانَ يُقـالُ لَهُ ذُو النُّورِ ـ مَكَّةَ، فَأسلَم، ثمَّ عَادَ إلى قَبِيلَته دَوْسٍ يـدْعُوهُمْ إلى الدُّخولِ في الدِّينِ الجديد، فَعَصوهُ وتمسَّكُوا بما هُمْ عليـهِ مِنَ الشِّرْكِ وَالضَّلالِ، ولَـمْ يُـؤمِنْ معَـهُ إلاَّ قليـلٌ. واستَمْسَـكَ الطُّفَيلُ رضي الله عنه ومن مَعَهُ مِنَ المُسلِمينَ بـدِينِهِمْ وَصـبَرُوا عليه، حتَّى عَلمُوا بهِجْرةِ رسولِ الله ﷺ والمُسلِمينَ إلى المَدينة المُنَوَّرةِ، فَخرَجَ الطُّفَيلُ رضـي الله عنـه ومعَـهُ مَـن أسـلَمَ مـن قَبيلَتِهِ دَوْسٍ مُهاجِرِينَ إلى المدينةِ.

وذاتَ يومٍ اقتَرَبَ الطُّفَيلُ رضي الله عنه من رسولِ الله ﷺ وقالَ: يَا رسولَ الله! إنَّ دَوْسًا عَصَـت اللهَ ورسُـولَهُ، فَـادْعُ الله عَليهَا. فَاستقبَل رسُولُ الله ﷺ القِبْلَةَ ورَفَعَ يديَه، وَظَـنَّ النَّـاسُ أنَّهُ سَيَدْعُوْ عَلَيهِم، فَقالُوا هَلَكَتْ دَوْسٌ. لكنَّـهُ ﷺ لَـمْ يَفعَـلْ ذلكَ، إنَّما قالَ: «اللَّهمَّ اهْدِ دَوْسًا وأْتِ بِهِمْ» [متفق عليه].

---

مِنْ آدابِ الدُّعاء استقْبالُ القِبْلة إذَا كانَ ذلكَ مُمكنـاً، وَيجُـوزُ الـدُّعاءُ لغَيرِ مُستَقبِلِ القِبْلَة.

# خاوەنی نور

طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی ﷺ هاتە شاری مەککە پێیان دەوت (خاوەن نور) موسوڵمان بوو، پاشان بانگی هۆزەکەی کرد بۆ ئیسلام داوای لێکردن موسوڵمان ببن بەڵام ئەوان پشتیان هەڵکردو لەسەر کوفرو ستەمکاریو شیرک بەردەوام بوون. چەند کەسی نەبی کەسیان موسوڵمان نەبوون.طوفەیلو ئەو چەند کەسەی موسوڵمان بوون توند دەستیان گرت بە دینو ئیمانی خۆیانەوەو ئارامیان گرت تا زانییان کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ موسوڵماناندا کۆچی کردووە بۆ مەدینە، بۆیە طوفەیل لەگەڵ هاوەڵەکانیدا کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

ڕۆژێکیان طوفەیل ﷺ نزیک بوەیەوە لە پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ (هۆزی دەوسی سەرپێچیان کرد لە خواو پێغەمبەرەکەی دوعایان لێبکە.پێغەمبەری خواش ﷺ ڕوی کردە قیبلەو هەردوو دەستی بەرزکردەوە خەڵکی وا گومانیان برد کە دوعایان لێدەکات بۆیە وتیان(دەوس بە هیلاکا چوو).بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((خوایە هیدایەتو ڕێنمونی دەوس بکەو بیان نێرە بۆ لام)) (متفق علیه).

---

لە ئادابی پاڕانەوە: ڕووکردنە قیبلە. ئەگەر هاتوو گونجاو بوو وە دروستیشە ڕووت لێی نەبێتو دوعاش بکەیت.

# القصرُ الأبيضُ

سمعَ عبدُ الله بنُ مُغَفَّلٍ رضي الله عنه ابنَهُ يَدْعُو اللَّهم أسألُكَ القَصر الأبيض عَن يمينِ الجنَّة إذَا دخلتُهَا. فَقَالَ أبوهُ: يَا بُنيَّ، سَلِ الله الجنَّةَ، وَعُذْ بِهِ مِنَ النَّارِ، وسمعَ سَعدُ بنُ أبي وقَّاصٍ رضي الله عنه ابنَهُ يَدْعُو ويَقولُ: اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ الجنَّةَ ونعيمَهَا وَإستَبْرقَهَا.. وَنحواً منْ هذَا، وَأعوذُ بِكَ من النَّارِ وَسلاسِلِهَا وَأغلالِهَا.. ونَحواً مِنْ هذَا.

فَقالَ لَهُ: لَقَدْ سَألتَ الله خَيراً وَتعوَّذْتَ بِهِ مِنْ شَرٍّ كَثيرٍ. وإنِّي سمعتُ رسولَ الله ﷺ يقولُ: «إنَّهُ سَيَكُونُ قَومٌ يَعتَدُونَ في الدُّعاء»، وقَرأ هذِه الآيةَ: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ وَإنَّ بِحَسْبِكَ (يَكفيْكَ) أنْ تَقُولَ: اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ الجنَّةَ ومَا قرَّب إليهَا مِنْ قولٍ أو عَمَلٍ، وَأعوذُ بكَ مِنَ النَّارِ ومَا قرَّبَ إليهَا مِنْ قَولٍ أو عَمَلٍ» [أبو داود وأحمد].

---

مِنْ صُوَرِ الاعتداء في الدُّعاء الدُّعاءُ عَلى المُؤمنينَ والمُؤمنَات، وتَكلُّفُ السَّجَعِ، والجَهْرُ الكثير والصِّيَاحُ، والدُّعاءُ بإثْمٍ أو قَطيْعةِ رحِمٍ أو مَعْصِيَةٍ.

# کۆشکی سپی

عبداللە کوڕی موغەفەل ﷺ گوێی لە کوڕەکەی بوو دەپاڕایەوە دەیوت (ئیلاهی داوات لێدەکەم کۆشکێکی سپیم بدەریٚ لە لای ڕاستی بەهەشتەوە، کاتیٚ چومە بەهەشت. باوکی ووتی: کوڕم داوای بەهەشت لە خوا بکەو وە پەنای پێبگرە لە ئاگر، وە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس ﷺ گوێی لە کوڕەکەی بوو دوعای دەکرد دەیووت:(ئیلاهی داوای بەهەشتت لیٚ دەکەم بە خۆیو نازو نیعمەتەکانی وە پۆشاکی ئیستەبرەقەوە، هەر بەو جۆرە دەیوت: پەنا دەگرم بە تۆ لە ئاگر لە زنجیرو کۆتو بەندەکانی وە هەموو جۆرێک لە سزاکانی، سەعد وتی بە کوڕەکەی: بەڕاستی داوایەکی باشت لە خوا کرد وە پەنات پێگرت لە شەڕێکی زۆر من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو((گەلێک دێن سنور شکێنی دەکەن لە نزاو پاڕانەوەدا)) وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە(ادعوا ربکم تضرعاً وخفية انه لايحب المعتدين) تەنها ئەمەت بەسە کە بڵێی ((ئیلاهی داوای بەهەشتت لێدەکەم وە هەر وتەو کردارێک کە نزیکم بکاتەوە لێی، وە پەنات پێدەگرم لە ئاگر وە هەر ووتەو کردارێک کە نزیکم بکاتەوە لێی (ابوداود و ئیمام احمد) ڕیوایەتیان کردووە.

---

شێوەی سنور شکاندن لە دوعا ئەوەیە دوعا لە موسوڵمانان بکەیتو زۆر لە خۆت بکەیت، بە سەجع دوعاکان بکەیت، دەنگت زۆر بەرزبێتو هاوار بکەیت، دوعای گوناحو پچڕانی سیلەی ڕەحمو تاوان بکەیت.

# طَاووسُ وَالدُّعَاءُ

كانَ طَاوُوسُ ـ رحمَهُ الله ـ مِن العُلَماءِ المُخلصينَ، وأحَدَ تلامذَة ابنِ عبَّاسٍ ـ رَضِي الله عَنْهُمَا ـ فَقالَ لهُ أحَدُ النَّاسِ يَوماً وَهُوَ في مجْلسه: أُدْعُ لنَا بِدَعَواتٍ. فقالَ: مَا أجِدُ في قلبِي الآنَ خَشْيةً فأَدْعُو لَكُمْ. [أبو نعيم].

وَدخَلَ ـ رحمـهُ الله ـ مـرَّةً علـى مـريضٍ يَعُـودُهُ، فَقـالَ المريضُ: يَا أبَا عبد الرَّحمنِ! ادْعُ اللهَ لِي.

فقالَ: أُدْعُ لنَفسكَ فإنَّـهُ ـ سُـبحانَهُ ـ يُجِيـبُ المُضْـطَرَّ إذَا دَعَاهُ.

وقالَ: إيَّاكَ أَنْ ترفَع حَوائِجَكَ إلى مَنْ أَغلَقَ دونَـكَ بابَـهُ، وجعَلَ بينَكَ وبينَهُ حجاباً، وَعليـكَ بطلَـبِ حوائجِـكَ إلى مَـنْ بابُهُ مَفتوحٌ لكَ إلى يوم القيامةِ، الـذِي طلَـبَ منـكَ أنْ تَـدْعُوَهُ ووَعدَكَ الإجابةَ. [أبو نعيم].

---

المُسلِمُ في دُعائه يستَحضر عظَمَةَ الله سُبحانَهُ، ويَمـلأُ قلبَـهُ بـالخَوف وَالرَّجاء، ويَدْعُو بلِسَان الضَّرَاعة والخُشُوعِ

# طاووس‌و پاڕانه‌وه

طاووس یه‌کێک بوو له زانایانی دڵسۆزو خه‌مخۆر ﷺ وه یه‌کێک بوو له قوتابیه‌کانی ئیبن عه‌باس ﷺ ڕۆژێکیان که‌سێک له ناو کۆڕێکی خه‌ڵکیدا پێی ووت: مامۆستا کۆمه‌ڵێک دوعامان بۆ بکه، ئه‌ویش فه‌رموی: ئێستا دڵم خه‌شیه‌تی تێدا شک نابه‌م تا بۆتان بپاڕێمه‌وه(ابو نعیم ڕیوایه‌تی کردووه).

وه جارێکی تریش ده‌چێته سه‌ردانی نه‌خۆشێک ﷺ نه‌خۆشه‌که پێی ده‌ڵێت ئه‌ی باوکی عبدالرحمن له‌خوا بپاڕێره‌وه بۆم. ئه‌ویش فه‌رموی: خۆت بۆ خۆت دوعا بکه چونکه خوای پاک‌و بێگه‌رد وه‌ڵامی به‌گیر هاتوو لێقه‌وماوان ده‌داته‌وه ئه‌گه‌ر دوعا بکه‌ن.

هه‌روه‌ها ووتی: ده‌خیلتان بم داواکانتان به‌رزمه‌که‌نه‌وه بۆ لای که‌سێک که ده‌رگای به‌سه‌ردا داخرابێت وه له نێوانی تۆو ئه‌ودا چه‌ندین به‌ربه‌ست هه‌بێت. بۆیه تکا ده‌که‌م داوای پێویستیه‌کانتان له زاتێک بکه‌ن که هه‌میشه‌و تا ڕۆژی دوایی ده‌رگای کراوه‌یه، وه هه‌رکاتێک داوایه‌کی لێبکه‌یت ئه‌و په‌یمانی داوه که وه‌ڵام بداته‌وه.(ابو نعیم)

---

پێویسته موسوڵمان له کاتی پاڕانه‌وه‌دا دڵ‌و ده‌رونی ئاماده باش بێت‌و هه‌ست به گه‌وره‌یی‌و مه‌زنی‌و پیرۆزی خوای میهره‌بان بکات‌و دڵی پڕ بێت له ترس‌و هیوا به زمانێکی گه‌ردن که‌چ‌و کڕوزانه‌وه‌و خاشیعه‌وه بپاڕێته‌وه.

# دُعاءُ الصَّالحِينَ

دَخَلَ النَّبيُّ ﷺ على أنسِ بنِ مَالِك وأمِّ سُلَيْمٍ وأُمِّ حَرَامٍ خَالَته ـ رَضِي اللهُ عَنْهُمْ ـ فِي غَيرِ وقتِ الصَّلاة، فَقالَ ﷺ: «ألا أُصلِّي بِكُمْ؟» فَوافَقُوا ورحّبُوا.

فَجعَلَ أَنَساً عَن يَمينِه، وَالمرْأتَينِ مِن وَرائِهِما، ثمَّ صلَّى بِهِمْ، ثُمَّ دَعَا لَهُمْ بكُلِّ خيرٍ منْ خيرِ الدُّنيا وَالآخِرَة.

فقالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ ـ رَضيَ اللهُ عَنْهَا ـ يَا رسُولَ الله؛ خُوَيْدِمُكَ (تَعنِي أَنَساً)، ادْعُ اللهَ لَهُ. فدَعَا لأَنسٍ بكُلِّ خَيرٍ، وكانَ مِنْ دُعائِهِ ﷺ أنْ قَالَ: «اللَّهمَّ أكثِرْ مالَهُ وولَدَهُ وبارِكْ لَهُ» [متفق عليه].

وَيقولُ الفَاروقُ عُمَرُ رضي الله عنه استَأذَنْتُ النَّبيَّ ﷺ في العُمْرَة، فَأذِنَ لي، وقَالَ: «لاَ تَنْسَنَا يَا أَخي مِنْ دُعائِكَ»، فَقالَ كلمةً مَا يسُرُّنِي أَنَّ لِي بِهَا الدُّنيَا. [أبو داود].

---

عَلَّمَنَا النَّبيُّ ﷺ أنْ نسألَ إخوانَنَا ـ وخاصَّةً الصَّالحِينَ منْهُمْ ـ أنْ يَدْعُوا لنَا، فإنَّ دَعْوَةَ الرَّجُلِ لأَخيه بظَهرِ الغَيْبِ لاَ تُرَدُّ.

# دوعای چاکان

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای ئەنەسی کوڕی مالكو (ام سولەیمە) (ام حەڕام) کە پوری بوو لە کاتێکدا کە وەختی نوێژ نەبوو فەرموی: ((پێتان خۆشە نوێژتان لەگەڵ بکەم)) ئەوانیش زۆریان پی خۆش بوو وە پێشوازیان لەو داوایە کرد.

بۆیە ئەنەس لای ڕاستی پێغەمبەرەوە وەستاو دوو ژنەکەش لە دواوە، پێغەمبەرﷺ نوێژی بۆ کردن، پاشان دوعای خێری دونیاو قیامەتی بۆ کردن.

(ام سولەیم) ووتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دوعا بۆ خزمەتکارەکەت بکە(مەبەستی ئەنەس بوو) ئەویش دوعای بۆ ئەنەس کردو داوای خێری بۆ کرد وە لە دوعاکانیدا ﷺ فەرموی: ئیلاهی ماڵو مناڵی زۆری بدەریو بەرەکەت ببارێنە بەسەر ئەنەسدا.(متفق علیه).

عومەری کوڕی خەتابرضي الله عنه دەڵێت: داوای مۆڵەتم کرد لە پێغەمبەری خوا تا بچم بۆ عەمرە، ئەویش مۆڵەتی پێدام وە فەرموی: ((لە بیرمان نەکەیت براکەم لە دوعاکانتدا)) عومەر دەفەرموێت: وتەیەك کە زۆر دڵخۆشی کردبم لە دنیا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرﷺ بوو کە بە ئەندازەی هەموو دنیا لام خۆش بوو. (ابو داود).

---

پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات کە داوا لە براکانمان بکەین بە تایبەت ساڵحەکانیان کە دوعامان بۆ بکەن. چونکە دوعای برا بۆ براکەی لە کاتی پەنهاندا ناگەڕێتەوە.

# صَاحِبُ النَّاقةِ

لَمْ يَكُنْ مع رسولِ الله ﷺ وأصحابِه ــ رَضِي اللهُ عَنْهُمْ ـ حِين خَرَجُوا إلى غَزْوةِ "بَطْنِ بُوَاطٍ" مِنَ الرَّكائبِ مَا يَكْفِيْهِم جَميعَهُمْ، فَكانُوا يتَناوَبُونَ الرُّكوبَ والمَشْيَ، حتَّى إنَّ البَعِيرَ يَتَناوَبُهُ الخمسةُ والسِّتَّةُ والسَّبعَةُ.

فلَمَّا جَاءَتْ نَوْبَةُ رجلٍ مِنْهُمْ لِيركَبَ بَعيراً لَهُ، أَمسَكَ بالبعيرِ فَأَناخَهُ فركِبَهُ، ثمَّ صَاحَ به لِيَقُومَ، فَأبطَأَ عَليه البَعيرُ ولَمْ يَقُمْ مِنْ فَوْرِهِ، فَزَجَرَهُ الرَّجلُ فَقالَ لَهُ: شَأْ (وهِي كلمةُ زَجْرٍ)، لعنَكَ اللهُ، فَسَمِعَهُ رسولُ الله ﷺ فقَالَ: «مَنْ هذَا اللاَّعِنُ بَعيرَهُ؟».

قَالَ الرَّجلُ: أنَا يَا رسولَ اللهِ، فَقالَ لَهُ: «انْزِلْ عَنْهُ، فَلا تَصحَبْنَا بمَلْعُونٍ»، ثمَّ تكلَّمَ ﷺ بهذِهِ الوَصيَّةِ الحَكيمَةِ: «لاَ تَدْعُوا على أنفُسِكُمْ، وَلا تَدْعُوا على أولادِكُمْ، وَلا تَدْعُوا علَى أموالِكُمْ، لا تُوافِقُوا مِنَ اللهِ ساعةً يُسأَلُ فِيهَا عطاءً فَيستَجِيبُ لَكُمْ» [مسلم].

---

المُسلِمُ لا يَدْعُو بالشَّرِّ والهَلاَكِ على مَا أعطَاهُ اللهُ مِنْ أموالٍ ونِعَمٍ، بَل يَسأَلُ اللهَ عزَّ وجلَّ مِنْ خَيرِهَا، ويَستَعِيذُ مِنْ شَرِّهَا.

# خاوەن وشترەکە

هەرکاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەل هاوەلان دەرچوبن بۆ غەزایەک کەم و کورتیان لە سواریدا هەبووە، وە کاتێک دەردەچن بۆ غەزای ((بطن بواط)) ولاخی تەواویان نابێت بۆ سواری، بۆیە بە نۆرە سوار وشترەکان دەبن. هەر وشترێک پێنج و شەش و حەوتی بەسەرەوە دەبێت وە هەرکاتێک نۆرەی کەسێک دەهات وشترەکەیان ڕادەگرت و پاشان یخیان دەداو ئەو دادەبەزی کەسێکی تر سواردەبوو. پاشان هاواریان لە وشترەکە دەکرد تا هەستیٚ و بڕوا ئەویش زۆر خاوبوو بەئاسانی هەڵنەدەسایەوە، بۆیە کابرا قسەی ناشیرینی دەوت بە وشترەکە وە لەعنەتی خوای لێکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ گوێبیستی ئەوە بوو، بۆیە فەرموی:(ئەوە کیٚ لەعنەتی لە وشترەکەی کرد)؟.کابرا وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (دابەزە لەسەری نابێت مەلعون هاوەڵی ئێمە بکات). پاشان ئامۆژگاری هەموانی کردو فەرموی: ((دوعا لەخۆتان مەکەن. وە دوعا لە ماڵ و منالتان مەکەن. نەوەکو کاتی دوعاکانی ئێوە ئەو کاتە بێت کە دوعای تێدا گیرا دەبێت)) (مسلم).

---

موسوڵمان دوعای خراپ و لەناوچون ناکات لەسەر ئەوەی خوای گەورە پێی داوە لە ماڵ و سامان و نیعمەت. بەڵکو دەپاڕێتەوە لە خوای گەورە کە خێری ئەو ماڵ و سامانەی بداتیٚ و لە شەڕو خراپەکانی بپارێزێت.

# سُبحانَ اللّهِ

مرِض رجل مِن المُسلمِين مرضاً شَديداً، أَضْعَفَهُ وَأوْهَـن بدَنَهُ، حتَّى صَار كالفَرْخِ الصَّغيرِ ممَّا بِهِ مِنَ المرضِ. فلَمَّا عَلِـمَ رسُولُ الله ﷺ بمرضِهِ ذَهَبَ إليـه يَعُـودُهُ، وذهَـبَ معَـهُ بعـضُ صحابَتِهِ رِضوَانُ الله عَليهِمْ، فلَمَّا رَآهُ النَّبيُّ الكَريمُ رَقَّ لِحَالـهِ، وَأشفَقَ عَليهِ، وسأَلَهُ: «هَلْ كُنتَ تَدْعُو (ربَّكَ) بشَيءٍ أَو تسـأَلُهُ إيَّاهُ»؟ قَال: نَعَم، كنتُ أقولُ اللَّهـم مَـا كُنْـتَ مُعـاقِبِي بـه في الآخرةِ فَعجِّلْهُ لِي في الدُّنيَا.

فَكَرِهَ رسُولُ الله ﷺ مَا دعَا به صاحِبُهُ، وقَالَ: «سُبحانَ الله؛ لاَ تُطِيقُهُ أو لا تَستَطِيعُهُ (أي: لا يَسأَلْ أحدُكُمْ بتَعجيلِ عقُوبَتِـهِ في الدُّنيَا، فإنَّهُ لا يتَحمَّلُهَا إذَا وقعَتْ به)، أفلاَ قُلتَ: اللَّهـمَّ آتِنَـا في الدُّنيَا حسَنَةً وفي الآخِرَةِ حسَنَةً وقِنَا عذابَ النَّارِ» [مسلم].

ثمَّ تجَلَّتْ رحمةُ رسُولِ الله ﷺ بصاحبِهِ، فدعَا ربَّهُ - جَـلَّ وعَلاَ - أنْ يَشفِيَهُ، فشُفِيَ بإذنِ الله تَعالَى.

---

المُسلِمُ لا يتَمنَّى البَلاء ولا يَدْعُو على نَفسه بتَعجِيلِ العُقوبةِ، بَل يَطلُبُ مِنَ الله العَفْوَ والعَافِيةَ في الدُّنيَا وَالآخِرَةِ.

# سبحان الله

یەکێک لە موسوڵمانان نەخۆشیەکی توند دەگرێت. لاوازو بێهێزی دەکات. تا وای لێدێت لاشەی زۆر بچوک دەبێتەوە. کاتێک پێغەمبەرﷺ دەزانێت بە نەخۆشیەکەی لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا سەردانی دەکەن. پێغەمبەرﷺ کە حاڵی دەبینێت زۆر خراپە سۆزی بۆی دەجوڵێت وە پێی دەڵێت:((داوات لە خوای خۆت نەکردووەو لێی نەپاڕاویتەوە؟ ئەویش وتی: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا ووتم: ئەی خوایە سزای قیامەتم بۆ پێش بخەو لە دنیا تۆڵەم لێ بسێنە. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بوو بەو جۆرە دوعای کردبوو فەرمووی: ((**سبحان الله**)) لە توانای تۆدا نیە واتە (کەس لە ئێوە داوا نەکات خوای گەورە سزای بۆ پێش بخات چونکە هەرگیز بەرگەی ناگرن ئەگەر سزابێت). ئەی بۆ ئەم دوعایەت نەکرد بڵێی ((ئیلاهی خێرو چاکەی دنیام بدەرێ پاشان خێرو چاکەی قیامەتیش وە بمپارێزە لە سزای ئاگر)) (مسلم). پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەتو سۆزی جوڵاو لە خوا پاڕایەوە کە شیفای ئەو موسوڵمانە بدات. خوای گەورەش شیفای بۆ ناردو چاک بویەوە.

---

موسوڵمان هەرگیز ئاواتی بەڵا ناخوازێ وە دوعای سزای بە پەلە لەسەر خۆی ناکات. بەڵکو دەبێت داوا بکات لە خوای میهرەبان ببەخشێتو خۆشی و بەختەوەری بداتێ لە دنیاو دوا ڕۆژدا.

# الطَّابعُ واليهودُ

كانَ الصَّحَابي الجَليلُ أَبـو زُهـيرٍ الـنُّمَيريُّ رضـي الله عنـه يُجَالسُ أصحابَهُ من التَّـابعين، ويعلِّمُهُـمْ أُمـورَ ديـنِهِمْ، فكـانَ الرَّجلُ مِنْهُمْ إذَا دَعَا بِدُعاءٍ، قَالَ لَهُ أَبو زُهـيرٍ اختُمْـهُ بـآمينَ، فإنَّ آمينَ مثلُ الطَّابَعِ علَى الصَّحيفةِ، ثُمَّ يقـولُ: أُحـدِّثُكُمْ عَـن (أَصلِ) ذَلِكَ: خَرَجْنَـا مـعَ رسُـولِ الله ﷺ ذاتَ ليلـةٍ (نَمشـي) فَأتيْنَا علَى رجُلٍ في خَيمةٍ يَدْعُو، قَدْ ألحَّ في المسـألةِ، فَوقَـفَ النَّبيُّ ﷺ يَستَمعُ مِنْهُ، ثُمَّ قالَ: «أوجَبَ إنْ خَتَمَ (أي وُجِبَتْ لَـهُ الجنَّةُ، أو وُجِبَ قبولُ دُعائه)». فَقالَ رَجلٌ مِمَّنْ كانُوا معَ النَّبيِّ ﷺ بِأي شَيءٍ يَختُمُ؟ قَالَ: «بِآمينَ، فَإنَّهُ إنْ خَـتَمَ بـآمينَ فقَـدْ أوجبَ». فَانصَرَفَ الرَّجلُ الذِي سَأَلَ النَّبيَّ ﷺ، فـأَتَى الرَّجُـلَ الذي يَدْعُو، فَقالَ: «اختمْ يَا فلانُ بِآمينَ، وَأَبشِرْ» [أبـو داود].

وقَالَ ﷺ: «مَا حَسَدَتْكُمُ اليَهودُ علَى شَيءٍ مَـا حَسَـدَتْكُمْ علَـى آمينَ فَأَكثِرُوا مِنْ قولِ آمينَ» [أبو داود].

---

مـنْ أسـبابِ قَبـولِ الـدُّعاء: الإخـلاصُ وَالإِلحـاحُ والتَّضـرُّعُ وَاختِيـارُ الأَوقاتِ الشَّريفة.

# ئامین‌و یەهود

ئەبو زوهەیری نومەیری ﷺ یەکێک بوو لە هاوەڵانی بەڕێز لە ناو هاوەڵانیدا لە تابعین دانیشتبوو، کاروباری ئاینی پیرۆزی ئیسلامی فێردەکردن. پیاوێک لە ناویاندا دوعای دەکردو دەپاڕایەوە، ئەبو زوهەیر وتی: بە ئامین کۆتایی پێ بهێنە، چونکە ئامین وەکو مۆری سەر لاپەڕە وایە. پاشان وتی: باسی بنەڕەتی ئەمەتان بۆ دەکەم شەوێک لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەرچوین بە پێ دەڕۆیشتین تا گەیشتینە لای پیاوێک لە خەیمەیەکدا دوعای دەکرد زۆر ئیلحاحی دەکرد لە دوعاکەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستا گوێی لێگرت پاشان فەرموی: (واجب بوو ئەگەر خەتمی بکات واتە بەهەشتی بۆ واجب بوو، یان دوعاکەی بۆ قبوڵ بوو).

کەسێک کە لەگەڵماندا بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەچی دوعا خەتم بکەین؟ فەرموی: بە ئامین. ئەگەر دوعا بە ئامین خەتم کرا بەڕاستی قبوڵ بوونی واجب دەبێت، ئەوەی ئەم پرسیارەی کرد لە پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت ئەو پیاوەی دوعاکەی کرد هات پێغەمبەرﷺ فەرموی: (دوعاکانت بە ئامین خەتم بکە وە مزگێنیت لێبێت)(ابوداود). پێغەمبەری خوا فەرموی: (جولەکە ئێرەیی بە هیچ شتێک نابەن بە ئەندازەی ئیرەیی بردن بە ئامین لەبەر ئەوە ئامین زۆر بڵێن)(ابوداود).

---

لە هۆکارەکانی گیرا بوونی دوعا: ئیخلاص‌و زۆر دووبارە کردنەوەو گەردن کەچی‌و کوڕوزانەوەو هەڵبژاردنی کاتە پیرۆزەکانە.

# الشَّيخُ والحمَّى

كانَ رسُولُ الله ﷺ إذَا سمع بمريضٍ زَاره، فَكانَ يزورُ الرِّجالَ ويَزورُ النِّساء، وكانَ يَزورُ الصِّبْيانَ ويَزورُ الشُّيوخَ، وكَانَ يَزورُ المُسلِمين وغيرِ المُسلِمينَ، فَيَعودُ هَؤلاءِ وهَؤلاء ويَدعُو لَهُمْ، فَكانَ منْهُمْ منْ يَنتفعُ بِعيادَتِه ﷺ إيَّاهُ، وكانَ مِنْ بينِهِمْ آخرُونَ لَمْ ينتفِعُوا مِنْ ذلكَ بشيءٍ.

ولقَدْ عادَ ﷺ يومًا رجُلَينِ منَ الأَعرابِ، وكَانَ ﷺ إذَا عَادَ مَريضاً قَالَ: «لا بأسَ، طَهورٌ إنْ شَاء الله»، يَعنِي: أنَّ المرضَ يُطهِّرُ صاحِبَهُ مِنَ الذُّنوبِ، فلَمَّا دخَلَ ﷺ علَى الأعرابيِّ قَالَ لَهُ: «لا بأسَ، طَهورٌ إنْ شاءَ الله»، فَقالَ الرَّجلُ: قُلتَ: طَهُورٌ؟!، بَلْ هي حُمَّى تَفُورُ، علَى شيخٍ كبيرٍ، تُزِيرُهُ القُبورَ، فَكرِهَ رسُولُ الله ﷺ مقالَةَ الرَّجلِ لمَا فِيهَا مِنَ السَّجعِ واليَأسِ، وَعدَمِ الانتفَاعِ بالنُّصْحِ وَالدُّعاء، فَقالَ ﷺ: «أمَا إذَا أبَيْتَ الدُّعاءَ (رَفَضْتَهُ)، فَهِيَ كمَا تَقولُ، قَضاءُ اللهِ كائِنٌ» فمَا أمسى الرَّجُلُ منَ الغَدِ إلا مَيْتاً. [البخاري].

---

يَقولُ تَعالَى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى وَلْيُؤْمِنُواْ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ [البقرة:١٨٦].

# بەسالاچووەکە و نەخۆشی (تا)

هەرکاتێک پێغەمبەرﷺ بیبیستایە کەسێک نەخۆشە سەردانی دەکرد. سەردانی پیاوان‌و ژنانی دەکرد، سەردانی منداڵ‌و پیری دەکرد، سەردانی موسوڵمان‌و ناموسوڵمانی دەکرد، هەبوو لەوانە سودی دەبینی لەو بەسەر کردنەوەی پێغەمبەرﷺ، هەشبوو وەک جولەکە هیچ سودی نەدەبینی.

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ سەردانی دوو پیاوی دەشتەکی کرد. پێغەمبەرﷺ کە سەردانی نەخۆشی دەکرد دەیفەرموو: ((هیچ نیە، خوا بیەوێت مایەی پاک بونەوەیە)) کابرای دەشتەکی وتی پاککەرەوەیە؟؟!!نا بەڵکو تایەکی لەناوبەرە لەسەر شێخی پیرو دەیکاتە میوانی گۆڕ! پێغەمبەری خوا پێی ناخۆش بوو، ووتەکەی کابراکە پڕبوو لە بێهیوایی وە سودی نەبینی لە ئامۆژگاری‌و دوعاکەی پێغەمبەرﷺ. بۆیە فەرموی: ((تۆ ئەگەر دوعاکەت ڕەت کردەوە ئیتر ئەوە قسە قسەی خۆتە بڕیاری خوا دێتە دی)) کابرا نەگەشتە سبەی ئێوارە مرد. (البخاري).

---

خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەگەر بەندەکانم داوای منیان کرد من زۆر نزیکم وەڵامی داواکانیان دەدەمەوە ئەگەر داوایان کرد، کەواتە با وەڵامی بانگەوازەکەی من بدەنەوە و باوەڕ بهێنن، تا بگەنە پلەی ژیری تەواو.

# أنَا الملِكُ ... أنَا الملِكُ

لما أشرَفَ حُذَيفَةُ بنُ اليَمَان رضي الله عنه علَى المَوتِ، أُغمِي عَليه، فجاءَهُ أهلُهُ الأنصارُ فِي جَوفِ اللَّيلِ - أو عندَ السَّحَرِ - يَعُودُونَهُ، فلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: أيُّ اللَّيلِ هذَا؟ قَالُوا جَوفُ اللَّيلِ، أوِ السَّحَرُ الأَعلَى.

وهُنَا تَذكَّرَ رضي الله عنه قولَ رسُول الله ﷺ: «يَنزِلُ اللهُ - سُبحانَهُ - وتَعالَى إلى السَّماءِ الدُّنيَا كُلَّ ليلةٍ، حينَ يَمْضِي ثُلثُ اللَّيلِ الأوَّلُ، فَيقولُ: أنَا المَلكُ، مَنْ ذَا الذِي يَدْعُونِي فَأستَجِيبُ لَهُ، مَنْ ذَا الذِي يسألُنِي فَأعطِيْهِ، مَنْ ذا الذِي يَستَغفِرُنِي فَأغفِرُ لهُ، فلاَ يزَالُ كذلِكَ حتَّى يُضِيءَ الفَجرُ».

فَقالَ: عَائِذٌ بِالله مِن جَهنَّمَ، قَالهَا مَرَّتينِ أو ثلاثاً.

---

مِن آدابِ الدُّعاءِ: اختيارُ الأَوقَات التي يُستَجابُ فِيها الدُّعاءُ، ومِنْهَا: جَوفُ اللَّيلِ، وَدُبُرُ الصلواتِ المكتُوبَةِ، ويومُ الجُمُعةِ، وَليلَةُ القَدرِ

# پادشام...... پادشام

کاتێک حوزەیفەی کوڕی یەمانی ﷺ لە مردن نزیک بویەوە لە هۆش خۆی چوو. خزمانی (یاریدەدەر)ی سەردانیان کرد لە تاریکی شەودا یان لەبەرەبەیاندا. کاتێک هۆشی هاتەوە وتی: چ شەوێکە ئەمە؟؟ ووتیان: ناوەڕاستی شەوە یان بەرەبەیانە. لێرەدا حوزیفە فەرمایشتی پێغەمبەری خوای ﷺ یادکەوتەوە کە فەرمویی: خوای گەورە هەموو شەوێک دادەبەزێتە سەر ئاسمانی دونیا کاتێک کە سێیەکی شەو دەڕوات وە دەفەرموێت((من پادشام، کێ دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە. کێ داوام لێدەکات تا پێی ببەخشم. کێ پەشیمانی دەردەبڕێتو دەگەڕێتەوە تا لێی خۆش ببم. بەردەوام وا دەفەرموێت تا بەرەبەیان)). حوزەیفە وتی: پەنا دەگرم بەخوا لە ئاگری دۆزەخ دوو جار تا سێ جار ئەوەی فەرموو.

---

لە ئادابەکانی دوعا: هەڵبژاردنو دیاری کردنی ئەو کاتانەیە کە دوعا تیایاندا گیرا دەبێت لەوانە: قولایی شەو، پاش نوێژە فەرزەکان، ڕۆژی هەینی، شەوی قەدر.

# حَقُّ الأَجيرِ

خَرَج ثَلاثةٌ فِي سَفَرٍ، فلمَّـا غَيَّمـتْ عَلـيهِمُ السـماءُ، دَخلُـوا غَاراً، فَجاءتْ صخرةٌ من أعلَى الجبَلِ فَسَدَّتِ الباب عَلـيهِمْ، ولَـم يَستَطِيعُوا رَفْعَهَا، فَدَعَوُا الله بصالحِ أعمالِهِمْ، فَدَعَا الأوَّلُ والثَّانِي، فَانفرَجَتْ بِدُعائِهِمَا حتَّى بدَت السماءُ لَهُمْ غيرَ أَنَّهُـمْ لا يستَطِيعُونَ الخُروجَ.

وقَالَ الثَّالثُ: اللَّهمَّ إنَّكَ تَعلَمُ أنِّـي كنـتُ اسـتَأجَرْتُ أَجِـيراً، فلَمَّا أمسى عَرَضْتُ عَليهِ حقَّهُ، فَأَبَى أَنْ يأخُذَهُ، وذَهَـبَ وتركَنـي، فَثمَّرْتُهُ لَهُ وَأَصلَحتُهُ حتَّى اشتَرَيتُ منْهُ بَقـراً وَراعِيَهَـا، فَلقِيَنـي بعـدَ حينٍ، فَقالَ: اتَّقِ اللهَ وَأعطِنِي أجْرِي ولا تَظْلمْنـي، فَقلْـتُ: انطلِـقْ إلى ذلكَ البقَرِ وَراعيْهَا فَخُذْهَا، فَقالَ اتَّقِ اللهَ وَلاَ تسخرْ بِي.

فَقلْتُ: إنِّي لستُ أَسخَرُ بِكَ. فَانطلَقَ فَاستَاقَ ذَلكَ.

فإنْ كُنتَ تعلَمُ أنِّي إنَّمَا فعَلتُهُ ابتِغاء مَرْضاتكَ وخشْـيَةً منْـكَ، فأَفْرِجْ عنَّا، فَتَدَحْرَجَتِ الصخرةُ، وَخرجُوا يَمشُونَ. [متفق عليه].

---

يُستَحَبُّ لمنْ وقَع في شدَّةٍ أن يَدْعُوَ الله بصالحِ عمَله، فإنَّ ثنـاءَ رسُـولِ الله ﷺ عَلى هؤلاء الثَّلاثة دَلالَةٌ على صَوَابِ مَا فعَلُوهُ.

# مافی کرێکار

سی هاوەل بۆ سەفەر دەرچون، لە ڕێدا باوو بۆران بەسەریاندا باری ئەوانیش خۆیان خزاندە ئەشکەوتێك لەپڕ لەسەر ئەشکەوتەکە بەردێکی گەورە کەوتە خوارەوەو بەردەم ئەشکەوتەکەی گرت بە هیچ جۆرێك نەیان توانی بەردەکە لاببەن. بۆیە بە کردەوە چاکەکانیان پاڕانەوە لە خوا یەکەم‌و دووەم دوعایان کردو پاڕانەوە بە پاڕانەوەی یەکەم‌و دووەم بەردەکە کەمێك جولاً بەلاًم هێشتا نەیان دەتوانی دەربچنە دەرەوە.

سێیەمیش وتی: خوایە گیان تۆ باش دەزانی کە من کرێی کرێکارێکم لابوو کاتێك ئێوارە هات نەکرا حەقەکەی وەربگرێت ڕۆشت‌و پارەکەشی جێهێلاً، پارەکەیم هەڵگرت‌و کاسپیم پێکرد تا وای لێهات دام بە مانگایەك وردە وردە زیادی کرد پاش ماوەیەك کابرای کرێکار هاتەوەو وتی: لە خوا بترسە کرێی ئەو ڕۆژەم بدەرێ کە کارم بۆ کردی زوڵمم لێ مەکە منیش وتم: بڕۆ ئەو مانگایانە ببە. کابرا وتی: لەخوا بترسەو گاڵتەم پێ مەکە. وتم: گاڵتەت پێناکەم هەمووی هی تۆیە ئەویش هەموی برد. خوایە ئەگەر ئەوەم لەبەر خاتری تۆ وە بۆ ڕەزامەندی تۆو لەترسی تۆ ئەوەم کرد خوایە ڕزگارمان بکە پاشان بەردەکە تلی داو بەردەم ئەشکەوتەکە والاً بوو ئەوانیش هاتنە دەرەوەو ڕۆشتن. (متفق علیه).

---

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کەوتۆتە نارەحەتیەکەوە کە بەکردەوە جوانەکانی لە خوا بپاڕێتەوە، چونکە ستایشی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو سی کەسە بەڵگەیە لەسەر چاکی‌و باشی کارەکەیان.

# كُنُوزُ العَرْشِ

نزَل جبريل عليه السلام إلى النَّبي ﷺ في أحسَنِ صُورةٍ لَمْ يَنزِلْ في مثلِهَا قَطُّ، ضَاحِكًا مُستَبشراً، فَقالَ: «السَّلامُ عَليكَ يَا محمَّدُ» قَالَ: «وَعليكَ السَّلامُ يَا جِبريلُ».

فَقالَ: «إنَّ اللهَ بَعَثَنِي إليكَ بهديَّةٍ، كُنُوزِ العَرْشِ أكرَمَكَ بِهنَّ». قَالَ ﷺ: «وَمَا تلكَ الهديَّةُ يَا جِبريلُ؟».

فَقالَ: «قُلْ: يَا مَن أظهَرَ الجميلَ وستَرَ القَبِيحَ، يَا مَنْ لا يُؤَاخذُ بالجرِيْرةِ (الذَّنبِ) وَلا يهتُكُ السِّتْرَ، يَا عظيمَ العَفْوِ، يَا حسَنَ التَّجَاوُزِ، يَا واسعَ المَغفرَةِ، يَا باسطَ اليدَينِ بالرَّحمَةِ، يَا صاحبَ كُلِّ نَجْوَى، ويَا مُنتَهى كُلِّ شَكْوَى، يَا كريمَ الصَّفْحِ، يَا عَظيمَ المَنِّ، يَا مُبتَدِئَ النِّعَمِ قبلَ استحقاقِهَا، يَا ربَّنَا ويَا سيِّدَنَا وَيا مولاَنَا ويَا غايةَ رغبَتِنَا، أسأَلُكَ أنْ لا تَشْوِي وَجْهِي بالنَّارِ» [الحاكم].

---

قَالَ ﷺ: «لا يَقُولَنَّ أحَدُكُمْ: اللَّهُمَّ اغفِرْ لِيْ إنْ شِئتَ. اللَّهمَّ ارحمْني إنْ شئت. لِيَعزُمْ في الدُّعاء، فإنَّ اللهَ صانعٌ مَا شاء، لا مُكْرِهَ لَهُ» [مسلم].

# کەنزی عەرش

حەزرەتی جوبرەئیل لەسەر جوانترین شیوەی خۆی دابەزیە لای پێغەمبەر ﷺ کە هەرگیز وا جوان نەبووە. مژدە بەخش‌و دەم بە پێکەنین فەرمووی:((السلام علیك یا محمد)) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((و علیك السلام یا جبریل)). پاشان جوبرەئیل فەرمووی: (خوای گەورە ناردومی بۆ گەیاندنی دیاریەك بۆ تۆ کە لە کانزای عەرشەوە بۆ ڕێزی تۆ هێناومە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ئەو دیاریە چیە ئەی جوبرەئیل). فەرمووی: بڵێ: ئەی ئەو زاتەی جوانیەکان دەردەخەیت‌و ناشیرینیەکان دادەپۆشی.

ئەی ئەو زاتەی بە تاوان نامان گری پەردە لەسەر گوناهەکانمان لانادەیت.

ئەی لێخۆش بووی فراوان‌و گەورە، ئەی چاوپۆشی کەری باش‌و ئەی فراوان لێبوردە.

ئەی دەست کراوەی پڕ لە ڕەحمەت، ئەی خاوەن هەموو جێ نهێنیەك.

ئەی کۆتای هێنەری هەموو شکاتێك، ئەی بەخشندەی بێ غەش و مەرام.

ئەی خاوەن نیعمەتی گەورە، ئەی دەست پێش خەری هەموو نیعمەتێك پێش ئەوەی خاوەنەکەی شایستەی بێت.

ئەی پەروەردگار، ئەی گەورەمان، ئەی دۆستی گەورەمان، ئەی ئەو پەڕی هیواو ئاواتمان.

داوات لێدەکەم دەم‌و چاوم بە ئاگر نەبرژێت.(الحاکم).

---

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((کەس لە ئێوە نەڵێت ئیلاهی لێم خۆشبە ئەگەر دەتەوێت. بەڵکو با عەزمتان لە دوعادا هەبێت، چونکە خوای گەورە هەرچی دەکات بە ویستی خۆیەتی کەس زۆری لەسەر ناکات))(مسلم).

# صَلاةُ أَبِي معلقٍ

خرج الصحابيُّ أبو معلقٍ رضي الله عنه بمالٍ للتِّجارة، فخرج عليه لصٌّ ليَقتُلَه ويأخُذ مالَهُ، فقال أبو معلقٍ: ذَرْني أُصَلِّي، قَالَ: صلِّ مَا بَدَا لكَ. فَتوضَّأَ فصلَّى ودعَا قَائلاً: يَا وَدُودُ، يَا ذَا العرشِ المجيدُ، يَا فعَّالاً لمَا يُريدُ، أسألُكَ بعزَّتِكَ التي لا تُرامُ، ومُلْكِكَ الذي لا يُضَامُ، وبنُورِكَ الذي ملأَ أركانَ عرْشِكَ أنْ تكفِيَني شر هذَا اللِّص، يَا مُغيثُ أغثْني، يَا مُغيثُ أغِثْني، يَا مُغيثُ أغِثْني.

ومَا أَن انتَهَى منْ صلاتهِ حتَّى أقبَل فارسٌ، وبيَدِه حَرْبةٌ يَرفَعُهَا، فَوَجَّهها إلى اللِّص فقتَلَهُ، ثُمَّ جاء إلى أبي معلَقٍ فقالَ لَهُ: قُمْ، فَقالَ: مَنْ أنتَ؟ فَقَدْ أغاثَنِي اللهُ بِكَ اليوم. قَالَ: أنَا مَلَكٌ منْ أهلِ السَّماء الرَّابعة، لَمَّا دَعَوْتَ سمعتُ لأبواب السَّماء قَعْقَعَةً (صوتًا) ثُمَّ دَعَوْتَ ثَانياً فسمعتُ لأهلِ السَّماء ضَجَّةً، ثُمَّ دعَوْتَ ثَالثاً فَقِيلَ: دُعاءُ مكْروبٍ. فَسأَلْتُ ربي أنْ يُولِّيني نُصْرَتَكَ. ثُمَّ قَالَ: أَبْشِرْ واعلَمْ أنَّهُ مَنْ تَوضَّأَ وصَلَّى أَربع ركَعَاتٍ ودَعا بهذَا الدُّعاء استُجيبَ لَهُ، مكْرُوباً كانَ أو غير مكْرُوبٍ. [ابن أبي الدنيا وأبو نعيم].

---

المُسلمُ يَلجأُ إلى الله ويتضرَّعُ إليهِ في وقتِ الشدَّة، يَقولُ تَعالَى: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ [النمل ٦٢].

# نوێژی ئەبی معلق

ئەبو موعلەق یەکێک بوو لە هاوەڵان ﷺ بەماڵێکی باشەوە دەرچوو بۆ بازرگانی دزێکیش لەگەڵی دەرچوو، لە ڕێگەیەکدا پێی گەیشتو ماڵەکەی لێسەند، وتی: لێم گەڕێ نوێژێک بکەم، دزەکە وتی: نوێژ بکە! ئەویش هەستا دەست نوێژی شۆردو پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، دەستی بەرز کردەوە کەوتە پاڕانەوە ووتی: ئەی خۆشەویست، ئەی خاوەنی عەرشی بەرزوبڵند، ئەی ئەو زاتەی هەرچیت بوێت هەر ئەوە دەبێت، داوات لێدەکەم بە عیزەتی تۆ کە لەناو ناچێت، بە موڵکی تۆ کە لە بەین ناچێت، وە بەنوری تۆ کە هەموو گۆشەیەکی عەرشی پڕ کردووە، ڕزگارم بکە لەدەست ئەم دزە. ئەی هاوار تێکراو فریام کەوە، ئەی هاوار لێکراو فریام کەوە، ئەی هاوار لێکراو فریام کەوە!

کاتێک کە لە نوێژو دوعاکەی لێ بووەوە بینی سوارێک لەبەردەمیدایەو شمشێرێکی بە دەستەوەیە بەرزی کردۆتەوە ڕووی کردۆتە دزەکەو کوشتویەتی.پاشان هات بۆی ئەبی موعلەق وتی: هەستە! هەستاو وتی: تۆ کێی؟ بەڕاستی من داوام کردکە خوا فریام بکەوێت. سوارەکە وتی: من فریشتەم لە خەڵکی ئاسمانی چوارەمم. کاتێک هاوارت کرد گوێم لە دەرگای ئاسمان بوو پاشان دوو بارە هاوارت کرد گوێم لە گفتوگۆی خەڵکی ئاسمان بوو، بۆ سێیەم جار داوات کردەوە وتیان: دوعای لێقەوماوێکە داوام کرد لە خوای گەورە کە مۆڵەتم بدات سەرت بخەمو ڕزگارت بکەم! پاشان وتی: مژدە بێتو بزانە هەرکەسێک دەست نوێژ بشواتو چوار ڕکات نوێژ بکات دوعا بکات بەم وشانە خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە وە لێقەوماو أبو بێت یان نا (ئیبن ئەبی دنیاو نەعیم) ڕیوایەتیان کردووە.

---

موسوڵمان هانا دەباتە بەر خوای گەورە لە کاتی گرانو لێقەوماندا خوای گەورە دەفەرموێت: ((أمّن يجيب المظهر اذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الارض أءله مع الله قليلا ما تذكرون)) النمل ٦٢

# قَصَصُ آدابِ الدُّعاءِ

الدُّعاءُ سلاحُ المُؤمنِ، وعمَادُ الـدِّينِ، ونـورُ السـماوات وَالأرضِ، بهِ صَلاحُ النُّفوسِ وَالقُلوبِ، والدُّعاءُ هُوَ العِبادةُ.

وَفِي الدُّعاءِ، يَمُدُّ العبدُ يديَه إلى السَّماء، مُقرّاً بضَعْفه وَعجْزِه، يقولُ: اللَّهم.. اللَّهم.. يَا رَب عَالماً ﴿أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ [الطلاق:١٢]. فَيسمَعُ اللهُ مُناجَاته، ويُجيبُ استغاثَتَهُ، وَيُحَقِّقُ لهُ مَا يرجُو ويَأْمَلُ.

وَليس شَيءٌ أكرَمُ على الله عزَّ وجلَّ مِنَ الدُّعاءِ؛ لِذلكَ فَإنَّهُ ـ سُبحانَهُ ـ يغضَبُ إنْ تركَ عِبادُهُ سُؤالَهُ والتَّضَرُّعَ إليهِ في حاجاتِهِمْ وَهُوَ ـ سُبحانَهُ ـ يترُكُ بابَهُ مَفتوحاً لكُلِّ سَائلٍ، قَالَ تَعالَى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ [البقرة:١٨٦].

وَللدُّعَاءِ المُستَجَابِ آدابٌ، لا بُدَّ للمُؤمنِ منْهَا، لِيكُونَ دُعاؤُهُ مَقبُولاً، وقَدْ ذَكَرْنَاهَا فِي هذَا الكتابِ بِأُسلوبٍ سَهلٍ، فَلْنَتَفَهَّمْهَا وَلْنَعْمَل بمَا فِيها.

# چیرۆکەکانی ئاداب پاڕانەوە

نزاو پاڕانەوە چەکی موسوڵمانە. پایەیەکی گەورەی دینە، نوری ئاسمانەکانو زەوییە، بەهۆیەوە دڵو دەرون چەك دەبێت، نزاو پاڕانەوە خودی خواپەرستیە. لە نزاو پاڕانەوەدا، بەندە دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان، دان بە لاوازیو دەستەوسانی خۆیدا دەنێت دەڵێت: ئیلاهی ئیلاهی...پەروەردگاری من باش دەزانیٚ کە((ان الله على كل شئ قدير وان الله قد احاط بكل شئ علما)) الطلاق ١٢

خوای گەورە بیسەری موناجاتەکانە، وەڵامی لێقەوماوان دەداتەوە، وە ئەوەی ئاواتی دەخوازیو تکای لەسەر دەکەی بۆت دێنێتە دی.

هیچ شتێك بە ئەندازەی دوعا پیرۆز نیە لای خوای گەورە، هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە توڕەیە لەوانەی خواپەرستی ناکەنو بە گەردن کەچیەوە ناپاڕێنەوە، داوای پێویستیەکانیان لە خوا ناکەن. خوای پاكو بێگەرد دەرگای داواکاری بەندەکانی بە والآکراوی هێڵاوەتەوە، دەفەرموێت: ((وإذا سألك عبادي عنى فأني قريب اجيب دعوة الداعي اذا دعان فاليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون))البقرة ١٨٦

دوعای وەرگیراو کۆمەڵێك ئادابی هەیە، پێویستە موسوڵمان بەردەوام لەبەر چاویان بگرێت، لەگەڵ دوعاکانیدا بژی وە چێژیان لێوەربگرێت، بە هۆیانەوە لە خوا نزیك ببێتەوە، بیانکاتە سوپەرو پەرژینی خۆی لە شەڕی شەیاتین وە نەفسی بەدکار، لەم کتێبەدا بە شێوازێکی ئاسان روون کراوەتەوە با کاریان پیٚ بکەین دوای تێگەیشتنیان.

# ئادابی پاك و خاوێنی

نوسنی: عبدالعزیز سید هاشم

وەرگێڕانی: م. ناصح محمد شاربازێری

# عذابُ القبْرِ

مَرَّ النَّبيُّ ﷺ على قَبرٍ، فسمع صوتَ رَجُلَينِ يُعَذَّبانِ في قبْرَيْهِمَا، فقالَ لأصحابِهِ: «إنَّهمَا لَيُعَذَّبان، وما يُعَذَّبانِ في كبيرٍ: أمَّا أحَدُهُمَا فكانَ لا يَسْتَتِرُ مِن البَولِ، وأمَّا الآخَرُ فكانَ يَمْشِي بالنَّميمَةِ» [البخاري].

ثُمَّ أخَذَ النَّبيُّ ﷺ جَرِيدةَ نَخْلٍ، فشَقَّهَا نِصفَينِ، ووَضَعَ علَى كُلِّ قبرٍ منْهُمَا نِصْفاً.

فَسُئِلَ النَّبيُّ ﷺ: يا رسولَ الله! لِم فعَلْتَ هذَا؟

فقالَ ﷺ: «لعَلَّهُ أنْ يُخَفِّفَ اللهُ عنهمَا ما لَمْ تَيْبَسَا» [البخاري].

فالإِسلامُ دِينٌ يَحْرُصُ علَى نَظافَةِ البَدَنِ، والثَّوبِ، والمكانِ، ويَشترِطُ لصِحَّةِ الصَّلاةِ: الطَّهارةَ مِنَ النَّجاسَاتِ، وجَعَلَ الوُضوءَ والطَّهارَةَ أمانةً يَجِبُ علَى المُسلِمِ مُراعاتُها بَيْنَهُ وبينَ ربِّهِ عزَّ وجَلَّ.

---

بَوْلُ الآدَميِّ نَجِسٌ يَجِبُ الاحترازُ منْهُ والتَّطَهُّرُ منْهُ؛ سواءً كانَ ذلكَ بِغَسْلِه أمْ بِرَشِّه بالماء.

# سزای ناو گۆڕ

پێغەمبەر "ﷺ" بە لای کۆمەڵە گۆڕێکدا ڕۆشت، گوێی لە دوو قەبر بوو کە ئەوانەی ناویان سزا دەدران، بە هاوەڵانی فەرموو: ئەو دووانە سزا دەدرێن، لە بەرامبەر گوناهی گەورەشدا سزا نادرێن! یەکێکیان لە کاتی سەرئاودا خۆی لە میز نەپاراستووە، ئەوی تریش کەسێک بوو قسە هێن و قسەبەر بووە (البخاري).

پاشان پێغەمبەر "ﷺ" لقە خورمایەکی تەڕی هەڵگرت و کردی بە دوو کەرتەوە، هەر یەکێکیانی لەسەر گۆڕێکیان دانا پرسیاریان لە پێغەمبەر "ﷺ" کرد: ئەی پێغەمبەری خوا "ﷺ" بۆچی ئەوەت کرد؟

فەرموی: بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ئازاریان لەسەر سوک بکات تا ئەو چڵە دارانە وشک دەبنەوە.(البخاري).

کەواتە: ئیسلام پەیامێکە سورە لەسەر پاک و خاوێنی لاشەو جل و بەرگ و جێگە. وە بۆ تەواوی نوێژ بە مەرجی گرتووە پاک و خاوێنی لە هەموو پیسیەک.و دەست نوێژو خۆشۆردنی بە ئەمانەت داناوە کە پێویستە موسوڵمان پارێزگاری لێبکات لە نێوان خۆی و پەروەردگاریدا.

---

میزی مرۆڤ پیسەو پێویستە خۆپاراستن لێی و خۆپاک کردنەوە لێی جا بە شۆردنی بێت یان بە ئاو ڕشتن بە سەریدا.

# الإمامُ المُتَيمِّمُ

بعث رسـولُ الله ﷺ جيشـاً إلَـى ذات السَّلاسـلِ، وكَـانَ عَمْرُو بنُ العاصِ رضي الله عنه أمير ذلكَ الجيشِ.

وفِي ليلةٍ شديدةِ البَردِ، احتَلَمَ عمرُو بنُ العـاصِ، فخَـافَ أنْ يغتَسِلَ فيَهْلَكَ مِنْ شِدَّة البَردِ، فتَيمَّمَ، ثُـمَّ صَـلَّى بأصـحابِه صلاةَ الصُّبحِ.

ولَمَّا قَدمُوا إلَى المدينةِ، ذَكَرَ ذلكَ عَمْروٌ لرَسولِ الله ﷺ، فقالَ لَه: «يا عَمْرُو! صَلَّيتَ بأصحابِكَ وأنتَ جُنُبٌ؟».

فقالَ عَمْرٌو: نَعمْ يا رَسُولَ الله، إنِّي احتَلَمْتُ في ليلـةٍ بـاردةٍ شديدة البَردِ، فأشفَقْتُ إن اغتسَلْتُ أنْ أهْلَكَ، وذكَرْتُ قـولَ الله تعالى: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ [النسـاء: ٢٩]، فتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيتُ.

فضَحكَ رسولُ الله ﷺ، ورَضِي بفِعْلِ عَمْـروٍ. [أبـو داود وأحمد].

---

النَّجَاسةُ هي القَذَارةُ التي يجِبُ علَى المُسـلِمِ أنْ يتَنـزَّهَ عَنْهَـا، ويَغسـلَ مَـن أصابَهُ منْها، وتَطْهُرُ الأرضُ ـ إذا أصـابَتْهَا نجَاسـةٌ ـ بِصـبِّ المـاءِ عليهـا، وتَطْهُرُ أيضاً بالجَفَاف

# پێشەوایەك كە تەیەمومی كردووە

پێغەمبەر "ﷺ" سوپایەكی نارد بۆ (ذات السلاسل) (عەمری كوڕی عاص) "رضي الله عنه" سەركردەی ئەو سوپایە بوو. لە شەوێكی زۆر ساردا، عەمری كوڕی عاص "رضي الله عنه" لەش گران بوو، ترسا ئەگەر خۆی بشوات لە سەرماندا ماندو بێت و تیا بچێت، بۆیە (تەیەموم)ی كرد، پاشان نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵەكانی كرد.

كاتێك گەڕانەوە بۆ مەدینە، (عەمر) ئەمەی بۆ پێغەمبەر"ﷺ" گێڕایەوە، پێغەمبەر"ﷺ" فەرموی: نوێژت بۆ هاوەڵانت كردو لەشت گران بوو؟ عەمر وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا"ﷺ" من لە شەوێكی زۆر ساردا لەشگران بووم، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم تیابچم، جا بیری فەرمایشتی خوام كردەوە كە دەفەرموێت:﴿خۆتان مەكوژن خوای گەورە بە سۆزە لەگەڵتان﴾ بۆیە تەیەمومم كردو پاشان نوێژم كرد.پێغەمبەر"ﷺ" زەردەخەنەی كردو پێكەنی.وە بەكردارەكەی عەمر ڕازی بوو.(ابو داود و احمد).

---

پیسی ئەو شتانەیە كە دەبێت موسوڵمان خۆی لێ بپارێزێت، وە ئەگەر پێوەی بوو، بیشوات، ئەگەر زەوی پیس بوو بە ڕشتنی ئاو بەسەر ئەو زەویەدا پاك دەبێتەوە، هەروەها بە ووشك بونەوەشی پاك دەبێتەوە.

# وُضُوءُ بِلالٍ

ذات يومٍ، نام النَّبيُّ ﷺ، فرأى فِي مَنامه أنَّه سمع صوتَ وَقْعِ أقدامِ بِلالِ بنِ رَبَاحٍ رضي الله عنه في الجنَّة، فقالَ له: «يا بِلالُ! حدِّثْني بأرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإسلامِ؛ فإنِّي سَمِعتُ دَفَّ (صَوْتَ) نَعْلَيْكَ بينَ يَدَيَّ فِي الجنَّة».

فقالَ بلالٌ ما عَمِلتُ عمَلاً أرْجَى عنْدِي منْ أنِّي لَمْ أتطَهَّرْ طَهُوراً (أتَوَضَّأُ) فِي ساعةٍ منْ ليلٍ أو نهارٍ إلاَّ صلَّيتُ بِذلكَ الطَّهورِ ما كُتِبَ لِي أنْ أُصَلِّي. [متفق عليه]

فالوُضُوءُ لَهُ فَضْلٌ كبيرٌ فِي الإسلامِ؛ فَبِهِ يُصبِحُ المُسلِمُ قَريباً مِنْ ربِّهِ، يُراقِبُه فِي أفعالِهِ وتَصرُّفاتِهِ. وبِه يَتَمَكَّنُ المُسلِمُ مِنَ الدُّخولِ فِي الصَّلاة ومُناجاةِ الله، وقِراءَةِ القُرآنِ.

ويُسْتَحَبُّ للمُسلِمِ أنْ يُصَلِّي ركعتَينِ بعدَ كُلِّ وُضوءٍ، لمَا لَهُمَا منْ فَضلٍ عظيمٍ.

---

للوضُوءِ فَضْلٌ عظيمٌ؛ يَقولُ النَّبي ﷺ: «مَنْ تَوضَّأَ فأَحسنَ الوُضوءَ؛ خرجَت خَطَاياهُ مِنْ جسَده حتَّى تَخرُجَ مِن تَحتِ أظفارِهِ» [مسلم].

# دەستنوێژی بیلال 

ڕۆژێک، پێغەمبەر ﷺ نوستبوو، لە خەویدا گوێی لە دەنگی ڕۆشتنی (بیلالی کوڕی ڕەباح) (رضي الله عنه) بوو لە ناو بەهەشتدا!. وتی: ئەی بیلال! پێم بڵێ باشترین کارت لە ئیسلامدا کە ئومێدت پێی هەبێت چی یە؟ چونکە من دەنگی نەعلەکانی تۆم لە پێش خۆمەوە بیست لە بەهەشتدا؟ بیلال رضي الله عنه فەرموی: هیچ کارێکم نەکردووە زۆر ئومێدەواربم پێی، تەنها ئەوە نەبێت لە من لەهەر سات و کاتێکدا لە شەو یان ڕۆژدا دەست نوێژم گرتبێت بەو دەست نوێژە چەند خوای گەورە یارمەتی دابم نوێژم پێ کردووە.(متفق عليه).

دەست نوێژ پاداشتی گەورەی هەیە لە ئیسلامدا، بە هۆی ئەوەوە موسوڵمان نزیک دەبێتەوە لە پەروەردگاری وە چاودێری کردارو هەڵس و کەوتی دەکات، بەهۆی دەست نوێژەوە موسوڵمان دەتوانێت بچێتە ناو نوێژەوەو گفتوگۆ لەگەڵ خوادا بکات و قورئان بخوێنێت. وە سونەتە بۆ موسوڵمان کە دوو ڕکات نوێژ لە دوای هەموو دەست نوێژێکەوە بکات، چونکە پاداشتی گەورەی هەیە.

جا با پاشی نوێژی عەصر وە باسی بێت

---

دەست نوێژ پاداشتی گەورەی هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر کەس دەست نوێژ بگرێت بە تەواوی، ئەوا گوناهەکانی لە لاشەی دەردەچن هەتا گوناهەکانی لە ژێر نینۆکەکانیانەوە دێنە دەرەوە. (مسلم).

# آثارُ الوُضوءِ

ذاتَ يومٍ ، زارَ النَّبي ﷺ المَقَابر فِي البَقيعِ ، فقالَ «السَّلامُ عليكُم دارَ قَومٍ مُؤمنينَ ، وإنَّا إنْ شاء اللهُ بِكُم لاحقُونَ». ثُمَّ قالَ ﷺ «وَددْتُ أنَّا قَدْ رأَيْنا إِخوانَنا».

فقالَ الصَّحابةُ أولَسْنَا إِخوانَكَ يا رسولَ اللهِ؟ قالَ ﷺ «أنْتُم أَصحَابِي ، وإِخوانُنَا الذينَ لَمْ يأتُوا بَعْدُ».

قالُوا : كيفَ تَعرِفُ من لَمْ يأت بَعْدُ منْ أُمَّتِكَ يا رسولَ اللهِ؟ فقالَ ﷺ «أرأيتَ لو أنَّ رَجلاً لَهُ خَيلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ (لهَا بَيَاضٌ فِي وَجهِهَا وقَوَائمها) بينَ ظَهْرَيْ خَيلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ (سُودٍ).. ألاَ يَعرِفُ خَيْلَهُ؟». قالُوا بلَى يا رسولَ اللهِ. فقالَ ﷺ «فإنَّهُم يأتُونَ غُرَّاً مُحَجَّلينَ مِنَ الوُضوءِ ، وأنا فَرَطُهُمْ (أتقَدَّمُهُمْ) علَى الحوضِ» [مسلم].

فالوُضوءُ مِنْ سِمَاتِ المُسلِمِ ، وهُوَ يُحافظُ عليهِ؛ لأنَّهُ يُعْرَفُ بِهِ فِي الدُّنيا بِنُورِ الوَجهِ ، وفِي الآخرةِ يكُونُ لَهُ ضِياءً فِي وَجْهِهِ ، يومَ يلتقِي بالنَّبيِّ ﷺ.

---

الوُضوءُ سببٌ فِي زيادةِ الأَجْرِ يومَ القيامة؛ قالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «تَبلُغُ الْحلْيَةُ مِنَ المُؤمنِ حيثُ يَبْلُغُ الوُضُوءُ» [مسلم].

# شوێنەواری دەستنوێژ

ڕۆژێک پێغەمبەرﷺ سەردانی گۆڕستانی (بقیع)ی کرد فەرموی: سلاوی خواتان لی بێت نیشتەجێیانی هۆزی باوەڕداران، ئێمەش خوا بیەوێت پێتان دەگەین، پاشان پێغەمبەرﷺ فەرموی: خۆزگە ئێمە براکانمان دەبینی.

هاوەلان وتیان: ئایا ئێمە برای تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری ﷺ فەرموی: ئێوە هاوەڵمن، براکانم ئەوانەن هێشتا نەهاتون.!!

وتیان: چۆن کەسانێک دەناسیت لە ئومەتەکەت کە هێشتا نەهاتوون ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟!

پێغەمبەری ﷺ فەرموی: ئەگەر کەسێکی ئێوە ئەسپێکی ناو چاو سپی و دەست و پێ سپی هەبێت لە ناو کۆمەڵە ئەسپێکی تەواو ڕەش و قەترانیدا ئایا ئەوانەی خۆی ناناسێتەوە؟

وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ. ئەویش ﷺ فەرموی: ئەوانەن لە ئوممەتەکەم شوێنەواری دەستنوێژ (دەم و چاوو دەست و قاچی) سپی کردوون من پێشیان کەوتووم بۆ سەر حەوزەکەم.(مسلم).

دەستنوێژ لە نیشانەکانی موسوڵمانە، بۆیە هەموو کات پارێزگاری لێدەکات، چونکە دڵنیایە لە دنیا پێی دەناسرێتەوەو لە قیامەتیشدا ڕۆشنایی و نور دەخاتە ناوچاوی لەو ڕۆژەدا کە بە خزمەت پێغەمبەرﷺ دەگات.

---

دەستنوێژ دەبێتە هۆی زیادکردنی پاداشت لە ڕۆژی قیامەتدا. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئاڵتون بۆ بڕوادار لە قیامەتدا دەگاتە ئەو شوێنەی ئاوی دەستنوێژی پێ دەگات.(مسلم).

# وَيْلٌ لِلأَعقَابِ

كانَ الصَّحابةُ رضي الله عنهم فِي سَفَرٍ، فلَحِقَ بِهِمُ النَّبيُّ ﷺ، وقدْ دخَلَ عليهِم وقتُ العَصرِ، فأخذَ الصَّحابةُ يتوَضَّؤُونَ استِعداداً للصَّلاة، ورآهُمُ النَّبيُّ ﷺ لا يَغسِلونَ أرجُلَهُم جيداً، فأرادَ النَّبيُّ ﷺ أنْ يُرشِدَهُم إلى ضرورةِ الاهتِمامِ بغَسلِ أرجُلِهم وأعقَابِهم (عِظامِ مُؤخَّرَةِ القَدَمِ)، فنادَاهُمْ بأعلَى صوتِه «وَيلٌ للأَعقابِ مِنَ النَّارِ» مرَّتَينِ أو ثلاثاً. فاستَجابُوا لتَحذيرِهِ وغسلُوا أرجُلَهُم، وأسْبَغُوا الوُضوء. [البخاري].

لَقَدْ أرادَ النَّبيُّ ﷺ أنْ يُنبِّهَ المُسلمينَ إلَى أنْ يُحسِّنُوا وُضوءَهُم ويُسبِغُوهُ، وإلَى أنْ يُتْقِنُوا كُلَّ أعمالِهم؛ فاللهُ يُحِبُّ الإنسانَ الَّذي يُتقِنُ عمَلَهُ، ولاَ يَستَهِينُ بشَيءٍ، بَلْ كلُّ عملٍ يعمَلُهُ ينبَغِي أنْ يَقضِيَهُ على خيرِ وجهٍ وأحسنِ أداء؛ حتَّى يَنالَ رِضَا اللهِ عزَّ وجَلَّ.

---

فَرَائِضُ الوُضوءِ ستَّةٌ هي النِّيَّةُ، وغَسلُ الوَجه، وغَسلُ اليدَينِ إلَى المِرْفقَينِ، ومَسحُ الرَّأسِ، وغَسلُ الرِّجلَينِ إلى الكَعبينِ، والتَّرتيبُ.

# هاوار بۆ ئەوانەی پاژنەیان تەڕ ناکەن

هاوەڵان ﭫ لە گەشتێکدا بوون، پێغەمبەرﷺ پێیان گەشت، لەو کاتەدا کاتی نوێژی عەسر بوو، هاوەڵان دەستنوێژیان گرت و ئامادە بوون بۆ نوێژ، پێغەمبەرﷺ بینی قاچیان بەباشی ناشۆرن، ویستی ئامۆژگارییان بکات بە گرنگی شۆردنی قاچ و پاژنەی قاچ، بە دەنگی بەرز بانگی کرد(هاوار بۆ ئەوانەی پاژنەی قاچیان باش ناشۆرن)دوو جار یان سێ جار فەرمووی!!

ئەوانیش وەڵامی ئاگادارییەکەی پێغەمبەرﷺ یان دایەوە و بەباشی قاچیان شۆرد و دەستنوێژی تەواویان گرت.(البخاري).

پێغەمبەرﷺ ویستی ئاگاداری موسوڵمانان بکات لە بارەی جوان دەستنوێژ گرتن، وە جوان ئەنجامدانی هەموو کارێك لە کاروبارییان، چونکە خوای گەورە پێی خۆشە مرۆڤ هەر کارێکی بەچاکی و جوانی ئەنجامی بدات وە سوکایەتی بەهیچ شتێك نەکات. تا ڕەزامەندی خوای گەورە بە دەست بهێنێ.

---

فەرزەکانی دەستنوێژ شەشە: نیەت هێنان- شۆردنی دەم و چاو- شۆردنی هەردوو دەست لەگەڵ ئانیشکەکان دەستی تەڕ هێنان بەسەردا-شۆردنی هەردوو قاچ تا قولە پێ لەگەڵ ڕیزبەندی بەم شێوەی باسکرا.

# المَسْحُ علَى الخُفَّين

ذات يومٍ، مسح عبدُ اللهِ بنُ عُمرَ ـ رضِـيَ اللهُ عنـهما ـ علَـى خُفَّيْهِ بدَلاً مِنْ أن يَغسِلَ رِجلَيْه، فـرآهُ سـعْدُ بـنُ مالـكٍ رضـي الله عنه، فتَعَجَّب منْ عمَله هذَا، وسألَهُ إنَّكُم لتَفعَلُونَ ذلكَ؟!

فلمَّا ذهَبا إِلَى عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قالَ سَعْدٌ لِعُمَرَ: أَفْت ابنَ أَخِي فِي المسحِ علَى الخُفَّين

فقالَ عُمَرُ: كُنَّا ونحنُ مع رسولِ الله ﷺ نمسَحُ علَى خِفَافنَـا؛ لا نَرَى بذلكَ بأساً فتَساءَلَ عبـدُ الله: وإنْ جـاء مـنَ الغـائطِ؟ قـالَ عُمَرُ: نَعمْ. [ابن ماجه].

وهذَا مِنْ يُسْرِ الدِّينِ؛ فالإِسلامُ دِينُ السَّمَاحةِ واليُسْرِ، يُراعِي أحوالَ النَّاسِ وأوقاتِهم، ويُيَسِّرُ لَهُم أُمورَ العِبادةِ، فلاَ يَقِـفُ الحَـرُّ أوِ البَردُ حائلاً دُونَ أداء الفُرُوضِ، كذلكَ قدْ يَلبَسُ الإنسانُ حـذاءً يَصعُبُ خَلعُهُ عندَ الوُضوءِ، فيكفِي الإنسانَ ـ فِي هـذهِ الحـالِ ـ أنْ يَمْسَحَ عليهِ؛ بشَرط أنْ يكُونَ لُبْسَهُ على وُضُوءٍ.

---

يمكِنُ لِلمُسلمِ أنْ يَمسَحَ علَى الجوربينِ يوماً ولَيلةً لِلمُقيم، وثلاثةَ أيَّـامٍ ولياليهِما للمُسافرِ ويَبطُلُ المسحُ بانقضاء المُـدَّة، أوِ الجَنَابـة، أو نَـزعِ الجَوْرَبِ

# مەسح کردن بەسەر (خوف)دا

ڕۆژێک (عبدالله کوڕی عومەر) ﷺ لە جیاتی ئەوەی قاچی بشوات، دەستی تەڕی بەسەر خوفەکانیدا هێنا، (سەعدی کوڕی مالک)ﷺ ئەم کارەی بینیو سەرسام بوو پێی، پرسیاری لێکرد: ئێوە ئەم کارە دەکەن؟! کاتێک چون بۆ لای پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب)ﷺ سەعد پێی وت: ئامۆزا، فتوامان بۆ بدە دەربارەی مەسح کردن بەسەر خوفدا. عومەر ﷺ فەرموی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوین مەسحی خوفەکانمان دەکرد، هیچ شتێکی خراپی تیا نەبووە، عبدالله ﷺ پرسی: ئەگەر لەسەر ئاویش بوبێت؟! پێشەوا عومەرﷺ فەرموی: بەڵێ.(ابن ماجه).

ئەمەش ئاسانکاری دینە، ئیسلام پەیامی لێبوردن و ئاسانکاری یە بارودۆخی خەڵک لێک دەداتەوە، کاروباری بەندایەتیان بۆ ئاسان دەکات، بۆیە ساردی و گەرمی نایێتە بەربەست لە جێبەجێکردنی فەرزەکاندا.

---

دەگونجێت کە مرۆڤی موسوڵمان مەسحی سەر گۆرەوی بکات شەوو ڕۆژێک ئەگەر نیشتەجێ بوو وە سێ شەوو ڕۆژ بۆ کەسی گەشتیار، مەسح کردن بەتاڵ دەبێتەوە بە تەواوبونی کات و لەشگرانی و دانانی لە خوفەکە لە پێدا.

تێبینی/ هەندێک لە زانایان مەسح کردن بەسەر گۆرەویدا بە دروست نازانن چونکە مەرجەکانی (خف)ی تیا نیە.(وەرگێڕ).

# العِقدُ الضَّائعُ

خرج الرَّسولُ ﷺ في سفَرٍ معَ أصحابِهِ، وبينما هُمْ في الصَّحراءِ انقطَع عقْدٌ للسَّيِّدة عائشةَ، فانتَظَرَ الرَّسولُ ﷺ ليَبحَثَ عَنْهُ، وانتظَرَ النَّاسُ معَهُ، وقدْ نَفَدَ ما معهُمْ مِنَ الماء، ولَمْ يَجِدُوا ماء فِي المَكانِ، فجاء النَّاسُ إلى أبِي بكرٍ رضي الله عنه، وقالُوا لَهُ ألاَ تَرَى إلى ما صنَعَت عائشةُ؟! أقامَتْ بِرَسولِ الله ﷺ وبالنَّاسِ مَعَهُ، وليسُوا علَى ماء، وليس مَعَهُم ماءٌ. فذهَبَ أبو بكرٍ إلى السَّيِّدة عائشةَ يُعاتِبُها ويُعَنِّفُها علَى ذلِكَ.

وكَانَ رسولُ الله ﷺ نائماً، فأصبَحَ ولَمْ يَجِدْ ماءً، واحتَاجُوا إليهِ للوُضوءِ والصَّلاة؛ فأنزَلَ اللهُ ـ سبحانَهُ وتَعالى ـ آيةَ التَّيَمُّمِ تَيسيراً وتَخفِيفاً علَى المُسلمِينَ

فَفَرِحَ المُسلمونَ بذلكَ، وقالَ أُسَيْدُ بنُ الحُضَيرِ ما هي بأوَّلِ بركَتكُمْ يا آلَ أبِي بكرٍ وتَحرَّكَ النَّاسُ ووجَدُوا العقدَ تحتَ البَعيرِ [مسلم].

---

التَّيَمُّمُ هُوَ ضَرْبُ الكَفَّينِ علَى التُّرابِ الطَّاهرِ، ثم النَّفخُ فِيهمَا، ومسحُ الوجه واليدينِ بنيَّةِ التَّطَهُّرِ للصَّلاة

# بازنەی ونبوو 

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا رضي الله عنه دەرچون بۆ سەفەر لە کاتێکدا لە بیاندا بوون، بازنەکەی خاتو (عائیشە) رضي الله عنها ونبوو، پێغەمبەر ﷺ چاوەڕێی کرد تا بگەڕێن بۆی و خەڵکیش چاوەڕێیان کرد. ئیتر ئەو ئاوەی پێیان بوو تەواو بوو، لەو شوێنەشدا ئاویان دەست نەکەوت، خەڵک هاتن بۆ لای ئەبو بەکر رضي الله عنه پێیان ووت: نابینی عائیشە رضي الله عنها چی کرد؟! پێغەمبەر ﷺ و خەڵکەکەی هێشتەوە، ئاویش نییە، ئاویشمان پێ نییە.!!

ئەبو بەکر رضي الله عنه ڕۆشت بۆ لای خاتوو عائیشە رضي الله عنها تا سەرزەنشتی بکات و لێی تورە بێت لەسەر ئەو کارە.پێغەمبەر ﷺ نوستبوو، کە خەبەری بووەوە ئاوی دەست نەکەوت، بۆ دەست نوێژیش پێویستیان پێی بوو، خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوە بۆ ئاسانکاری و سووک کردنی کار لەسەر موسوڵمانان، موسوڵمانان زۆر دڵخۆش بوون بەوە،(ئوسەید کوڕی حضیر) رضي الله عنه فەرمووی: ئەمە بە هۆی بەرەکەتی ئێوەوە بوو ئەی ئەبوبەکر ئیتر خەڵک جوڵان بۆ ڕۆشتن، بازنەکەش لە ژێر وشترەکەدا بوو، دۆزرایەوە(مسلم).

---

تەیەموم: واتە دەست کێشان بەخاکدا کە پاک بێت پاشان فوی پیا دەکات و بە دەم و چاویدا دەهێنێ پاشان جارێکی تر بە هەردو دەستدا بە مەبەستی خاوێنی و پاکی بۆ دەست نوێژ.

# فَتْوى قَاتِلَةٌ

خرج بعض الصحابةِ فِي سفر، فأُصيبَ رجل منْهم بحَجَرٍ في رأسه، فجرِح، ثُمَّ احتَلَم وأصبح جُنُباً، وأَرادَ أنْ يَتيَمَّم حتَّى لا يأتِي الماءُ علَى الجُرحِ فيُؤذِيه، فسألَ أصحابَهُ هلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصةً فِي التَّيمُّمِ؟ قالُوا له ما نَجِدُ لكَ عُذْراً، وأنتَ تَقدرُ علَى استخدامِ الماء

فَاغتسَل الرَّجلُ، وتأَثَّرَ جُرْحُهُ بالماءِ، فمَاتَ.

فلَمَّا رجَعُوا إلى النَّبي ﷺ أخبروهُ بذَلكَ، فقالَ: «قَتَلُوهُ؛ قَتَلَهُم اللهُ، ألاَ سَأَلُوا إذَا لَمْ يَعْلَمُوا؛ فإنَّمَا شِفَاءُ العِيِّ السُّؤالُ، إنَّمَا كَانَ يكْفيِه أنْ يَتيَمَّمَ، ويَعْصُب علَى جُرحِهِ خِرْقةً (قطعة قماشٍ)، ثُمَّ يمسح عليهَا، ويَغسِلِ سائرَ جسَدِه» [أبو داود].

وهذَا يُرشِدُنا إلى ألاَّ نتَحدَّث فِي أمرٍ مِنْ أُمورِ الدِّينِ إلاَّ ونحنُ علَى علْمٍ تامٍّ بِهِ، وإلاَّ فَلْنَتْرُك الأَمرَ لِعُلَماء الدِّينِ والفُقَهاء، ولْنَسْأَلْهُمْ عمَّا لاَ نَعرِفُ.

---

من الأسبابِ المُبيحة للتَّيمم عدَمُ وجودِ الماءِ، أوِ الخَوفُ مِنِ استعماله لضررٍ أو مرَضٍ، أو فوَات وقتِ الصَّلاةِ، أو كانَ الماءُ قليلاً والحَاجةُ إليه شَديدةٌ.

# فتوایەکی بکوژ

هەندی هاوەڵ لە گەشتێکدا دەرچون، پیاوێک لەوان بەردێک بەر سەری کەوت و بریندار بوو، پاشان لەشی گران بوو، ویستی تەیەموم بکات بۆ ئەوەی برینەکەی ئاودز نەکات و ئازاری نەدات، پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد: ئایا مۆڵەتم بۆ هەیە کە تەیەموم بکەم؟ وتیان: هیچ بەهانەیەکت نیە! تۆ دەتوانی ئاو بەکار بهێنی. کابرا خۆی شۆردو کاریگەری خراپی کردە سەر برینەکەی سەری‌و بەهۆی ئەوەوە وەفاتی کردو مرد!! کاتێک گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ هەواڵەکەیان پێگەیاند. فەرموی: کوشتیان. خوا بیان کوژێت!! ئایا بۆچی پرسیاریان نەکرد کە نەیاندەزانی؟ چونکە چارەسەری نەشارەزایی پرسیارکردنە، تەنها ئەوەندەی بەس بوو کە بەدەستی تەیەموم بکات و بە پارچە قوماشێک برینەکەی بپێچێت‌و مەسحی لەسەر بکات‌و لاشەی (جگە لە برینەکە) بشۆردایە (ابوداود).

ئەمە فێرمان دەکات کە قسە لەکاروباری ئاییندا نەکەین مەگەر کاتێک زانیاری تەواومان دەربارەی هەبێت، ئەگەر وا نەبووین پێویستە ئەو کارە بەجێ بهێڵین بۆ زانایانی ئایینی‌و فوقەهاو پرسیاریان لێبکەین دەربارەی ئەو شتانەی نازانین.

---

ئەو هۆکارانەی دروستە تەیەموم بکرێت: نەبونی ئاو، یان بترسی لەبەکارهێنانی زەرەرێک بکەیت یان توشی نەخۆشی بیت، یان بترسی لەبەسەرچونی کاتی نوێژەکە، یان ئاوەکە کەم بێت‌و زۆر پێویستت پێی هەبێت.

# التَّيَمُّمُ

خرج رجُلانِ في سَفَرٍ، فحَضَرت الصلاةُ وليس معهما ماءٌ، فتَيَمَّمَا وصلَّيا، ثُم وجدَا الماء بعدَ أنْ صلَّيا، فأعادَ أحَدُهمَا الوُضُوء، ولَمْ يُعِدِ الآخَرُ.

ولَمَّا أتَيَا إلَى النَّبي ﷺ، ذكَرَا لَهُ ما حَدَثَ، فقالَ النَّبيُّ ﷺ للرَّجلِ الَّذي لَمْ يُعِد الصَّلاةَ «أصبْتَ السُّنَّةَ، وأجْزَأتْكَ صلاَتُكَ». وقالَ لِلَّذي تَوضَّأ وأعادَ الصَّلاةَ «لَكَ الأَجرُ مرَّتَينِ» [أبو داود].

ومِنْ هذَا الموقف الجميلِ يَتَّضِحُ لنَا يُسْرُ الإسلامِ، فإنَّهُ لاَ يُكَلِّفُ الإنسانَ بشيءٍ يُسَبِّبُ لَهُ مَشَقَّةً وعَناءً، بَلْ إنَّ في تكاليفِه كلِّهَا راحَةً للنَّفْسِ ورياضَةً للجَسَدِ، وغَايةً اجْتِمَاعيَّةً سَامِيةً نَحْو تَوحيدِ المُسلمينَ وتَقْوية صُفُوفِهِم حتَّى يكونُوا عَلَى قَلبِ رَجُلٍ واحدٍ، وحتَّى يَشعُرَ كُلُّ مُسلمٍ بأخيه فِي مختَلفِ بلادِ المُسلِمينَ.

---

يُباحُ التَّيَمُّمُ للإنسانِ إذَا كانَ الماءُ قريباً منْهُ، وعَجَزَ عَنِ استخرَاجِه أوِ الحُصولِ عليهِ، أو حال بينَهُ وبينَ الماء عَدُوٌّ يُخْشَى منْهُ.

# تەیەموم

دوو پیاو ڕۆشتن بۆ گەشت، کاتی نویژ هات‌و هیچ ئاویان پێ نەبوو، تەیەمومیان کردو نوێژیان کرد. پاشان ئاویان دۆزییەوە لە دوای ئەوەی نوێژیان کردبوو، یەکێکیان نوێژەکەی گیڕایەوە، ئەوی تر نوێژەکەی دووبارە نەکردەوە. کاتێک هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ و ڕوداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ بەو کەسەی کە نوێژەکەی دووبارە نەکربۆوە فەرموی: سوننەتت ئەنجامداو نوێژەکەت دروستە، بەوەش کە نوێژەکەی گێڕابۆوە فەرموی: دووجار پاداشتت بۆ نوسراوە.(ابوداود).

ئەمە یەکێکە لەو هەڵوێستانە کە ئاسانکاری ئیسلام بۆ ئێمە ڕۆشن دەکاتەوە، چونکە ئەرکێک لەسەر مرۆڤ دروست ناکات کە نارەحەتی بکات‌و لەسەر شانی قورس بێت، بەڵکو هەموو ئەرکەکانی ئارامی دەرون‌و وەرزشی جەستەیەو مەبەستێکی کۆمەڵایەتی بەرز لە پشتییەوەیە، وەک یەکخستنی موسوڵمانان‌و بەهێزکردنی ڕیزەکانیان تا هەموو وەک دڵێکی یەک لاشە وابن، وە هەتا هەموو موسوڵمانێک هەست بە ئازارو خۆشی براکەی بکات لەهەر وڵاتێکی جیاوازدا بێت.

---

دروستە مرۆڤ تەیەموم بکات ئەگەر ئاوەکەش نزیک بوو، بەڵام توانای دەرهێنانی نەبوو، یان دەستی پێڕا نەدەگەشت، یان دوژمنێک لە نێوان ئەو کەسەو ئاوەکەدا هەبوو کە لێی دەترسا.

# الطَّهَارَةُ فِي الْحَجِّ

خرج رسولُ الله ﷺ والمُسلمونَ منَ المدينة لأداءِ فريضةِ الحجِّ في مكَّةَ، وفِي الطَّريقِ حاضت السَّيِّدةُ عائشةُ ـ رضي اللهُ عَنْهَا ـ فبكَتْ؛ لأنَّهَا [لَنْ] تَتَمكَّنْ منْ أداء مناسكِ الحَجِ، ودخَل عليهَا رسولُ الله ﷺ وهِي تَبْكِي فقالَ لَهَا: «مَا لَكِ، أَنَفَسْتِ؟ (ويَقْصدُ بالنِّفاسِ هُنَا الحَيْضَ)».

فقالَتْ نَعمْ. فقالَ ﷺ «فإنَّ ذلكَ شَيءٌ كتَبَهُ اللهُ علَى بنات آدَمَ، فافْعَلِي ما يَفعَلُ الحَاجُّ، غيرَ أنْ لاَ تَطُوفِي بالبَيتِ حتَّى تَطْهُرِيْ» [البخاري]

وبذلِكَ خَفَّفَ النَّبِيُّ ﷺ علَى المُسلمة قضَاءَ مَنَاسكِ الحجِّ، والقِيامَ بِهَا دُونَ خوفٍ أو حُزْنٍ يُصيبُهَا إذَا حَاضَتْ، فإنَّ حَيْضَهَا لا يمنَعُهَا منَ القيامِ بِفُروضِ الحَجِّ ما عَدَا الطَّوافِ بالكَعبةِ؛ وذلكَ لقدَاسةِ البيتِ المُحَرَّمِ، فأجَّلَ طَوَافَ المرأةِ حتَّى تَطهُرَ

---

الحيض هُوَ سَيَلانُ الدَّمِ من المرأة إذَا بلَغَتْ، وتُمنَعُ المرأةُ أثناءَهُ منَ الصَّلاة أوِ الصِّيامِ. فإذا انتَهَت أيَّامُ الحيضِ تَتَطهَّرُ وتُصَلِّي.

# پاك و خاوێنی لە حەج دا

پێغەمبەرﷺ و موسوڵمانان لە مەدینەوە ڕۆشتن بۆ جێبەجێکردنی فەرزی حەج لە مەککە، لە ڕێگەدا خاتوو عائیشەرضي الله عنها کەوتە سوڕی مانگانەوە، دەستی کرد بەگریان، چونکە ناتوانێت مەناسکی حەج بەجێ بهێنێت، پێغەمبەرﷺ چووە لای بینی وا دەگری، فەرمووی: چی یە؟ توشی خوێن بوویت؟ ووتی: بەڵێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە شتێکە خوای گەورە لەسەر هەموو کچانی نەوەی ئادەمی نوسیوە، حاجیەکان چی دەکەن تۆش وا بکە، بەڵام نابێت تەوافی ماڵی خوا (کەعبە) بکەیت تا کاتێک پاک دەبیتەوە(البخاری).بەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ بەجێ هێنانی حەجی بۆ ئافرەتانی موسوڵمان ئاسان کرد کە دەتوانن بەبێ هیچ ترس و خەمێک ئەنجامی بدات لەکاتی (سوڕی مانگانە).

چونکە ئەو خوێنە ڕێگەی ئەنجامدانی مەناسکی حەجی لێناگرێت جگە لە (تەواف)، ئەمەش لەبەر پیرۆزیو حورمەتی (ماڵی خوا) ئەو کاتە تەوافەکە دوا دەخات بۆ ئەو کاتەی پاک دەبێتەوە.

---

حەیز/ بریتی یە لە ڕۆشتنی خوێن لە دامێنی ئافرەت، لەو کاتەدا نابێت نوێژ بکاتو بەڕۆژو بێت، کاتێک تەواو بوو لە ڕۆژەکانی خۆی دەشوات پاشان نوێژ دەکات.

# دَرْسٌ مِنَ الرَّسُولِ ﷺ

ذات يومٍ، أُقيمتِ الصَّلاة في مسجد رسولِ الله ﷺ، ووَقَفَ المُسلمونَ صُفوفاً مُتَساوِيةً يَنتظِرونَ الرَّسولَ ﷺ لِيُصَلِّي بِهِم، فجاء الرَّسولُ ﷺ وقامَ لِيُصلِّيَ، فتَذَكَّرَ أنَّهُ جُنُبٌ، فقالَ للصَّحَابَةِ: «مكانَكُمْ». ثُمَّ ذهَبَ فاغتَسَلَ، ورَجَعَ ورأسُهُ يَقْطُرُ بالماء، فكبَّرَ وصَلَّى بالْمُسلمينَ. [البخاري].

وهكَذَا ضرَبَ النَّبيُّ ﷺ مثَلاً عظيماً لِمَا ينبَغِي أنْ يكُونَ عليهِ المُسلمُ، فإذَا استَعَدَّ للصَّلاة وتَذَكَّرَ أنَّهُ جُنُبٌ أو أنَّهُ علَى غَيرِ وُضوءٍ فلاَ يَخْجَلُ ولاَ يَكْسَلُ ولاَ يَتَرَدَّدُ عَنِ الذِّهابِ لِلْغُسْلِ والطَّهارةِ، وذلكَ لأنَّ الصَّلاةَ هيَ صِلَةُ العَبْدِ برَبِّه، فالعَبْدُ يَجِبُ عليهِ أنْ يكُونَ مُتوضِّئاً وطاهِراً وهُوَ يَقِفُ بينَ يَدَيْ ربِّه؛ يَعْبُدُه ويُناجِيْه. وهَذَا الفعلُ إذَا فعَلَهُ المُؤمِنُ فإنَّهُ يَدُلُّ علَى سُمُوِّ إيمانه وحُسْنِ اقتدائه بالنَّبِيِّ ﷺ.

---

يَحْرُمُ علَى الْجُنُبِ والحَائضِ والنُّفَساء: الصلاةُ، والطَّوافُ بالكَعبة، وقِراءَةُ القُرآنِ، والانتظارُ أو الجُلوسُ في المسجد. ويَجِبُ علَيهِمُ الغُسْلُ.

# وانەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ

ڕۆژێک، قامەتی نوێژ کرا لە مزگەوتی پیغەمبەر ﷺ موسوڵمانان بە ڕیز وەستان و چاوەڕێی پێغەمبەر ﷺ بوون نوێژیان بۆ بکات. پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێناو وەستا بۆ نوێژ، بیری کەوتەوە کە ناتوانێت نوێژ بکات و خۆشتنی پێویستە، بە هاوەڵانی فەرموو: لە جێی خۆتان بن، پاشان ڕۆشت خۆی شۆردو گەڕایەوە، سەری ئاوی لێ دەچۆڕا، (اللە اکبر)ی کردو نوێژی بۆ موسوڵمانان کرد(البخاری).

بەمە پێغەمبەر ﷺ نمونەیەکی گەورەمان نیشان دەدات کە پێویستە موسوڵمان وا بێت، ئەگەر ئامادە بوو بۆ نوێژو بیری کەوتەوە کە لاشەی گرانە یان دەست نوێژی نیە، تەریق نەبێتەوەو تەمبەڵ نەبێت و گومانی نەبێت لەوەی کە بڕوات خۆی بشوات و خۆی پاک بکاتەوەو دەست نوێژ بگرێت، چونکە نوێژ پەیوەندی نێوان بەندەو خوایە، بەندە پێویستە پاک و دەست نوێژی هەبێت لەو کاتەدا لەبەردەم خوادا ڕاوەستێت، پەرستشی بۆ ئەنجام دەدات و گفتوگۆی لە خزمەتدا دەکات، ئەم کارە نیشانەی بەرزی پلەی باوەڕە لە دڵداو نیشانەی پابەند بونە بە پێغەمبەرەوە ﷺ.

---

حەرام و قەدەغەیە لەسەر ئەو کەسەی لەشگرانە یان ئەو ئافرەتەی لە سوڕی مانگانەدایە یان خوێنی منالّ بونی هەیە: نوێژ کردن، تەواف بەدەوری کەعبەدا، خوێندنی قورئان و چاوەڕێ کردن و دانیشتن لە مزگەوتدا، پێویستە لەسەریان خۆیان بشۆرن.

# الْمُسْلِمُ لاَ يَنْجُسُ

ذاتَ يومٍ، لَقِي أبو هُرَيْرة رضي الله عنه الرَّسولَ ﷺ في إحدَى طُرُقِ المدينة، وكانَ أبُو هُرَيْرةَ جُنُباً، فمَضى مُسْتَخفياً منَ الرَّسُولِ ﷺ، ثُمَّ اغتَسل وجاء، فقالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أينَ كُنْتَ يا أبَا هُرَيْرةَ؟».

فقَالَ أبُو هُرَيْرةَ: كُنْتُ جُنُبا؛ فكَرِهتُ أنْ أُجالسَكَ وأنَا علَى غَيرِ طَهارةٍ.

فقالَ النَّبيُّ ﷺ «سُبحانَ الله! إنَّ المُسلِمَ لاَ يَنْجُسُ» [البخاري].

ويَقصدُ النَّبيُّ ﷺ بذلكَ: أنَّ هُنَاكَ طَهارةً مَعْنَويَّةً وطَهارَةً جَسَدِيَّةً؛ أو بَدَنِيَّةً، فالطَّهارةُ المَعنويَّةُ: تَعْني الإيمانَ، والمُسلِمُ يُؤمِنُ بذلكَ، وبالتَّالِي فَهُوَ طاهِرٌ مَعْنوِيّاً؛ حتَّى ولَوْ كَانَ جُنُباً غير مُغتَسِلٍ أو غيرَ مُتَوضِّئٍ، فالَّذي لا يُؤمِنُ هُو الَّذي يَنْجُسُ، أمَّا المؤمِنُ ـ حتَّى ولَوْ كَانَ غير طاهِرٍ جَسَدِيّاً ـ فإنَّهُ لاَ يَنْجُسُ.

---

من الأغْسَال المُستَحبَّة والمسنُونة: غسلُ الجُمُعة، وغُسْلُ العيدَينِ، وغُسْلُ مَنْ غَسَّل مَيْتاً، وغُسْلُ دُخول مكَّةَ، وغُسْلُ الوُقوف بعرَفَة

# موسوڵمان پیس نابێت

ڕۆژێک، ئەبو هورەیرەﷺ بە خزمەت پێغەمبەرﷺ گەیشت لە یەکێک لە ڕێگاکانی مەدینە، ئەبو هورەیرەﷺ لەشگران بوو، بە نهێنی خۆی لە پێغەمبەر ﷺ شاردەوەو ڕۆشت، خۆی شۆردو هاتەوە.

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: تۆ لە کوی بوویت ئەبو هورەیرە؟ ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: من نوێژی نەبوم، پێمناخۆش بوو بە لەشگرانی لەگەڵ تۆدا دابنیشم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: پاک و بێگەردی بۆ خوا! بەڕاستی موسوڵمان پیس نابێت.(البخاری).

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بەمە ئەوە بوو کە دوو جۆر پاکی هەیە پاکی دەرونیو پاکی لاشەیی، پاکی دەرونی مەبەست ئیمانە، موسوڵمانیش باوەڕی هەیە، کەواتە لە ڕوی دەرونەوە پاکو خاوێنە: هەرچەندە لاشەی پاک نەبێت، یان خۆی نەشۆردبێت، یان دەست نوێژیشی نەبێت، ئەوەی باوەڕی هێنابێت پیس نابێت.

باوەڕدار با لە ڕوی لاشەوە پاک نەبێت، بەڵام پیس نابێت.

---

خۆشۆردنی سوننەت: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، خۆشۆردنی دوو جەژنەکە، کەسێک مردوو بشوات، یان کەسێک دەچێتە مەککە، بۆ وەستان لە کێوی عەرەفە.

# الأَحجارُ الثَّلاثةُ

أرادَ النَّبيُّ ﷺ أنْ يَقْضِي حاجَتَهُ، فأمَرَ عبدَ الله بنَ مسعودٍ ـ رضي اللهُ عنه ـ أنْ يأتيَهُ بثلاثة أحجارٍ، فوجَدَ ابنُ مسعودٍ حجَرينِ، وبحَثَ عنِ الثَّالث فلَمْ يَجِدْهُ.

فأخَذَ رَوْثةً (رجيعَ الخَيلِ والحميرِ) وجَاءَ بِهَا إلى النَّبيِّ ﷺ، فأخَذَ النَّبيُّ ﷺ الحجَرينِ وألقَى الرَّوْثَةَ، وقالَ: «هَذه رِكْسٌ» (يعنِي: أنَّهَا مِنَ النَّجاسَةِ) [البخارِي].

وهكَذَا يُعَلِّمُنَا النَّبيُّ ﷺ اختيارَ وسائلِ الطَّهارةِ، ويُرشِدُنَا إلى الاحتِرازِ عندَ القيامِ بتَطهيرِ أنفُسِنَا، فنَختارُ الماءَ الطَّاهرَ أو أيَّةَ وَسيلةٍ أُخرَى طاهرةٍ لِلتَّنظيفِ والطَّهارةِ بعدَ قَضَاءِ الحاجَةِ. فلاَ نَستَهِينُ بذلكَ حتَّى نَضْمنَ لأنْفُسِنَا الصِّحَّةَ والسَّلامةَ، ونُبْعِدَ عنْهَا أيَّ شيءٍ قَدْ يَنقُلُ [إليها] الأمراضَ والآلامَ؛ لِذلكَ فالمُسلِمُ يَقْتَدِي بالنَّبيِّ ﷺ فِي سُلُوكيَّاته وأفعالِهِ.

---

منْ آدابِ قَضَاءِ الحاجة: أنْ تَدْخُلَ بالرِّجْلِ اليُسْرَى، وتَدْعُوَ «بسمِ الله، اللَّهُمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْث والْخَبَائِث». وتَخرُجُ باليُمْنَى، وتقولُ: «غُفْرانَكَ» [أبُو داود].

# سێ بەرد

پێغەمبەرﷺ ویستی سەرئاو بکات. بە (عبداللە کوڕی مەسعود)ﷺ ی فەرموو: (سێ بەردی بۆ بهێنێ. (ابن مەسعود)ﷺ دوو بەردی دۆزییەوە، گەڕا سێ هەمی دەست نەکەوت، پارچە شیاکەیەکی هەڵگرت هێنای بۆ پێغەمبەرﷺ دوو بەردەکەی لێوەرگرت و شیاکەو پیسیەکەی فڕێدا، فەرموی: ئەوە پیسە. (البخاري).

بەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ فێرمان دەکات هۆکارەکانی خۆپاککردنەوە هەڵبژێرین، وە خۆمان بپارێزین، لەکاتی خۆپاککردنەوەدا ئاوی پاک هەڵبژێرین، یان هەر هۆکارێکی تری پاک، بۆ پاک و خاوێنی و خۆپاککردنەوە لەسەر ئاو، وە ئەم مەسەلە بە سادە سەیر نەکەین تا خۆمان بپارێزین و تەندروست و پارێزراو بین و خۆ لەهەرشتێک دوربخەینەوە کە نەخۆشی دەگوازێتەوە. بۆیە موسوڵمان شوێن هەڵس و کەوتی پێغەمبەرﷺ دەکەوێت.

---

لە ئادابی سەرئاوکردن: قاچی چەپ پێش دەخەیت کە دەچیتە ژورەوە دەڵێیت: بەناوی خوا، خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە پیسی و شەیتانی نێرو مێ. کە هاتیتە دەرەوە قاچی ڕاست پێش دەخەیت و دەڵێی: داوام لێخۆش بوونی تۆیە.(ابو داود). بە دەستی چەپ خۆپاک بکرێتەوە. وە سەعاتو تەکتەش لە ڕاستا نجە نەزهەپ الله

# گەورە ترین ئافرەت

ڕۆژێـک لـە ڕۆژان، کۆمـەڵێک لـە ئافرەتـانی قـورەیش لەگـەڵ عائیشـە ﵂ دانیشـتبونئەو ئافرەتانـەی دانیشـتبوون قسـەیان دەکـرد دەربـارەی گەورەیـەتی ئافرەتانی قورەیش، و موسوڵمان بونیـان و کۆچـکردنیان، لـەو گەورەیەتیـەی بـە هۆی پێشکەوتنیان بۆ موسوڵمان بونیان دەستیان کەوتووە..عائیشە﵂ فـەرموی: ئافرەتانی قورەیش گەورەن، بەڵام سوێند بیت بەخوا من وا نازانم گەورە تر بـن لە ئافرەتانی ئەنسار.کەزۆر بڕوایان بە قورئان هەبوو، وە لە ئیمـان بـە قورئانـدا لەمان گەورە تر نین کە سورەتی نور دابەزی کە فەرمووی: ﴿با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا﴾.پیاوەکانیان ڕۆشتنەوە بۆ ماڵەوەو ئـەم ئایەتانـەیان خوێندەوە کەباسی حوکمی تیایە بۆ ئافرەتان.یەک ئافرەتیان نەبوو خێـرا هەسـتاو پۆشاکێکی دا بەسەریدا کە ڕۆژیان کردەوە هاتن بۆ نوێژی بەیانی نوێژی بەیانیان کرد هەموو دانەیەکیان شتێکی دابوو بەسەریدا هەر ئەڵێی بەسەر سەریەوە (ابن ابی حاتم).

---

سـوننەتە جـل و بـەرگ لەبـەرکردن لای ڕاسـتەوە دەسـت پێبکـەین، چـونکە شوێنکەوتنی پێغەمبەری تیایە، هەمیشە پێغەمبەر پێی خۆش بوو بە (بـەکارهێنانی لای ڕاست)لە هەموو ئیشەکانیا.(بخاری ومسلم).

# الثَّوبُ والجَمَالُ

جلَس النَّبيُّ ﷺ بين أصحابِهِ يُعَلِّمُهُمْ خُلُقاً مِنْ أخلاقِ الإسلامِ، لِيَسعَدُوا به في دُنياهُمْ وأُخْراهُمْ، وهُوَ خُلُقُ التَّواضُعِ، فقال ﷺ لَهُمْ: «لا يَدخُلُ الجنَّةَ مَنْ كانَ في قَلبِه مِثْقالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ». فَخَافَ أحَدُ الصَّحابةِ، وظَنَّ أنَّهُ قَدْ يَدخُلُهُ الكِبْرُ إذَا اعتَنَى بِمَلابسِه، أو بِنَعلِه، فَقالَ لِلنَّبيِّ ﷺ: إنَّ الرَّجُلَ يُحبُّ أنْ يكُونَ ثوبُهُ حَسَناً، ونَعْلُهُ حَسَنَةً، فَهَل هذَا يُعَدُّ كِبْراً؟

فبيَّنَ النَّبيُّ ﷺ لَهُ أنَّ اعتناءَ الإنسانِ بِمَلابسِه شيءٌ جَميلٌ يُحِبُّهُ اللهُ، لأنَّ اللهَ تَعالَى جَمِيلٌ يُحبُّ أنْ يكُونَ عِبادُهُ علَى هَيئةٍ جَميلةٍ.

فَقالَ ﷺ «إنَّ اللهَ جميلٌ يُحبُّ الجَمَالَ».

ثُمَّ بيَّنَ ﷺ المَفْهوم الصَّحيحَ لِمَرَضِ الكِبْرِ، .فَقالَ ﷺ: «الكِبْرُ بَطَرُ (رَدُّ) الحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ (احتِقارُهُم)» [مسلم].

---

المُسلمُ يعتني بِمَلابسه، مِنْ حيثُ النَّظافةِ وَالكَيِّ، قَالَ ﷺ: «إنَّ اللهَ طَيِّبٌ يُحبُّ الطَّيِّبَ، نَظيفٌ يُحبُّ النَّظافةَ» [الترمذي].

# پۆشاك و جوانی

پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو لە نێو هاوەڵاندا فێری ڕەوشتی لە ڕەوشتەکانی ئیسلامی دەکردن، تا بەختەوەر بن پێی لە دنیاو قیامەتدا، ئەویش ڕەوشتی خۆ بەکەم گرتن بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون(ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی تۆزێک لە خۆ بەگەورە گرتن لە دڵیدا هەبێت، یەکێک لە هاوەڵان ترسا کە ئەو ڕەوشتە چوبێتە دڵیەوە کە گرنگی بە جل و بەرگ دەدات یا بە نەعلەکانی، پرسیاری کرد:پیاو پێی خۆشە کە جل و بەرگی جوان بێت، یان نەعلەکانی جوان بن، ئایا ئەمە کیبرە؟؟ پێغەمبەر ﷺ ڕونی کردەوە کە گرنگی دان بە جل و بەرگ شتێکی جوانەو خوا پێی خۆشە، چونکە خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێت، حەز دەکات مرۆڤەکان لەسەر شێوەیەکی جوان بن.پێغەمبەر ﷺ فەرموی (خوا جوانەو جوانی پێخۆشە) پاشان تێگەیشتنی دروستی بۆ نەخۆشی خۆ بەگەورە گرتن کرد، فەرموی:(خۆ بەگەورە گرتن ڕەدکردنەوەو مل کەچ نەکردنە بۆ ڕاستی، وە خەڵك بە کەم سەیرکردنە) (مسلم).

---

موسوڵمان گرنگی دەدات بە جل و بەرگی لە ڕوی پاك و خاوێنیەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خوا پاکەو پاکی خۆش دەوێ.خاوێنەو پاك و خاوێنی خۆش دەوێ. (ترمذي).

# الدُّعَاءُ المَقْبولُ

أُتِي رسولُ الله ﷺ بثوبِ حَريرٍ أَصفرَ مُطَرَّزٍ، فَأَخَذَهُ ونَظَر فيه، ثُمَّ قالَ لِمنْ معهُ «مَنْ تَرَوْنَ نَكْسُوهَا هذَا الثَّوبَ؟» فَسَكَتُوا ولَمْ يَنطقْ منْهُمْ أحَدٌ.

فَقالَ ﷺ: «ائتُوني بأُمِّ خالدٍ». فَأسرَعَ أهلُهَا فَحَمَلُوهَا وَجاؤُوا بهَا طفلةً صَغيرةً جميلةً، وكَانَتْ قَدْ وُلِدَتْ بأرضِ الحَبَشةِ لَمَّا هاجَرَ إليهَا أَبواهَا هَرَباً مِنْ أذَى مُشْرِكِي مكَّةَ، فلَمَّا رآهَا النَّبيُّ ﷺ أخذَ الثَّوب بيَدِه وَألبَسَهَا إيَّاهُ، وقَالَ لها مُداعِباً: «يَا أُمَّ خَالِدٍ، هذَا سَنَا، هذَا سَنَا» (أي: حَسَنٌ جَميلٌ).

فَاستَأنَستْ أُمُّ خَالدٍ برسولِ الله ﷺ وَراحَتْ تَدورُ حولَهُ، وتَضَعُ يدَهَا على كَتِفه، فَزَجَرَهَا أَبُوهَا، فَنَهَاهُ النَّبيُّ ﷺ، وقَالَ لهُ: «دَعْهَا»، وقَالَ لهَا: «أَبْلِي وأَخْلِقِي، أَبْلِيْ وأَخْلِقِي». وهُو دُعاءٌ مِنْهُ ﷺ بِطُولِ العُمُرِ، فإنَّ منْ طالَ عُمُرُهُ تُبلَى ثِيابُهُ. [البخاري].

---

إذَا لبِس المُسلمُ ثَوباً جَديداً يَقولُ هذَا الدُّعاءَ: «الحمدُ للهِ الذِي كَسَانِي مَا أُوَارِي بهِ عَوْرَتِي، وَأتجَمَّلُ بهِ فِي النَّاسِ» [الترمذي].

# پاڕانەوەی وەرگیراو

جلێکی ئاوریشمی زەردی قۆپچە داریان هێنا بۆ پێغەمبەرﷺ ئەویش هەڵیگرت و سەیری کرد، پاشان فەرموی بە وانەی دەورو بەری (کێ دەبینن شیاو بێت ئەم پۆشاکەی بدەینێ؟؟)بێدەنگ بوون و کەسیان قسەیان نەکرد. ئەنجا فەرموی:(دایکی خالدم)بۆ بهێنن، کەس و کارەکەی ڕۆشتن هێنایان و منداڵێکی بچوکیان لەگەڵ هێنا، کە لە خاکی حەبەشە منداڵێکی بوو بووکاتێک کۆچیان کرد لەگەڵ دایک و باوکی لە ترسی ئازاری بێباوەڕەکان. کاتێک پێغەمبەرﷺ بینی بە دەستی پیرۆزی خۆی پۆشاکەکەی پیادا بە گاڵتەوە پێی فەرموو: ئەی دایکی خالد ئەمە چاکەو جوانە. ئیتر مناڵەکە بوو بە هاودەمی پێغەمبەر ﷺ بە دەوری پێغەمبەردا دەهات و دەچوو دەستی دەخستە سەرشانی پێغەمبەر، باوکی سەر زەنشتی کرد، پێغەمبەر ﷺفەرموی: وازی لێبهێنە، وە فەرموی بە أُم خالد! تەمەنت درێژ بێت و جلەکانت بدڕێنی ئەمە پاڕانەوە بوو بۆ تەمەن درێژی، چونکە هەر کەس تەمەنی درێژ بێت جلەکانی دەدڕێنێ. (بخاری).

---

هەر کەس پۆشاکێکی پۆشی کە تازە بوو ئەم پاڕانەوە دەکات:سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پۆشتەی کردم کە عەورەتم داپۆشم، وە خۆمی پێبڕازێنمەوە لە ناو خەڵکیدا.(ترمذي).

# الخَاتَمُ المَفْقودُ

اشتَرَى النَّبيُّ ﷺ خاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، ثمَّ لَبَسَهُ في يَدِهِ، وَذلكَ قبل أنْ يُحرَّمَ لَبْسُ الذَّهبِ على الرِّجالِ.

فلَمَّا رأى الصَّحابةُ النَّبيَّ ﷺ لابِساً هذَا الخاتَمَ، اشتَرَى كُلُّ واحدٍ منْهُمْ خاتَماً من ذَهَبٍ ثُمَّ لَبِسهُ؛ اقتداءً بالنَّبيِّ ﷺ فلَمَّا حُرِّمَ الذَّهَبُ على الرِّجالِ، ورأى النَّبيُّ ﷺ أصحابَهُ وفي أيديهِمُ الخواتِمُ الذَّهبيَّةُ رَمَى بِخاتَمِه، ثُمَّ قَالَ: «لا أَلْبَسُهُ أبداً».

ثُمَّ اتَّخَذَ النَّبيُّ ﷺ خاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، فَاتَّخَذَ الصَّحابةُ خَوَاتِمَ مِنَ الفضَّةِ، أُسْوةً برسولِ الله ﷺ.

وعِندَمَا تُوُفِّيَ النَّبيُّ ﷺ لَبِسَ أبو بكرٍ رضي الله عنه خاتَمَ النَّبيِّ ﷺ، بِصِفَته خَليفةً لِرَسولِ الله ﷺ.

فلمَّا تُوفِّيَ أبو بكرٍ لَبِسَ الخاتَمَ عُمَرُ رضي الله عنه بِصِفَتِهِ أَميراً للمُؤمنينَ.

فلَمَّا تُوفِّي عُمَرُ لَبِس عثمانُ رضي الله عنه الخاتَمَ؛ حتَّى وقَعَ منْهُ في بئرٍ [البخاري].

---

يُستَحَبُّ أنْ نَدْعُوَ للمُسلمِ إذَا لَبِسَ ثَوباً جَديداً، ونَقولُ في دُعائنَا: «البس جَديداً، وعش حميداً، ومُتْ شَهيداً» [أحمد].

# مستیلەی ون بوو

پێغەمبەر ﷺ مستیلەیەکی لە ئاڵتون کڕی، پاشان کردیە دەستی، ئەمە پێش ئەوەی کە ئاڵتون لەسەر پیاوان حەرام بێت. کە هاوەڵان پێغەمبەریان بینی مستیلەی لە دەستدایە، هەر یەکێکیان مستیلەیەکی لە ئاڵتون کڕی و کردیە پەنجەی، وەک شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک ئاڵتون لەسەر پیاوان حەرام بوو، وە پێغەمبەریش ﷺ هاوەڵانی بینی هەر دانەیەکیان مستیلەیەکی ئاڵتونی لە دەستدایە ئیتر ئەوەی خۆی فڕێدا، فەرموی: ئیتر نایکەمە دەستم، پاشان مستیلەیەکی زیوی کڕی و هاوەڵانیش مستیلەی زیویان کڕی، چاویان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، کاتێک پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، ئەبو بەکر ﷺ کردیە دەستی بەو سیفەتەی خەلیفەو جێنشینی پێغەمبەرە ﷺ کاتێک ئەبو بەکر ﷺ وەفاتی کرد عومەر ﷺ کردیە دەستی بەو سیفەتەی ئەمیری ئیمانداران. کاتێک عومەر وەفاتی کرد عثمان ﷺ لە دەستی کرد ئیتر کەوتە بیرەوە. (البخاري).

---

سونەتە کە دوعا بۆ موسوڵمان بکەین کە جل و بەرگی تازەیان پۆشی، لە پاڕانەوەکانمان بڵێین: پۆشاکی تازە بپۆشی بە سوپاسگوزاری بژی بە شەهیدی بمری. (احمد).

# الهَدِيَّةُ المَرْدُودَةُ

كانَ عُمَرُ بنُ الخطَّابِ رضي الله عنه يمشِي فِي السُّوقِ، فرأى عندَ بائعِ المَلابسِ ثوباً جَميلاً أعجَبَهُ، فَاشتَرَاهُ كهَدِيَّـةٍ لِلنَّبيِّ ﷺ لِكَيْ يَلْبَسَهُ عندَ لقائه بالوُفودِ، أو فِي يَومِ الجُمُعَةِ.

فلَمَّا رآهُ النَّبيُّ ﷺ وعَلمَ أنَّهُ مِنَ الحَريرِ الذي حَرَّمَـهُ اللهُ على الرِّجالِ، قَالَ ﷺ: «إنَّما يَلْبَسُ هذهِ مَنْ لا خَلاَقَ لَـهُ». وأعطَى الثَّوب إلى عُمَرَ.

فَتعَجَّبَ عُمَرُ، وقَالَ: كيفَ آخُذُ الثَّـوبَ يَـا رَسـولَ اللهِ وقَدْ قُلتَ كذَا وكذَا؟

فَقــالَ الــنَّبيُّ ﷺ: «إنَّمــا بعَثْــتُ بــهِ إليــكَ لِتَبيعَـهُ أو تَكْسُوهَا».

فَذهَبَ عُمَرُ وأعطَى الثَّوبَ لأَخيهِ المُشرِكِ، تَنفيذاً لأمرِ النبيِّ ﷺ. [البخاري].

---

يُستَحَبُّ ارتـداءُ الثِّيـابِ البَيضـاءِ. قَـالَ ﷺ: «البَسُـوا مـن ثِيـابِكُمُ البَياض، فإنَّهَا أطهَرُ وأطيَبُ» [النسائي].

# دیاری وەرنەگیراو

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڕۆشت لە بازاردا لای فرۆشیارێک پۆشاکێکی جوانی بینی زۆر پێی جوان بوو، کڕی وەکو دیارییەک بەخشی بە پێغەمبەر ﷺ کە لەبەری بکات کاتێک کە میوانی دێت یان لە ڕۆژی جومعە لەبەریبکات، کە پێغەمبەر ﷺ بینی زانی کە ئاوریشمە و خوا حەرامی کردووە لەسەر پیاوان فەرموی: (ئەوانەی ئەمە دەپۆشن بەشی لە قیامەتدا نیە). وە ئەو پۆشاکەی دا بە عومەر، عومەر سەری سوڕما وتی(ئەمە چۆن ئەو جلە وەرگرم کە تۆ فەرموت کە ئاوریشم حەرامە لەسەر پیاوان)

پێغەمبەر ﷺ فەرموی:( بیگومان بۆیە ناردم بۆ لای تۆ تا یا بیفرۆشی یا بیپۆشی)عومەر ڕۆشت و پۆشاکەکەی دا بە برا بێباوەڕەکەی لەبەر جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.

---

سوننەتە پۆشاکێکی سپی بپۆشی؟ فەرموی جل و بەرگی سپی بپۆشن چونکە پاک و خاوێنەو چاکە. (النسائی).

# قِصَصُ آدابُ اللّبَاسِ

الملابس من النِّعَمِ التي مَنَحهَا اللهُ ـ تَعالَى ـ للإنسانِ؛ لِيَحْمِي جِسْمَهُ، وَلِيَستُرَ عورْتَهُ عنْ أعيُنِ النَّاسِ، يَقولُ تَعالَى: ﴿يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ﴾ [الأعراف: ٢٦].

والمُسلمُ لا يَنْسى وهو يَستُرُ عَورتَه أنْ يَتجَمَّلَ ويَتزَيَّنَ، خاصَّةً وهو ذاهِبٌ إلى لقاءِ رَبِّهِ في المسجدِ، قال تَعالى: ﴿۞ يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ [الأعراف: ٣١].

والمَلابِسُ تَكُونُ حَراماً إذَا كانَتْ للتَّفاخُرِ وَالتَّباهِي، وإذَا كانَتْ حَرِيراً للرِّجَالِ.

وتَكُونُ الملابسُ وَاجِبةً على المُسلِمِ؛ لِسَتْرِ العَوْرَةِ، وحمايَةِ الجسَدِ.

وَلِلملابسِ آدابٌ يَنبغِي على المُسلِمِ التَّحَلِّي بِهَا.

وهذَا الكتابُ قدَّمَ بعض هذه الآدابِ مِنْ خلالِ مَجموعةٍ مِن القصَصِ المُفِيدة وَالطَّرِيفَة.

* * * * *

# چیرۆکی ئادابی پۆشاك

پۆشاك یەكێك لەو بەخششە جوانانەیە كە خوا بەخشی بە مرۆڤەكان، تا لاشەیان بپارێزی، تا شەرمگاكانی بپارێزی لە چاوی خەڵكی، خوا دەفەرموێ:
﴿يَبَنِي ءَادَمَ قَد أنزَلنا عَلَيْكُم لِباساً يُواري سـوءَاتِكُم و ريشـاً و لِبـاسُ التَّقـواى ذَلكَ خَيرٌ﴾

موسوڵمان لە بیری نەچێ كە دەبێت خۆی پۆشتە بكات و تا خۆی جوان بكا.بە تایبەت كە دەڕۆن بۆ لای خوای خۆیان لە مزگەوتدا، خوا دەفەرموێت ﴿ئەی نەوەی ئادەم لە كاتی نوێژ و لە مزگەوتدا جوانی خۆتان دەربخەن و خۆتان برازێننەوە﴾

پۆشاك حەرامە ئەگەر بۆ خۆ بە گەورەگرتن ببێت و فەخری پێوە بكات، بە تایبەت ئاوریشم بۆ پیاوان قەدەغەیە، پۆشاك پێویستە لەسەر موسوڵمان بە ژن و پیاوەوە، وە جل و بەرگ چەند ئادابێكی هەبوو كە موسوڵمان پێویستە خۆی پێبڕازێنێتەوە. ئەم كتێبە چەند ئادابێكی پێشكەشكرد لە میانەی چەند چیرۆكێكی سود بەخش و ناسك.

# ئادابی
# گەشت و ڕێگاوبان

نوسنی: حسن سعودي

وەرگێڕانی: م. محمد حامد بانیشاری

# تَحيَّةُ العَودَةِ

كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي سفَرٍ مع بعضِ أصحابه، وكَانَ فِيهم جابرُ بنُ عبد الله. وفِي أثناء سفَرِهم، رأى النَّبِيُّ ﷺ الجَملَ الَّذي يَحملُ جابراً وأمتعتَهُ، فوَجَدَهُ ضَعيفاً لا يَقْوَى علَى السَّيرِ، فعَرَضَ النَّبيُّ ﷺ على جابرٍ أنْ يَبيعَ لَهُ الجَملَ. ففَرِحَ جابرٌ رضي الله عنه ووَافَقَ أنْ يَبيعَهُ للنَّبيِّ ﷺ، فاتَّفقَا علَى ثَمنه. ولكِنَّ النَّبيَّ ﷺ طلَبَ مِنْهُ أنْ يَنتظر حتَّى يَعُودَ إلَى المدينةِ فيُعْطِيَهُ ثَمَنَهُ، فوافَقَ جابرٌ

ولَمَّا عادَ النَّبيُّ وأصحابُهُ إلَى المدينةِ، نادَى ﷺ جابراً وعَلَّمَهُ أدباً مِنْ آداب الرُّجوعِ مِنَ السَّفَرِ، فقالَ لَهُ: (دَعْ جمَلَكَ، وادْخُلْ (أي: المسجِدَ) فصَلِّ ركعتَينِ).

فتَرَكَ جابرٌ رضي الله عنه الجَمَلَ ودخَلَ المَسجِدَ فصَلَّى ركعتَينِ، ثُمَّ خرَجَ، فأعطَاهُ النَّبيُّ ﷺ ثمنَ الجَمَلِ وأعطَاهُ الجَمَلَ أيضاً. [متفقٌ عليه].

---

كَانَ ﷺ إذَا قَدمَ مِنْ سفَرٍ دخَلَ المسجدَ أوَّلاً وصلَّى ركعتَينِ، وإذا دخَلَ قالَ: «تَوْباً تَوْباً لِربِّنا، أوْباً أوْباً (رُجوعاً) لا يُغادرُ علَيْنا حَوْباً (إثماً)» [ابن السني والحاكم].

# سڵاوی گەڕاننەوە

پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا بوو لەگەڵ هەندی لە هاوەڵانی، کە جابری کوڕی عبداللە یان تیا بوو، لە میانەی کەیاندا. پیغەمبەر ﷺ ئەو حوشترەی بینی کە جابرو کەل و پەلەکەی هەڵگرتبوو، سەیری کرد زۆر لاواز بوو نەیدەتوانی بڕوا، پێغەمبەر ﷺ پێشنیاری کرد بۆ جابر کەحوشترەکەی پی بفرۆشێت، جابر زۆر دڵخۆش بوو وە ڕازیی بوو کە بیفرۆشێت، ڕێکەوتن لەسەر نرخەکەی بەڵام پێغەمبەر ﷺ داوای کرد کە جابر چاوەڕوان بێت لەسەر پارەکە تا لەسەفەرەکە دەگەڕێنەوە ئەنجا بیداتی. جابر ڕازی بوو، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی گەڕانەوە بۆ مەدینە، جابری بانگ کرد و ئەدەبی گەڕاننەوە لە سەفەری فێر کرد فەرموی پێی: (واز لە حوشترەکەت بهێنەو بڕۆ مزگەوت دوو ڕکات نوێژ بکە. جابریش وازی لە حوشترەکەی هێناو چووە مزگەوت دوو ڕکات نوێژی کرد ئەنجا لە مزگەوت دەرچوو ئیتر پێغەمبەر ﷺ پارەکەی دایە و حوشترەکەشی دایەوە)) (بخاری ومسلم).

---

پێغەمبەر ﷺ کاتێک کە لەسەفەر دەگەڕایەوە سەرەتا دوو ڕکات نوێژی دەکرد، کە دەهاتەوەماڵەوە دەیفەرموو: (پەشیمانی دەردەبرم پەشیمانی دەردەبرم، بۆ لای خوا، دەگەڕێمەوە، دەگەڕێمەوە بە شێوەیەک کە گوناهم بەسەرەوە نە مابێت)(ئیبن سەنی و الحاکم).

# صَحَابِيٌّ وغُلامُهُ

ذات يومٍ، أرادَ أبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أنْ يَخرُجَ لِقَضاء بعض حَوَائجه، فنادَى غُلامَهُ، وطلَبَ منْهُ أنْ يُحضِرَ البَغلَةَ الَّتِي يَمتلِكُهَا.

أسرَعَ الغُلامُ وأحضَرَ البَغْلَةَ، ووَضَعَ عليهَا سَرْجَهَا، فركِبَ أبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه البَغْلَةَ، ثُمَّ طلَبَ مِنَ الغُلامِ أنْ يَرْكَبَ خَلْفَهُ، حتَّى يذهَبَا معاً لقَضاءِ هذِهِ الحاجَةِ، فركِبَ الغُلامُ خَلْفَ أبِي هُرَيْرَةَ.

وفِي أثناءِ الطَّرِيقِ، قابَلَ رجلٌ أَبَا هُرَيْرةَ رضي الله عنه ونظَرَ فوَجَدَ الغُلامَ يَركَبُ خلْفَهُ. فقالَ لَهُ: لو أنَّكَ أنزلتَ هَذَا الغُلامَ، وجَعَلْتَهُ يَمشِي خَلْفَ دابَّتِكَ، لكانَ ذَلِكَ أفْضَلُ.

فَقَالَ أبُو هُرَيْرة: لأَنْ يَسْعى معِي ضِغْثَانِ (حِزْمَتَانِ مِنْ حَطَبٍ) مِنْ نارٍ يَحرِقَانِ منِّي مَا أحرَقَا؛ أحَبُّ إلَيَّ مِنْ أنْ يَسْعَى غُلامِي خَلْفِي. [البداية والنهاية].

---

السَّفرُ فُرْصةٌ لِتَغييرِ الجوِّ، وتَعويدٌ للجِسمِ علَى تَحمُّلِ المَشَاقِّ والصِّعَابِ؛ قالَ النَّبِيُّ ﷺ: «سافِرُوا تَصُحُّوا، واغْزُوا تَسْتَغْنُوا» [مسلم].

# هاوەڵێك و خزمەتكارەكەی

ڕۆژێك ئەبو هورەیرە ﷺ ویستی لە ماڵ دەرچێت بۆ هەندێ پێداویستی خۆی، خزمەتكارەكەی بانگ كرد، داوای لێكرد كە هێسترەكەی بۆ ئامادە بكات، ئەویش پەلەی كردو هێسترەكەی بۆ ئامادە كرد، وە زینەكەی كردە سەر پشتی، ئەبو هورەیرە ﷺ سوار بوو، بە خزمەتكارەكەی وت: سەركەوە لە دواوە، تا بەیەكەوە بڕۆین بۆ جێبەجێكردنی پێویستیاتەكە خزمەتكارەكەش لە پاشكۆی ئەبو هورەیرەدا سوار بوو، لە میانەی ڕێگاكە، پیاوێك قسەی لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا كرد. سەیری كرد خزمەتكارەكەی لە دوای ئەبو هورەیرەوە سەركەوتووە، پێی وت: ئەگەر ئەو خزمەتكارەت دابەزاندایەو ئەو لە دوای ئەو وڵاخەوە بڕۆشتایە باشتر بوو،...ئەبو هورەیرەش وتی: ئەگەر لە دوامەوە دوو چڵۆسك بە دوامەوە بن بە ئاگرەوە بمسوتێنن ئەوەندەی كە بم سوتێنن باشترە لام لەوەی ئەو خزمەتكارەم بەپێ و بە دوای مندا بێت. (البدایه و النهایه)

---

سەفەر فرسەتێكە بۆ گۆڕینی ئاوو هەوا، وە ڕاهاتنی لاشەیە لەسەر هەڵگرتنی نارەحەتی، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:(سەفەر بكەن لەش ساغ دەبن، غەزا بكەن دەست كەوتان دەبێت) (مسلم).

# الصُّحْبَةُ

فِي يَومٍ منَ الأيَّامِ، ذهَبَ النَّبيُّ ﷺ إلى أبِي بكرٍ فِي وقتٍ كانَ لا يَذْهَبُ إلَيهِ فِيهِ. فلَمَّا رآهُ أبُو بكرٍ رضـي الله عنـه قـالَ: مـا جـاءَ رسولُ الله ﷺ فِي هذه السَّاعةِ إلاَّ لأَمرٍ قَدْ حدَثَ.

فَجَلَسَ النَّبِـيُّ ﷺ ولاَ يُوجَـدُ فِـي المكـانِ أحَـدٌ إلاَّ أسمـاءُ وعائشةُ ـ رضيَ اللهُ عنهما ـ فقَالَ النَّبيُّ ﷺ لأبِـي بكـرٍ: «أخْـرِجْ عَنِّي ما عِنْدَكَ». قالَ أبُو بكرٍ يا رسولَ الله! إنَّما هُمَا ابنَتـايَ، ومـا ذاكَ فِداكَ أبِي وأُمِّـي؟ فقـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: «إنَّ الله قَـدْ أذنَ لِـي فِـي الخُروجِ والهِجْرةِ». فقالَ أبُو بكرٍ الصُّـحْبَةُ يـا رسـولَ اللهِ؟ فقـالَ: «الصُّحْبَةُ».

فبكَى أبو بكرٍ مِـنَ الفَـرَحِ، ثُـمَّ قـالَ: يـا نَـبيَّ اللهِ! إنَّ هـاتَينِ راحِلتَينِ كنتُ أعدَدْتُهُمَا لِهذَا.

ثُمَّ استَأجَرَ عبدَ اللهِ بنَ أُرَيْقطَ لِيَدُلَّهُمَا عَلَـى الطَّرِيـقِ؛ وسَـعِدَ أبو بكرٍ بصُحْبَةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي هِجْرَتِهِ إلى المدينةِ. [ابن اسحاق].

---

المُسلِمُ يَطلُبُ التَّوفيقَ مِنَ اللهِ، ويَدْعُوهُ أنْ يُيَسِّـرَ لَـهُ طريـقَ الخـيرِ؛ قـالَ الغَزَالِيُّ: ويَنْبغِي أنْ يُصَلِّيَ المُسافِرُ قبلَ سَفَرِهِ صـلاةَ الاسـتِخارةِ. [إحيـاء علومِ الدين].

# هاوەڵایەتی

ڕۆژێک لە ڕۆژان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لای ئەبو بەکر لە کاتێکدا کە قەت لەو کاتەدا نەدەڕۆشت بۆ لای، کاتێک ئەبو بەکر پێغەمبەری ﷺ بینی، فەرموی هاتنی پێغەمبەر ﷺ لەم کاتەدا هیچ نەیهێناوە مەگەر گرنگی کارێک نەبێت کە ڕویداوە. پێغەمبەر ﷺ دانیشتوو کەس لەو شوێنەدا نەبوو جگە لە ئەسماء و عائیشە نەبێت، فەرموی: کێت لایە با بڕواتە دەرەوە، ئەبو بەکر فەرموی: ئەی پێغەمبەر ئەم دووانە کچەکانمن، کەسی ترمان لەگەڵدا نیە، دایک و باوکم بە فیدات بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خوا ڕوخسەتی داوم لە چوونە دەرەوەو کۆچ کردن. ئەبو بەکر رضي الله عنه فەرموی: هاوەڵت دەبم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ بە هاوەڵی تۆ، ئەبو بەکر لە خۆشیدا گریا، پاشان فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوو حوشترە حازرم کردووە بۆ ئەو سەفەرە، پاشان عبدالله کوڕی ئورەیقطی بەکرێ گرت تا ڕێگایان پیشان بدات، ئەبو بەکر زۆر بەختەوەر بوو بە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ لە هیجرەتدا بۆ مەدینە، (ابن ئیسحاق)

---

موسوڵمان داوای یارمەتی لە خوا دەکات، وە لە خوا دەپاڕێتەوە کە ڕێگەی چاکەی بۆ ئاسان بکات، پێشەوا غەزالی فەرموی: پێویستە گەشتیار نوێژ بکات پێش سەفەرەکەی نوێژی ئیستیخارە. (احیاء علوم الدین).

# الغُصْنُ

فِي يومٍ من الأيَّامِ، خرج رجلٌ لِقَضاء بعضِ حَوَائجِـهِ، وبينمـا كـانَ يَمشِـي وَجَـدَ غُصـنَ شَـوكٍ مُلْقًـى فِـي وَسَـطِ الطَّرِيقِ، يُؤْذِي منْ يَمُرُّ بِهِ مِن النَّاسِ.

فَقـرَّرَ هـذَا الرَّجُـلُ أنْ يُزِيـلَ هـذَا الغُصْـنَ مِـنْ وسَـطِ الطَّرِيقِ، ويحفَظَ النَّاسَ مِـنْ أذَاهُ، فَتَوجَّـهَ ناحيـةَ الغُصْـنِ، وأمْسَكَ بِهِ، ثُمَّ وضَعَهُ فِي جانبِ الطَّرِيقِ بَعيـداً عَـنْ مكـانِ مُرُورِ النَّاسِ.

وبِهـذَا العمَـلِ الجميـلِ، حَفَـظَ النَّـاسَ مِـنْ ضَـرَرِ هـذَا الغُصْنِ، فكانَ جَزَاؤُهُ أنْ شكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ، وأدْخَلَهُ الجنَّةَ.

وقدْ حكَى النَّبِيُّ ﷺ هذه القصَّةَ لأَصحابِهِ، فقـالَ ﷺ: «بينمَا رجلٌ يَمشِي بطريقٍ، وجَدَ غُصْنَ شَوكٍ علَـى الطَّريـقِ فأَخذَهُ، فشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغفَرَ لَهُ» [متفقٌ عليه].

---

قَالَ ﷺ: «الإيمانُ بِضْعٌ وسبعونَ ـ أو بِضْعٌ وستُّونَ ـ شُعْبَةً، أفضَلُهَا قولُ لا إِلهَ إلاَّ اللهُ، وأدْنَاهَا إماطَةُ الأذَى عَنِ الطَّرِيقِ» [متفقٌ عليهِ].

# چڵێك دڕك

ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوێـك ڕۆشـتە دەرەوە بـۆ بـەجیهێنانی هەنـدێ پێویسـتیاتی خۆی، لە کاتێکدا دەڕۆشت پەلە دڕکاویەکی بەدی کرد کە لە ناوەڕاسـتی ڕێگاکـە کەوتبوو، ئەزیەتی ئەو کەسانەی دەدا کە دەڕۆشـتن لـەو ڕێگـاوە، بڕیاریـدا ئـەو پیاوە کە ئەو پەلە دڕکاویە لە ناوەڕاسـتی ڕێگاکـە لاببـات، خـەڵکی بپارێزێـت لـە ئەزیەتی ئەو دڕکە، بەرەو ڕوی دڕکەکـە ڕۆشـت و گرتـی و پاشـان لـە قـەراغی ڕێگاکەوە لە دوورەوە داینا. بەم کردەوە جوانە خـەڵکی پاراسـت لەئەزیـەتی ئـەو پەلە دڕکاویە، پاداشتەکەی ئەوە بوو خوا سوپاسی کردو لێی خۆش بوو وە خستیە بەهەشت، پێغەمبـەر ﷺ ئـەم چـیرۆکەی گێڕایـەوە بـۆ هاوەڵـەکانی فـەرموی: پیاوێك دەڕۆشت بە ڕێگادا، پەلە دڕکاویەك لە ڕێگاکەدا بـوو هـەڵیگرت لەسـەر ڕێگەکە لایبرد خوا سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو.(بخاري ومسلم).

---

پێغەمبـەرﷺدەفـەرموێت:ئیمـان حـەفتاو ئەوەنـدە بەشـە یـان شەسـت و ئەوەندە بەشە، بـەرزترین پلـە وتنـی (لاالـە الا اللـە) نـزمترین پلـە نارەحـەتی لابردنە لەسەر ڕێگا.(متفق علیە).

# المُسافِرُ والكَلبُ

فِي يَومٍ مِن الأيَّامِ، خرج رجلٌ فِي سفرٍ، وكانَ الحَرُّ شَديداً. وفِي أثناءِ الطَّريقِ، اشتَدَّ بِهِ العَطَشُ، فأخَذَ يَبحَثُ عَنْ ماءٍ يَرْوِي بِهِ ظَمَأَهُ. وبَعْدَ بَحثٍ طَويلٍ، عَثَرَ علَى بِئرٍ. فنَزَلَ فيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خرَجَ وقَد ارْتَوَى.

وفَجأةً.. رأى الرَّجلُ أمامَهُ كَلباً يَلْهَثُ، وقد اشتَدَّ بِه العَطَشُ، حتَّى إنَّهُ كَانَ يأكُلُ الرِّمال مِنْ شدَّة عطَشه، وهوَ يَظُنُّ أنَّهُ سوفَ يَعثُرُ فِي هذهِ الرِّمالِ علَى ماءٍ يُروِي ظَمَأهُ. فنَظَرَ الرَّجلُ إليه فِي شَفَقَةٍ وقالَ: لقَدْ بَلَغَ هذَا الكَلبُ مِنَ العَطشِ مِثلَ الَّذي بَلَغَ مِنِّي.

فأخَذَ يُفكِّرُ فِي حِيلةٍ يَسْقِي بِهَا هذَا الكَلبَ، ثُمَّ نَزلَ البِئرَ فمَلأَ حِذَاءَهُ ماءً، وأمْسَكَهُ بِفَمِهِ، ثُمَّ خرَجَ، فسقَى الكَلبَ.

فكَانَ جَزاءُ ذلِكَ الرَّجُلِ أنْ شَكَرَ الله لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ. [البخاري].

---

كَانَ ﷺ يَقتَصرُ فِي السَّفرِ علَى صلاةِ الفَرضِ، وكَانَ يَحرُصُ علَى صلاة الوِترِ وسُنَّة الفَجرِ مِنَ النَّوافِلِ، فَإنَّهُ لَمْ يدَعْهُمَا، سَواءٌ كانَ مُقيماً أو مُسافِراً. [متفقٌ عليهِ].

# گەشتیارو سەگ

ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوێک لە مال دەرچوو بۆ سەفەر، دنیا زۆر گەرم بوو لە ناوەڕاستی ڕێگادا، تینوێتیەکی زۆر، زۆری بۆ هێنا. گەرا بە دوای ئاودا کە تینوێتی خۆی پێبشکێنی، لە دوای گەڕانێکی زۆر بیرێکی دۆزیەوە، دابەزی بۆ ناو بیرەکەو ئاوی خواردەوە هاتە دەرەوەو تێر ئاو بوو، کوتوپڕ ئەم پیاوە سەگێکی بینی هەناسە برکێی پێ کەوتبوو، تینوێتی زۆری بۆ هێنابوو، هەتا لە تینویا خۆڵی دەخوارد کە گومانی وابوو لە ناو ئەو خۆڵەدا ئاوی دەست دەکەوێ، پیاوەکە سەیری کردو بەزەیی پیادا هاتەوە، وتی: ئەو سەگە زۆر تینویەتی وەکو من زۆر تینو بووم. بیری کردەوە کە کارێک بکات و سەگەکە تێر ئاو بکات، دا بەزیە ناو بیرەکەوە پڕ پێلاوەکەی ئاوی دەرهینا، بە دەم گرتبوی و هاتە دەرەوە بەم شێوە تا سەگەکەی تێر ئاو کرد، پاداشتی ئەو پیاوە ئەوە بوو خوای گەورە لێی خۆش بوو. (بخاری).

---

پێغەمبەر ﷺ لە سەفەردا بەس نوێژی فەرزی دەکرد، بەلأم زۆر سور بوو لەسەر کردنی نوێژی وەترو سوننەتی پێش نوێژی بەیانی، قەت وازی لێ نەدەهێنا، دانیشتوبێت یان لە سەفەردا)(بخاری مسلم).

# حَقُّ الطَّرِيقِ

اعتادَ بعضُ الصَّحابة أنْ يجلسُوا فِي جوانِبِ الطُّرُقِ، وأنْ يَقْضُوا فِيها بعضَ أوقاتِهِم يَتَسامَرُونَ ويَتَحدَّثُونَ. وفِي يومٍ مِنَ الأيَّامِ، كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مع بعضِ أصحابِهِ، فقالَ لهم ـ مُعلِّماً ومُؤدِّباً ـ «إيَّاكُم والجُلوسُ فِي الطُّرُقاتِ».

فقالَ بعضُ الصَّحابةِ. ما مِنْ مَجَالِسِنَا بُدٌّ، إنَّا نَتَحدَّثُ فِيها يا رسولَ الله.

فلَمَّا عَلِمَ النَّبيُّ ﷺ أنَّهم يَجلسونَ فِي الطُّرُقاتِ لِضَرورةٍ، بَيَّنَ لَهُمْ آدابَ الجُلوسِ في الطُّرُقات، فقالَ: «فإذَا أبَيْتُم إلاَّ المَجالِسَ (فِي الطَّرِيقِ) فَأعْطُوا الطَّريقَ حَقَّهَا».

فقالَ الصَّحابةُ: ومَا حَقُّ الطَّرِيقِ يا رسولَ الله؟

فقالَ النَّبِيُّ ﷺ مُوْضِحاً بعضَ آدابِ الطَّرِيقِ: «غَضُّ البَصرِ، وكَفُّ الأذَى، ورَدُّ السَّلامِ، والأمرُ بالمعروفِ، والنَّهْيُ عنِ المُنكَرِ» [متفقٌ عليه].

---

قالَ الغَزَاليُّ: لا تَجلسْ علَى الطَّريقِ، فإنْ جلَسْتَ فأدَبُهُ: غَضُّ البَصرِ، ونُصْرَةُ المَظلومِ، وإغاثةُ المَلْهُوفِ، وعَوْنُ الضَّعيفِ، وإرشادُ الضَّالِّ، ورَدُّ السَّلام. [الإحياء].

# مافی ڕێگا

هەندی لە هاوەڵان ڕا هاتبون کە دادەنیشتن لەسەر ڕێگاو کەناری ڕێگا، هەندێ کاتیان بەسەردەبردو گفتوگۆیان دەکرد. ڕۆژێک لە ڕۆژان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا بوو وەک مامۆستایەکی دڵسۆز، فەرموی: داواتان لێدەکەم دامەنیشن لەسەر ڕێگا، هەندێ لە هاوەڵان وتیان: کە ناچارین دابنیشین، و قسەی تیا دەکەین، کاتێک پێغەمبەر ﷺ زانی کە ئەوان لەبەر ناچاری دادەنیشن، ئادابی دانیشتن لەسەر ڕێگای پێوتن، فەرموی: کە هەر دەبێت دابنیشن لەسەر ڕێگا ئەوا حەقی ڕێگا بدەن. هاوەڵان فەرمویان: مافی ڕێگا کامەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەر فەرموی: چاو دابخەن، نارەحەتی لاببەن و ئازاری خەڵک مەدەن، جوابی سڵاوبدەنەوە، فەرمان بە چاکە بکەن. نەهی لە خراپە بکەن، (بخاری ومسلم).

---

غە زالی دەفەرموێت: دامەنیشن لەسەر ڕێگا ئەگەر دانیشتن، ئادابی ڕێگابزانن کە ئەمانەن: چاو داخستنە. یارمەتی ستەملێکراو. فریای لێقەوماو، یارمەتی لاواز، ڕێنمایی ڕێ لی ونبوو. وەلآمی سڵاو. (الاحیاء).

# الفَرْعَانِ

فِي يَومٍ مِنَ الأَيَّامِ، خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ مُسافِراً، وكانَ فِي صُحبَتِهِ رَجلٌ مِنْ أصحابِهِ، ومَضَيَا فِي طَرِيقِهِمَا، كُلٌّ مِنْهُمَا رَاكِباً دَابَّتَهُ.

وفِي أثناء الطَّرِيقِ، مَرَّ النَّبيُّ ﷺ بمكانٍ بهِ بعضُ الأشجارِ، فدَخَلَ النَّبيُّ ﷺ بينَ هذهِ الأشجارِ، ثُمَّ خَرَجَ بعدَ فَترةٍ وهُوَ يَحمِلُ فَرْعَينِ، أحَدُهُمَا مُستَقِيمٌ، والآخَرُ معْوَجٌّ، فأعْطَى صاحبَهُ الفَرْعَ المُستَقيمَ، وأخَذَ لِنَفسِهِ الفَرْعَ الآخَرَ، فقَالَ لَهُ الصَّحَابِيُّ: كُنتَ ـ يا رَسولَ الله ـ أحَقَّ بِهذَا (أي: بالفَرْعِ المُستَقيمِ).

فأخبَرَهُ النَّبيُّ ﷺ أنَّ الصَّاحِبَ لا بُدَّ أنْ يكُونَ فِي قَضاءِ حَوائِجِ صاحِبِهِ، فقالَ لَهُ ﷺ: «كَلاَّ يا فُلانُ، إنَّ كُلَّ صاحِبٍ يَصْحَبُ آخَرَ فإنَّهُ مَسْؤُولٌ عَنْ صاحِبِهِ، ولَو ساعةً مِنْ نَهارٍ» [الطبري].

---

قَالَ رَبِيعةُ بنُ أبِي عبدِ الرَّحمنِ مُروءَةُ السَّفرِ بِبَذْلِ الزَّادِ، وقِلَّةِ الخِلافِ معَ الأصْحَابِ، وكَثْرةِ المُزَاحِ فِي غَيرِ مَسَاخِطِ الله. [تفسيرُ القرطُبي].

# دوو پەل

ڕۆژێک لە ڕۆژان پێغەمبەر ﷺ بەسەفەر دەرچوو. کابرایەکی ئەنصاری بوو بە هاوەڵی ڕێگای، بە ڕێگەی خۆیانا دەڕۆشتن، هەرکەس بە سواری وڵاخی خۆی، لە میانەی ڕێگا پێغەمبەر ﷺ بە شوێنێکا ڕۆشت هەندێ داری تیا بوو، ڕۆشتە ناو دارەکان، دوای ماوەیەک دەرچوو دوو لقی لە دارەکان هێنا، یەکێکیان ڕاست بوو، یەکێکیان لار، ڕاستەکەیانی دایە هاوەڵەکەی، خۆی ئەوی تریانی هەڵگرت، هاوەڵەکەی وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ شایانتری بەم پەلە ڕاستەیان، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دایەو فەرموی:دەبێت هاوەڵ لە ئامادە باشی و جێبەجێکردنی پێویستیاتی هاوەڵەکەیدا بێت! ئەنجا فەرموی: وانی یە فلانە کەس؟ هەموو هاوەڵێ کە هاوەڵی یەکێکی تر دەکات ئەوە بەرپرسە لە هاوەڵەکەی، ئەگەر هاوەڵیەتیەکەیان سەعاتە ڕۆژێکیش بێت. (الطبرانی)

---

ڕەبیعەی کوڕی ئەبی عبدالرحمن، دەفەرموێت: کەسایەتی مرۆڤ لە سەفەردا بەوە دەبێت کە لە توێشوی خۆی ببەخشێت، وە کەمترین جیاوازی لەگەڵ هاوەڵاندا، وە زۆر گاڵتە بکات لەگەڵ هاوەڵانیدا، وە گاڵتەی لە شتانێکدا بێت کە نابنە مایەی تووڕە بونی پەروەردگار. (تەفسیری قرطبی).

# الوَصِيَّةُ

رَأى النَّبيُّ ﷺ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ ذاتَ يومٍ، فقالَ لَهُ: «أتُحبُّ يا جُبَيْرُ إذَا خرجْتَ فِي سفرٍ أنْ تكُونَ مِنْ أمثَلِ (أفْضَلِ) أصْحَابِكَ هَيْئَةً وأكثَرِهِمْ زاداً؟». فَقَالَ جُبَيرٌ: نَعَم، بِأبِي أنْتَ وأُمِّي. فقالَ رسولُ الله ﷺ: «فاقرأْ هذهِ السُّورَ الخَمْسَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، و﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴾، و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾، و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، وافتَتِحْ كُلَّ سُورةٍ ببِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ».

وتَمْضِي الأيَّامُ والشُّهورُ، ويُسافِرُ جُبَيرٌ مرَّاتٍ كثيرةً، فيَقُولُ بعدَ أنْ قامَ بِهَذهِ الرِّحْلاتِ: كنتُ قَليلَ المالِ، فكُنتُ أخرُجُ فِي سَفَرٍ فأكُون أقبحَهُمْ هيْئةً، وأقَلَّهُمْ زاداً، فمَا زِلْتُ مُنْذُ علَّمَنيهِنَّ رسولُ الله ﷺ وقرَأتُ بِهِنَّ؛ أكُونُ مِنْ أحسَنِهِم هَيْئةً، وأكْثَرِهِمْ زَاداً حتَّى أرجعَ مِنْ سَفَرِنَا. [أبو يَعْلَى].

---

كانَ النَّبيُّ ﷺ إذَا سافَرَ خَرَجَ مِنْ أوَّلِ النَّهارِ، وكَانَ يَستَحبُّ الخُروجَ يومَ الخميسِ.. ودَعَا اللهَ أنْ يُبارِكَ لأُمَّته فِي بُكُورِهَا. [البخاريّ].

# ئامۆژگاریەك

پێغەمبەر ﷺ جوبەیری کوڕی مطعەمی بینی، پێی فەرموو! ئایا پێت خۆشە ئەی جوبەیر ئەگەر دەرچوی بۆ سەفەر کە لە باشترین هاوەڵەکانت بیت لە ڕوی شێوازەوە، وە لە هەمویان زیاتر توێشوت پێبێت؟؟ جوبەیر وتی: بەڵێ باوك و دایکم بە قوربانت بێت! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەم پێنج سورەتە بخوێنە: ﴿الکافرون، النصر، الاخلاص، الفلق، الناس﴾ هەموو سورەتێك بە(بسم اللهِ الرحمن الرحیم) دەست پێبکە، چەند ڕۆژو مانگ تێپەڕی، جوبەیر چەند جارێك بە سەفەر رۆشت دوای ئەو هەموو گەشت و گەڕانە، وتی: من کەم ماڵ بووم کە دەرۆشتم بۆ سەفەر وە شێوازم لە هەموویان ناشیرین تر بوو، لە هەموویان توێشوم کەمتر بوو، بەڵام لەو کاتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەم سورەتانەی فێر کردووم وە دەیان خوێنم من لە هەمویان شێوازم جوانترەو وە لە هەمویان توێشوم زیاترە تا لەسەفەر دەگەڕێینەوە. (ئەبو یعلی).

---

پێغەمبەر ﷺ کاتێك سەفەری بکردایە ئەوا لە سەرەتای ڕۆژەوە دەردەچوو، وە پێی خۆش بوو لە ڕۆژی پێنج شەممەدا دەرچووایە، وە لە خوا دەپاڕایەوە کە بەرەکەت بخاتە بەیانیانەوە بۆ ئومەتەکەی.(البخاری).

# كَلِمَةُ الوَدَاعِ

استَعدَّ التَّابعِيُّ مُوسى بنُ وِرْدَان ـ رحِمهُ اللهُ تعالَى ـ لِلسَّفَرِ في إحْدَى رِحْلاته، فجَهَّزَ راحِلَتَه ووَضَعَ عليهَا ما يَحتاجُ إليه في طَرِيقِه. وقبلَ أنْ يُسافِرَ تَوَجَّهَ إلَى أبِي هُرَيْرة رضي الله عنه لِيُسلِّمَ علَيهِ ويُودِّعَهُ، فلَمَّا دخَلَ علَى أبِي هُرَيْرةَ رحَّبَ بِهِ، وقابَلَهُ مُقابَلَةً حسَنَةً، فأخْبَرَهُ مُوسى بنُ وِرْدَان أنَّهُ سوفَ يَخرُجُ مُسافِراً، وأنَّهُ قدْ جاءَ لِيُسلِّمَ علَيهِ ويُوَدِّعَهُ. فقالَ أبُو هُرَيْرةَ: ألاَ أُعَلِّمُكَ ـ يابْنَ أخِي ـ شيئاً عَلَّمَنِيهِ رسولُ اللهِ ﷺ؟

فقالَ مُوسى: بلَى.

فقالَ أبُو هُرَيْرةَ رضي الله عنه: قُلْ: «أستَوْدِعُكَ اللهَ الَّذِي لا تَضِيعُ وَدَائِعُه».

فَسُرَّ موسَى بنُ وِرْدَان بِنَصيحةِ أبِي هُرَيْرةَ، وعَمِلَ بحديثِ رسولِ اللهِ ﷺ. [النسائي وابن ماجه].

---

قالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «لا تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاَّ إلَى ثلاثة مَساجدَ: مَسجدِي هذَا، والمَسجِد الحرَام، والمَسجِد الأقصَى» [متفقٌ عليه].

# وتەی خوا حافیزی

موسای کوڕی ویردان ﵁ پیاوێکە لە (تابعین)خۆی ئامادە کرد بۆ سەفەر لە یەکێک لە سەفەرەکانیدا، ولاخەکەی حازر کردو ئەو شتانەی کە بۆ ڕێگا پێویستی بوو خستیە سەر پشتی ولاخەکە، وە پێش ئەوەی سەفەر بکات ڕوی کردە ئەبو هورەیرە﵁ سلاوی لێبکات و خواحافیزی لێبکات، کە ڕۆشت بۆ لای ئەبو هورەیرە﵁ زۆر دڵی پێی خۆش بوو.وە پێشوازیەکی جوانی لێکرد، موسای کوڕی ویردان پێی وت: دەمەوێت سەفەر بکەم، وە بۆیە هاتووم کە سلاوت لێبکەم و خوا حافیزیت لێبکەم، ئەبو هورەیرە﵁ وتی:شتێکت فێر بکەم کە پێغەمبەر ﷺ منی فێر کردووە؟ موسا وتی: بەڵێ ئەبو هورەیرە ﵁ وتی: بڵێ: (أستودعك الله الذي لا تضيع ودائعه) دەت سپێرم بەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات، موسا زۆر دڵخۆش بوو بە ئامۆژگاریەکەی ئەبو هورەیرە، وە بەردەوام بەم فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کاری کرد. (نسائی و ابن ماجه).

---

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (سەفەر ناکرێت بە مەبەستی عیبادەت مەگەر بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێت، ئەم مزگەوتەی من، بەیت الحرام و، مزگەوتی الاقصی) (بخاری ومسلم).

# المُسافِرُ الصَّائِمُ

خَرَجَ المُسلمونَ معَ النَّبي ﷺ في سَفَرٍ، وكَانَ الحرُّ شَدِيداً، والرِّمالُ ساخنةٌ، وكأنَّها الجَمْرُ.

وفِي أثناءِ الطَّريقِ، توقَّفَتِ القافِلةُ لِيَستريحَ أفرادُها، ويَختَبِئُوا مِنْ أشعَّةِ الشَّمسِ الحَارِقَةِ.

وكانَ النَّبيُّ ﷺ يسيرُ بينَ صحَابَتِه لِيَطمَئِنَّ علَى مَنْ مَعَهُ، ويَتَفَقَّدَ أحوالَهُم، فرأى رَجلاً قدْ رَقَدَ تحتَ ظِلِّ شَجَرةٍ. فظَنَّ النَّبيُّ ﷺ أنَّهُ مَريضٌ لمَا رَأى مِنْ حالِهِ، فسَألَ مَنْ حولَهُ: «ما لصَاحِبِكُمْ؟» (أيُّ وجَعٍ بِهِ؟).

فقالُوا: ليس بِهِ وَجَعٌ، ولكِنَّهُ صائِمٌ، وقَدِ اشتَدَّ علَيهِ الحَرُّ. [الطبراني].

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «ليس مِنَ البِرِّ الصَّومُ فِي السَّفَرِ» [البخارِي].

---

نَهى النَّبي ﷺ أنْ يُسافِرَ الرَّجلُ وحْدَهُ، وأخبَرَ أنَّ الرَّاكبَ شَيْطانٌ، والرَّاكِبَينِ شَيْطانانِ، والثَّلاثَ ركْبٌ (أي: جمَاعةٌ). [البخارِي وأبُو داود].

# موسافیری ڕۆژوەوان

موسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوون بۆ سەفەر. گەرما زۆر بوو، لمی بیابان زۆر گەرم بوو، وەکو پشکۆی لێهاتبوو، لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا، کاروانەکە وەستا بۆ ئەوەی پشوو بدەن، خۆیان دەشاردەوە لە تیشکی گەرمی خۆر، وە پێغەمبەریش ﷺ بەناو هاوەڵەکانیدا دەڕۆشت تا دڵنیا بێت لە وانەی لەگەڵیدا بوون، بینی پیاوێک خەوتووە لە ژێر سێبەری درەختێک، پێغەمبەر ﷺ وای زانی نەخۆشە کە سەیری کرد وا تێکەشت، لە دەوروبەری پرسی: هاوەڵەکەتان چ نەخۆشیەکی هەیە؟ وتیان: ئازاری نیە و نەخۆش نیە، بەڵام بە ڕۆژووە، گەرما زۆری بۆ هێناوە. (الطبرانی گێڕاویەتەوە).

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: چاک نیە ڕۆژوو لە سەفەردا. (بخاری).

---

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە، کە پیاو بە تەنها سەفەر بکات، وە هەواڵی داوە کە یەک سوار شەیتانە، دوو سوار دوو شەیتانە، وە سێ سوار کۆمەڵە-جماعەیە واتە: یەک کەس و دوو کەس شەیتان زوتر زەفەریان پێ دەبات (بخاری وابو داود).

# الأَميرُ

خرجَ أبو عَلِيٍّ الرِّبَاطِيِّ فـي سَـفَرٍ مـعَ عبـدِ الله المـرْوَزيِّ ـ أحَدِ عُلَماء الحديثِ فِي عَصْرِه ـ ، فقالَ أبو علـيٍّ لِعَبـدِ الله: أنتَ الأَميرُ. فوافَقَ عبدُ الله، وكانَ هُوَ القائدُ فِي السَّـفرِ. فكـانَ عبدُ الله فِي أثناءِ السَّفرِ يَحمِلُ علَى ظَهْرِهِ الطَّعامَ والأَمتِعَةَ لِنَفْسِهِ ولأبي عليٍّ.

وذاتَ ليلةٍ.. أمطَرَتِ السَّماءُ مطَراً شَـدِيداً، فقـامَ عبـدُ الله وأمسَكَ ثوباً مِنْ ثيابِهِ، وظَلَّلَ بِهِ رأسَ أَبي عَلِيٍّ حتَّى لا يَسْـقُطَ المَطرُ عليهِ، واستَمرَّ طَوَالَ اللَّيلِ علَى هَذه الحالِ.

وكُلَّمَا أرادَ أبو عليٍّ أنْ يَمْنَعَهُ كانَ عبدُ الله يَقُول لَهُ: أَلَمْ تَقُلْ إنَّنِي الأَميرُ؟ فلاَ تُراجِعْنِي فِيما أفعَلُ، ولا تَرجعْ عَنْ قَولِكَ.

وظَلَّ عبدُ الله يَخدُمُ أبا عَلِيٍّ طَوَالَ سَفَرِهِمَا، ولاَ يَقْبَلُ أَنْ يَخدمَهُ أبو عليٍّ، حتَّى قالَ أبو عليٍّ: وَدِدْتُ أَنِّي مِتُّ ولَمْ أقُلْ لَهُ أنْتَ الأَميرُ

---

قالَ رسولُ الله ﷺ: «إذَا كُنتُم فِي السَّفَرِ فأمِّرُوا أحَدَكُم» [الطبراني]. وذلِكَ حتَّى يتفرَّغُوا لمُواجَهةِ متَاعبِ السَّفرِ، بدَلاً مِنْ أنْ يختَلِفُوا فِيمَا بينَهم.

# سەرکردە

ئەبو عەلی ریباتی ڕۆشت لە سەفەرێکدا لەگەل عبد الله مەروزی کە یەکێکە لە زانایانی فەرمودە لە چەرخی خۆیدا —ئەبو عەلی وتی: تۆ ئەمیر بە (عبداللە) وتی: باشە ئیتر لە سەفەردا پێشەنگ بوو، عبداللە لە میانەی سەفەرەکەیدا خواردن و شتەکانی خۆی و ئەبو عەلی دابوو بە کۆڵیدا، وە شەوێکیان بارانێکی زۆر باری، عبداللە هەستاو جل و بەرگێکی خۆی کرد بە چەتر بەسەرسەری ئەبو عەلی یەوە تا باران لێی نەدا بە درێژایی شەو ئاوەها بوو.هەر کاتێک ئەبو عەلی بیویستایە کە قەدەغەی بکات لەو حاڵەتە، (عبداللە) پێی دەوت:ئەی تۆ نەت وت تۆ ئەمیری؟ مەم گێڕەوە لەوەی دەیکەم، وە لە قسەی خۆت پەشیمان مەبەرەوە (کە وتت تۆ ئەمیری) بەردەوام عبداللە خزمەتی ئەبو علی کرد بە درێژایی سەفەرەکەیان، بەڵام قبوڵی نەدەکرد ئەبو علی خزمەتی ئەو بکات، تا کار گەشتە ئەوەی ئەبو علی وتی: پێم خۆش بوو بمردمایە نەک بە تۆم بوتایە تۆ ئەمیری.

---

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر ڕۆشتنە سەفەر ئەوا با یەکێکتان ئەمیر بێت، (طبرانی). تا یەکلایی ببنەوە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی نارەحەتیەکانی سەفەر، لە جیاتی ئەوەی کێشە بکەوێتە نێوانتانەوە.

# حَفِظَكَ اللهُ

كانَ الرَّسولُ ﷺ يسيرُ مع أصحابِهِ في سَفَرٍ، وبَيْنَمَا هُمْ يسِيرُونَ باللَّيلِ أصابَهُمُ التَّعَبُ والإجهادُ، حتَّى إنَّ الرَّسولَ ﷺ كانَ يَنامُ عَلَى ظَهرِ رَاحِلَتِهِ، وأبو قَتَادَةَ رضي الله عنه يُلاقِيْهِ بيَدِه حتَّى لا يَقَعَ مِنْ فَوقِهَا، فشَعَرَ النَّبِيُّ ﷺ فاستَيْقَظَ، ثُمَّ غلَبَهُ النُّعَاسُ مَرَّةً ثانيةً فأسنَدَهُ أبُو قَتادةَ، فشَعَرَ النَّبِيُّ ﷺ فاستَيْقَظَ، ثُمَّ قالَ لأبِي قَتَادةَ رضي الله عنه: «حَفِظَكَ اللهُ كمَا حفِظْتَنَا مُنْذُ اللَّيلةَ». ثُمَّ أمَرَهُ ومَنْ معَهُ أنْ يَستَرِيحُوا فِي المكانِ الَّذي هُمْ فِيهِ بعضَ الوَقتِ؛ فعَدَلُوا عنِ الطَّريقِ، وأناخَ كُلٌّ منْهم ناقَتَه ثُمَّ نامَ.

وفجأةً.. استَيقَظَ القَومُ وقَدْ أشرَقَتِ الشَّمسُ. فقالَ أبو قَتَادةَ لرَسولِ الله ﷺ: يا رسولَ الله! هلَكْنَا.. فاتَتْنا الصَّلاةُ. فقالَ رسولُ الله ﷺ: «لَمْ تَهلَكُوا، ولَمْ تَفُتْكُمُ الصَّلاةُ، إنَّما تَفُوتُ اليَقْظانَ، ولاَ تَفُوتُ النَّائِمَ» [أحمد].

---

المُسلمةُ تُسافِرُ فِي صُحْبَةِ مَحْرَمٍ؛ صِيانةً وأماناً لَهَا، قالَ ﷺ: «لاَ يَحِلُّ لامرأةٍ تُؤمِنُ بالله واليومِ الآخرِ أنْ تُسافِرَ مَسِيْرةَ يَومٍ ولَيلةٍ ليسَ معها محْرَمٌ» [البخاري].

# خوا بتپارێزێ

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا لە سەفەرێکا بە شەو دەڕۆشتن. ماندو بوون زۆری بۆ هێنان، تا پێغەمبەر ﷺ لە سەر پشتی وڵاخەکەی خەوت، و ئەبو قەتادە رضي الله عنه دەستی بە پێغەمبەرەوە گرت تا لەسەر پشتی وڵاخەکە نەکەوێت، پێغەمبەر ﷺ هەستی کردو بەخەبەر هات، دیسان خەو زۆری بۆ هێنا، ئەبو قەتادە گرتیەوە تا نەکەوێت، پێغەمبەر ﷺ بە خەبەر هات و فەرموی بە ئەبو قەتادە: رضي الله عنه(خوا بتپارێزێت وەکو چۆن ئێمەت پاراست لە ئێوارەوە)پاشان فەرمانی دا خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کە پشوو بدەن لەو شوێنەدا بۆ ماوەیەک، لایاندا لە ڕێگاکە، هەموویان حوشترەکانیان (یخ)داو پاشان خەوتن، کاتێک بە خەبەر هاتن و خۆر هەڵهاتبوو، ئەبو قەتادە وتی: بە پێغەمبەر ﷺتیاچوین نوێژەکەمان فەوتا، پێغەمبەر ﷺفەرموی: تیا نەچوین و نوێژیش نەفەوتاوە، بەڵکو نوێژی بە ئاگابوانی دەفەوتێ، خەوتوو نوێژی نافەوتێنێ. (احمد).

---

ئافرەتی موسوڵمان دەبێت کە سەفەری کرد بە هاوڕێیەتی مەحرەم بێت، لەبەر پاراستنی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:دروست نی یە بۆ ئافرەتێکی موسوڵمان کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت کە سەفەر بکات ئەندازەی شەوو ڕۆژێک کە مەحرەمی لەگەڵدا نەبێت.(البخاری).

# التَّرتِيبُ

كانَ النَّبيُّ ﷺ فِي سَفَرٍ مع بعضِ أصحابِه، وكانَ معَهُ عُمَرُ ابنُ الخَطَّابِ وابنُه عبدُ اللهِ بنُ عُمَرَ ـ رضـي اللهُ عنهُمَـا ـ وكـانَ عبدُ اللهِ بنُ عُمَرَ يَركَبُ جَمَلاً قويّاً سريعاً كانَ يَمتَلِكُهُ أَبُوهُ.

وفِي أثناءِ الطَّريقِ، كانَ عبـدُ اللهِ بـنُ عُمَـرَ يُسْـرِعُ بِجَمَلِـه فيَسْبِقُ الجَمَلَ الذِي كانَ يَحمِلُ النَّبيَّ ﷺ. فلمَّـا رأى عُمَـرُ بـنُ الخَطَّابِ رضي اللهُ عنه ذلكَ نادَى ابنَهُ عبـدَ اللهِ، وعـابَ علَيـهِ تَقَدُّمَهُ علَى النَّبيِّ ﷺ، ونَهاهُ عَنْ ذَلِكَ، وأمَرَهُ أنْ يَسيرَ خَلْفَهُ.

فلَمَّا رأى النَّبيُّ ﷺ ما فعَلَهُ عُمَرُ مـعَ ابنِـهِ.. طلَـبَ مِنْـهُ أنْ يَشتَرِيَ الجَمَلَ، فقالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي اللهُ عنه: هُوَ لَـكَ يا رسولَ اللهِ.

فاشْتَرَاهُ النَّبيُّ ﷺ، ثمَّ قالَ لِعَبدِ اللهِ: «هُوَ لكَ يا عبـدَ اللهِ، فاصْنَعْ بِهِ مَا شِئْتَ» [البخاري].

---

مِنْ دُعاءِ السَّفَرِ «اللَّهُمَّ هَوِّنْ علينَا سفَرَنَا هذَا، واطْوِ عنَّا بُعْـدَهُ. اللَّهُـمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، والخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ» [مسلم].

# ڕێك كردن

پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانیدا بوو، عومەری کوڕی خەتاب و عبداللە ی کوڕی لەگەڵدا بوو، عبداللە ی کوڕی عومەر حوشترێکی بەهێزی چالاکی تیژڕەوی پی بوو کە هی باوکی بوو، لە میانەی ڕێگەدا عبداللە ی کوڕی عومەر پەلەی بە حوشترەکەی کرد پێشی ئەو حوشترە کەوت کە پێغەمبەری لەسەر بوو، کە عومەر ئەمەی بینی عبداللە ی بانگ کرد ڕەخنەی لێگرت، کە پێشی پێغەمبەر ﷺ کەوتووە، قەدەغەی کرد لەسەر ئەمە، وە فەرمانی کرد بە سەریا کە لە دوای پێغەمبەرەوە بڕوات، کە پێغەمبەر ﷺ ئیشەکەی عومەری بینی چی کرد، داوای لە عومەر کرد کە حوشترەکەی لێبکڕێ، عومەر رضي الله عنه فەرموی: بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ بەڵام پێغەمبەر ﷺ لێی کڕی پاشان فەرموی بە عبداللّه: ئەو حوشترە بۆ تۆ ئەی عبداللّه، چی پێدەکەی بیکە.(بخاری).

---

لە دوعای سەفەری پێغەمبەرﷺ (اللهم هون علينا سفرنا هذا، واطو عنا بعده، اللهم أنت الصاحب فی السفر، والخليفة فی الاهل) (مسلم).

واتە: پەروەردگار گەشتەکەمان بۆ ئاسان بکە، دوریمان بۆ نزیک بکەرەوە، پەروەردگار تۆ هاوەڵمان بیت لەم گەشتەدا، وە چاودێری ماڵ و منداڵمان بیت.

# المَفْقُودُ

خَرَجَت السَّيِّدةُ عائشةُ ـ رضي اللهُ عنْهَا ـ مع النَّبي ﷺ والمُسلمينَ فِي سَفَرٍ وفِي أثناء العَوْدَة، انقَطَعَ عِقْدُهَا، وافتَقَدَتْهُ، فأخبَرَتْ بذلكَ النَّبيَّ ﷺ، فطَلَبَ مِنْ بَعضِ أصحابِه أنْ يَبْحَثُوا عَنِ العقد، وتوقَّفَت القَافلَةُ عَنِ السَّيْرِ وأرادَ المُسلمونَ أنْ يَتوضَّئُوا للصَّلاة، فلَمْ يَجِدُوا ماءً للوُضُوءِ، فأرَادُوا أنْ يُكْمِلُوا مَسيرَهُمْ حتَّى يأتُوا مكاناً بِهِ ماءٌ. فذَهَبُوا إلَى أبِي بكرٍ رضي الله عنه وقالُوا لَهُ: ألاَ تَرَى ما صَنَعَتْ عائشةُ؟ أوْقَفَت القَافلةَ، والنَّاسُ لَيْسُوا على ماءٍ (أيْ أنَّ المكانَ ليس بِهِ بئرٌ يأخذُونَ مِنْهُ ما يكفيهُم مِنَ الماء)، ولَيْس مَعَهُمْ ماءٌ، فأنزَلَ اللهُ عزَّ وجلَّ آيةَ التَّيمُّمِ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ [المائدة: ٦]، فتَيَمَّمَ النَّاسُ، وَصَلُّوا.

ثُمَّ إنَّهم وجَدُوا العقْدَ تَحْتَ الجَمَلِ الَّذِي كانَ يَحمِلُ عائِشَةَ رَضِي اللهُ عنها. [متفقٌ عليه].

---

كانَ ﷺ يَقْصُرُ الصَّلاة الرُّبَاعيَّةَ فيُصلِّيها ركْعَتَينِ منْ حينِ يَخرُجُ مُسافراً، إلَى أنْ يَرجع إلَى المدينةِ. [متفقٌ عليه].

# ون کراو

عائیشه ﷺ له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رو ﷺ و موسـولمانان رۆشـت بـۆ سـه‌فه‌ر، لـه کـاتی گه‌ڕانه‌وه‌دا ملوانکه‌که‌ی بچڕایه‌وه‌و ده‌نکه مورووه‌کانی ون کرد، هه‌واڵیدا به پێغه‌مبه‌ر ﷺ داوای کرد له هه‌ندێ صه‌حابه که بگه‌ڕێن بۆ ملوانکه‌که. کاروانیه‌کـه وه‌سـتان لـه رۆشتن، وه موسوڵمانان ویستیان ده‌ست نوێژ بگرن بۆ نوێژ، ئاویان ده‌سـت نه‌کـه‌وت بۆ ده‌ست نوێژ، ویستیان درێژه به رۆشتن بده‌ن تا ده‌گه‌نـه ئـه‌و شـوێنه‌ی ئـاوی تیـا بێت، رۆشتن بۆ لای ئه‌بو به‌کر ﷺ ئایا نابینیت عائیشـه چـی ده‌کـات؟ کاروانیه‌کـه‌ی ڕاگرتووه. خه‌ڵکه‌که له‌سه‌ر ئاو نین (یانی ئه‌و شوێنه بیری تیـا نیـه تـا ئـاوی پێویسـتی لێده‌ربهێنن) وه ئاویشیان پێ نیه، خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی نارده خواره‌وه ﴿وان كنتم جنبا فـاطهروا.......﴾ واته: ئه‌گه‌ر له‌شتان گران بوو، ئه‌وه خۆتان خاوێن بکه‌ن و خۆتان بشۆن، ئه‌گه‌ر نه‌خۆش بوون یان له سه‌فه‌ردا بـوون یـان ده‌سـتان بـه ئـاو گه‌یانـدبوو (تاراتتان گرتبوو) یان له ئافره‌تی (نا مه‌حره‌م) که‌وتبون و ئاوتـان ده‌سـت نه‌ده‌کـه‌وت (بۆ خۆ شتن یان بۆ ده‌ست نوێژ، ئه‌و کاته ده‌توانن) به خـاکێکی پـاک تـه‌یموم بکـه‌ن (واته له‌پی ده‌ستان به ئاسته‌م بماڵن به خاکدا) و بیهێـنن بـه ڕوخسـارو ده‌سـتاندا (تـا ئانیشکتان) خـوا نایـه‌وێت لـه ئاینـدا توشـی سـه‌غڵه‌تی و نارِه‌حـه‌تیتان بکـات، بـه‌ڵکو ده‌یه‌وێت پاك و خاوێنتان بکات(له ڕواڵه‌ت و ناوه‌ڕۆکـدا) و ده‌یـه‌وێت نـازو نیعمـه‌تی خۆیتان به سه‌ردا ته‌واو بکات بۆ ئه‌وه‌ی سوپاسگوزار بن). ئه‌نجا خه‌ڵکه‌کـه تـه‌یمومیان کردو نوێژیان کرد. پاشان ئه‌وان ملوانکه‌که‌یان دۆزیه‌وه له ژێر ئه‌و حوشتره‌دا بوو که عائیشه‌ی هه‌ڵگرتبوو (بخاری ومسلم).

---

پێغه‌مبه‌ر ﷺ نوێژی کورت ده‌کرده‌وه نوێژه چوار ڕکاته‌کانی ده‌کرد بـه دوو ڕکـات له‌و کاته‌وه‌ی که به موسافیری ده‌رده‌چوو، تا ئه‌و کاته‌ی ده‌گه‌ڕایه‌وه مه‌دینه (بخاری و مسلم)

# قِصَصُ آدابِ السَّفَرِ والطَّرِيقِ

السَّـفَرُ يُعَـرِّفُ الإنسـانَ الكـثيرَ مِـنَ المَـوَاطِنِ والبُلْـدانِ، وَيُزَوِّدُهُ بالخُبْرَاتِ والمعلُومات، وبهِ يكسِبُ صَدَاقاتٍ وَمَعارِفَ جَديدةً، وبِهِ تُعـرَفُ طَبـائِعُ النَّـاسِ، ويُسـتَدَلُّ علـى أخلاَقِهِـمْ وسُلُوكِهِمْ. فقدْ جاء رَجلٌ إِلَى عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رضي الله عنـه وأَخَذَ يَمْدَحُ أحَدَ الرِّجالِ، فقالَ لَهُ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضـي الله عنه هَلْ صَحِبْتَهُ فِـي السَّـفرِ الَّـذِي يُسْـتدَلُّ بِـهِ علَـى مكَـارِمِ الأخلاقِ؟ قالَ الرَّجلُ: لا فقالَ عُمَرُ: ما أَرَاكَ تَعرِفُهُ.

وفِي السَّفَرِ يَرَى المُسافِرُ مِنْ عَجَائبِ الكَونِ ما يُؤَكِّدُ عَظَمَـةَ خالِقِهِ؛ فيَتَدبَّرُ هذه المَخلُوقاتِ، وقُدْرةَ خالِقِهَا عزَّ وجلَّ.

والسَّفَرُ عِندمَا يكُونُ فِي طَاعَةِ اللهِ فهُوَ عِبادةٌ، يَنَالُ المُسلِمُ علَيهَا حَسَناتٍ، وتَرتَفِعُ دَرَجتُهُ عندَ اللهِ.

والمُسلِمُ إِذَا أرادَ السَّفَرَ، فإِنَّهُ يُصَلِّي صَلاةَ الاستِخَارَةِ، وَيُوَدِّعُ أَهلَهُ وأصدِقاءَهُ قبلَ السَّفَرِ، ويَذْكُرُ اللهَ عزَّ وجلَّ عِنْدَ خُرُوجِهِ.

*****

# چیرۆکەکانی ئادابی گەشت و ڕێگە

سەفەر دەناسێنێ بە مرۆڤ زۆر لە شوێنان و شارەکان، توێشوو داری دەکەن بە ئەزمون و زانیاری، وە بە سەفەر، دۆست و ناسراوی تازە پەیدا دەکات، وە بە سەفەر سروشتی مرۆڤەکان دەناسی، بەڵگەدار دەبیت لەسەر ڕەوشت و ئاکاریان، پیاوێک هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بە بالأی یەکێک لە پیاوەکانیدا هەڵدا عومەری کوڕی خەتاب ﷺ پێی وت: ئایا هاوەلأیەتیت کردووە لەسەفەردا کە بەڵگەدار بیت لەسەر ڕەوشت و ئاکاری؟ پیاوەکە وتی نەخێر! عومەر فەرموی: کەواتە وا نازانم بیناسیت! لە سەفەردا مرۆڤ شتە سەرسوڕهێنەرەکانی گەردون دەناسێت، کە گەورەیەتی بەدی هێنەرەکە بناسێت وردبێتەوە لەم دروست کراوانە، وەلە بەتوانایی دروست کراوەکەی، سەفەر ئەگەر لە گوێڕایەڵی خوادا بێت ئەوە خوا پەرستیە، کە موسوڵمان چەندەها چاکەی بۆ دەنوسرێت پلەی لای خوا بەرز دەبێتەوە، موسوڵمان کە ویستی سەفەر بکات، ئەوە نوێژی ئیستیخارە دەکات و خوا حافیزی لە منداڵکانی و خێزانی و هاوەڵەکانی دەکات پێش سەفەرەکەی، یادی خوا دەکات کاتێک کە دەرچوو بۆ سەفەر.

# ئادابی نوستن

نوسنی: یسری سعد شعیب

وەرگێڕانی: م. ئومێد محمد باوەمردەیی

# الرَّجُلُ والعَقْرَبُ

كَانَ المُشرِكونَ إذَا أرَادُوا المَبيتَ فِي الصَّحراءِ، قالُوا كلاماً معنَاهُ أنَّهُم يطلبُونَ مِنْ زُعماءِ الجنِّ أنْ يَحْمُوهُمْ، ويُبْعدُوا عنْهُمُ الأذَى. وجاء الإسلامُ، وعَلَّمَ النَّبيُّ ﷺ المُسلِمينَ أنَّ الاستِعانَةَ لا تَكونُ إلا باللهِ، وقالَ ﷺ: «إذَا استَعَنْتَ فاستَعِنْ باللهِ».

وذَاتَ يَومٍ، دخَل رجلٌ مِنْ قبيلةِ أَسْلَمَ، يَبْدُو عليهِ التَّعَبُ والإرهَاقُ، فسَأَلَهُ الرَّسولُ ﷺ عَنْ حالِهِ، فقَالَ لَهُ: ما نِمْتُ هذهِ اللَّيلَةَ.

فقالَ لَهُ رَسولُ الله ﷺ: «مِنْ أيِّ شَيءٍ؟».

فقالَ: لدَغَتْنِي عقْرَبٌ.

فقالَ ﷺ: «أمَا إنَّكَ لَوْ قُلْتَ حينَ أمسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلماتِ اللهِ التَّامَّات مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ، لَمْ تَضُرَّكَ» [مسلم].

---

مِنْ أذكارِ المساءِ، قَولُ النَّبيِّ ﷺ: «بِسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيءٌ فِي الأرضِ ولا فِي السَّماءِ» [مسلم].

# پیاو و دووپشك

بی باوەڕەکان کاتێك دەچوونە بیابان بۆ شەو مانەوە، قسەیەکیان دەکرد بە شێوەیەك مەبەستیان پەنا گرتن بوو بە گەورەی جنۆکەکان تا ئازاریان لێ دوور بخاتەوە و بیان پارێزن!! بەڵام کاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات، پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانانی فێر کردن کە پەنا بەهیچ شتێك نەگرن جگە لەخوای گەورە فەرموی: {ئەگەر داوای یارمەتیتان کرد بەس داوا لەخوا بکەن}

ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ لەهوزی (ئەسلەم) بوو، نیشانەی ماندو بوون و شەکەتی پێوە دیار بوو، پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری لێکرد ووتی: چی ڕوویداوە؟ ووتی: ئەمشەو نەخەوتووم، پێغەمبەری خوا فەرموی: لەبەر چی؟ ووتی: دووپشك پێوەی داوم پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر بێت و ئێوارە بت ووتایە پەنا ئەگرم بە ووشە تەواوەکانی خوا لەشەڕی هەموو دروست کراوێکی، ئەوە زیانی پێی نەدەگەیانی. (مسلم)

---

لەزکری ئێواران فەرمودەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێت(بەناوی(اللە) کە لەگەڵ ناو هێنانی ئەودا، هیچ شتێك نە لەزەوی نە لە ئاسمان زیان ناگەیەنێت) (مسلم).

# النَّومُ عَنِ الصَّلاةِ

رجع النَّبيُّ ﷺ وصحَابَتُه مِنْ غَزْوَةِ خَيْبرَ، وسارَ بِهِم مُعظَمَ اللَّيلِ، حتَّى غلَبَهُم النُّعاسُ، فأمَرَ بِلالاً أنْ يُوقظَهُمْ للفَجْرِ، ونامَ الرَّسولُ ﷺ وصحابَتُه، ووَقَفَ بِلالٌ يَنتَظِرُ الفَجرَ، فغَلَبهُ النُّعَاسُ، فاستَنَدَ إلَى رَاحِلَتِه فنَامَ، ولَمْ يَستَيقظْ أحَدٌ مِنَ الصَّحَابَةِ حتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وأحَسُّوا بِشِدَّةِ حَرِّهَا، فقَامَ النَّبيُّ ﷺ مِنْ نَومِهِ فَزِعاً، وقالَ: «أيْ بِلالُ!».

فاستَيقَظَ بِلالٌ، وقالَ: أخَذَ بِنَفْسِيَ الَّذي أخَذَ بِنَفْسِكَ (أي: غلَبَنِي النَّومُ كما غلَبَكُم). فأمَرَهُمُ الرَّسُولُ ﷺ أنْ يَسِيرُوا حتَّى ارتفَعَتِ الشَّمْسُ، ثمَّ نَزَلَ وتَوضَّأَ هُوَ وأصْحابُهُ، وصَلُّوا الصُّبحَ، ثُمَّ قالَ النَّبيُّ ﷺ: «إذَا رَقَدَ أحَدُكُم عَنِ الصَّلاةِ وغَفَلَ عَنْهَا، فَلْيُصَلِّهَا إذَا ذَكَرَهَا، فإنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾» [متفقٌ عليه].

---

تَنظِيفُ الأسنانِ قبلَ النَّومِ وعِندَ الاستِيقاظِ سُنَّةٌ؛ عَنِ ابنِ عُمَرَ أنَّ النَّبيَّ ﷺ كَانَ لا يَنامُ إلاَّ وَالسِّوَاكُ عِنْدَهُ، فإذا استَيقَظَ بدأَ بالسِّوَاكِ. [أحمد].

# خەوتن لەکاتی نوێژدا

کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا گەڕانەوە لەجەنگی خەیبەر، لەبەر ئەوەی زۆربەی شەوەکە رێگەیان بڕیبوو خەو زۆری بۆ هێنان فەرمانی کرد بە بیلال کە بۆ نوێژی بەیانی ئاگاداریان بکاتەوە، کاتی پێغەمبەرو هاوەڵان خەوتن بیلال چاوەڕێ ی بەیانی دەکرد بەڵام ئەویش خەوی لێکەوت هیچ کامیان خەبەری نەبووەوە هەتا گەرمای خۆر هەڵی ساندن، کاتێ پێغەمبەر ﷺ هەستا لە خەو، بەپەلە ووتی: ئەی بیلال بۆچی بە ئاگات نەکردینەوە، فەرمووی: خەو زۆری بۆ هێنام، هەروەک زۆری بۆ ئێوەش هێناو نوستن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵان کرد کە بەڕێبکەون تا بەتەواوی خۆر بەرز بۆوە پاشان دابەزین و پێغەمبەرو هاوەڵان دەست نوێژیان گرت و نوێژی بەیانیان ئەنجامدا، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە لەکاتی نوێژدا نووست و لێ ی بێئاگا بوو با کەبیری کەوتەوە نوێژەکەی بکات. چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: نوێژ بکە بۆ یادی خوا. (متفق علیه)

---

سوننەتە ددان پاککردنەوە پێش نوستن و پاش بەخەر بونەوە لە (إبن عمر) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ کە نوستووە هەمیشە سیواکی لا بووە، کەخەبەری دەبۆوە دەستی بەسیواک کردن دەکرد. (أحمد)

# ذِكْرٌ قَبْلَ النَّوْمِ

تَعبت السَّيِّدةُ فاطمةُ ـ بنتُ النَّبيِّ ﷺ ـ مِنْ كَثْرةِ العَملِ فِي مَنزِلِهَا؛ حَيثُ كانَتْ تَطْحنُ الشَّعير بالرَّحَى، فَتُؤثِّرُ فِي يَدَيْهَا، فذهبتْ إلَى النَّبي ﷺ تَسأَلُه أنْ يُعطِيَهَا خَادِماً يُعِينُهَا فِي شُؤُونِ البيتِ، ولكنَّها لَمْ تَجِد النَّبيَّ ﷺ، فأخبَرَتِ السَّيِّدةَ عائِشةَ بالأمرِ

وجاء اللَّيلُ، وحَضرَ النَّبيُّ ﷺ، وأخبَرَتْهُ عائشةُ رضيَ اللهُ عنها، فذَهَبَ النَّبيُّ ﷺ إلَى ابنَتِه فاطِمةَ رضيَ اللهُ عنها، فوَجَدَهَا تَجلسُ في الفراشِ بجانبِ عَليٍّ كرَّمَ اللهُ وجْهَهُ، فجَلَسَ النَّبيُّ ﷺ بينَهمَا، وقالَ لَهُمَا: «ألاَ أدُلُّكُمَا عَلَى ما هُوَ خَيرٌ لكُمَا مِنْ خادِمٍ؟ إذَا أَوَيْتُمَا إلَى فِراشِكُمَا ـ أو أخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا ـ فكَبِّرَا أربَعاً وثلاثِينَ، وسَبِّحَا ثلاثاً وثلاثينَ، واحْمَدَا ثلاثاً وثلاثِينَ، فهذَا خَيرٌ لكُمَا مِنْ خَادِمٍ» [متفقٌ عليه].

---

الوُضوءُ مِنْ آدابِ النَّومِ؛ عنِ البَرَاءِ بنِ عازِبٍ قالَ: قالَ لِي رسولُ اللهِ ﷺ: «إذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فتَوضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاةِ» [البخارِي].

# زیکری پێش نوستن

خاتوو(فاطمە کچی پێغەمبەری خوا ﷺ) زۆر ماندوو دەبوو لەماڵەوە بەهۆی جۆ هارِین بە دەستارِ کە کاری کردبووە لەدەستەکانی، چووە خزمەت پێغەمبەری خوا هەتاکو بەندەیەکیان پێبدات هاوکارییان بکات لەکارو باری ماڵەوەدا، بەلاّم پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ بەندەی لانەبوو تا پی ی بدا، کاتێک شەو هات پێغەمبەری خوا چوو بۆ ماڵی خاتوو فاطمە رضي الله عنها، لەنزیک پێشەوا علی رضي الله عنه دانیشتبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (ئایا شتێکتان پێ بڵێم باشتر لە بەندەیەک خزمەتتان بکا، کە چوونە سەر جێگای نوستن (٣٤) جار بڵێن: (اللّٰه أکبر)، ٣٣جار (سبحان اللّٰه)، ٣٣جار(الحمد للّٰه). ئەمە باشترە بۆتان لە بەندەیەک کە خزمەتتان بکات) (متفق علیه)

---

دەست نوێژ گرتن لە ئادابی نوستنە، بەرائی کوری عازب رضي الله عنه ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ی فەرموم: ئەگەر چویتە سەر جێگەی نوستن، دەست نوێژ بگرە هەروەک دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژ) (البخاری)

# صَلاةُ اللّيلِ

أمَر اللهُ عزَّ وجلَّ النَّبيَّ ﷺ بِصَلاة القِيَامِ، فكـانَ الـنَّبيُّ ﷺ يُصَلِّي مُعْظَم اللَّيلِ، وظَـلَّ كَـذلكَ عامـاً كـاملاً، حتَّـى خَفَّفَ اللهُ عنْهُ، وأرْشَدَهُ إلَـى أنْ يَقُـومَ بعـضَ اللَّيـلِ ويَنـامَ بَعْضَهُ الآخَرَ

وذاتَ يَومٍ، وبعدَ صلاةِ العِشاءِ، ذهَبَ الـنَّبيُّ ﷺ إلَـى زَوجتِهِ مَيْمُونَةَ بنتِ الحَارثِ، فوَجَدَ عِنْدَها ابنَ عبَّاسٍ رضيَ اللهُ عنهما، وهوَ ابنُ أُختِهَا، فصَلَّى أربعَ ركَعاتٍ ثُمَّ نامَ.

وفِي آخرِ اللَّيلِ، قامَ النَّبيُّ ﷺ، فتَوَضَّأَ وبدأَ صَـلاةَ قِيـامِ اللَّيلِ، فقَامَ ابنُ عبَّاسٍ ووَقَفَ على يَسَـارِ الـنَّبيِّ ﷺ، فحَوَّلَـهُ النَّبيُّ ﷺ علَى يَمينِهِ وصَلَّى خمسَ ركَعاتٍ، ثمَّ صلَّى ركْعَتَينِ.

ثُمَّ نامَ النَّبيُّ ﷺ، حتَّى جاءَهُ المُنادِي لِيُخبِـرَهُ أنَّ وَقْـتَ صَلاةِ الفَجرِ قَدِ اقترَبَ، فخَرَجَ معَهُ لِلصَّلاةِ. [البخارِي].

---

الدُّعاءُ عندَ الاستِيقاظِ سُنَّةٌ، فقَدْ كَانَ الـنَّبيُّ ﷺ إذا اسـتَيْقَظَ قـالَ: «الحَمْدُ للهِ الَّذِي أحْيانَا بعدَ مَا أمَاتَنَا وإلَيهِ النُّشُورُ» [البخاري].

# شەو نوێژ

خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی کە شەو نوێژ بکات، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە تاریکی شەودا شەو نوێژی دەکرد، بەردەوام بوو لەسەری تا ساڵێک، تا خوا لەسەری سوک کرد ڕێنموی کرد هەندێ شەو نوێژ بکات و هەندێکی تر بخەوێت، ڕۆژێکیان لەدوای نوێژی عیشا پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە لای (مەیمونەی کچی حارث) کە خێزانی بوو (إبن عباس) ی لێ بوو کە کچە زای بوو(ڕەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەر چوار ڕکاتی کرد و نوست، دوایی لەشەودا هەستاو دەست نوێژی گرت و شەو نوێژی کرد (إبن عباس) لەلای چەپی پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستا، پێغەمبەر ﷺ خستیە لای ڕاستی یەوەو (٥) ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ نوست هەتا کەسێک هات بانگی کرد کە کاتی نوێژی بەیانی نزیک بوتەوە، ئەویش لەگەڵی دەرچوو بۆ نوێژ (البخاری)

---

دوعا کردن لەکاتی هەستان لەخەو سوننەتە، پێغەمبەر ﷺ کە لەخەو هەڵدەستا دەیفەرموو:(سوپاس بۆ ئەو خوایەیی زیندوی کردینەوە دوای ئەوەی مراندینی(مەبەست خەوتنە) وە هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە) (البخاری)

# حِفْظُ اللهِ

كلَّف النَّبيُّ ﷺ أبَا هُرَيْرة رضي الله عنه بحِراسةِ تَمْرِ الصَّدَقَة أثناء اللَّيلِ، فَأمْسَكَ رجُلاً يَسرُقُ مِنَ التَّمرِ ذاتَ لَيلةٍ، فشكَا إليهِ الرَّجُلُ أنَّهُ فَقيرٌ وعنْدَهُ عِيالٌ يُريدُ أنْ يُطعِمَهُم، فتَرَكَهُ أبُو هُرَيرةَ، ثُمَّ أخبرَ النَّبيَّ ﷺ بِمَا حَدَثَ، فقالَ لَهُ ﷺ: «أمَا إنَّهُ كَذَبَكَ وسَيَعُودُ». وبالفعْلِ، عادَ الرَّجُلُ يَسرُقُ مرَّتَينِ. وفي الْمَرَّةِ الثَّالثة، أصَرَّ أبو هُرَيْرَةَ علَى الذَّهَابِ بِهِ إلَى الرَّسولِ ﷺ، فعَرَضَ الرَّجُلُ علَى أبي هُرَيْرةَ أنْ يُعَلِّمَهُ كلماتٍ يَقُولُهُنَّ قبلَ النَّومِ، ويَتْرُكُهُ، فوَافَقَ أبُو هُرَيْرةَ، فقالَ لَهُ الرَّجلُ: إذا أوَيْتَ إلَى فِراشِكَ فَاقرأْ آيةَ الكُرْسيِّ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ﴾ [البقرة: ٢٥٥]، فَلاَ يَزَالُ عليكَ مِنَ الله حافظٌ ولاَ يَقْرَبُكَ شَيطَانٌ حتَّى تُصبِحَ. وأخبَرَ أبُو هُرَيْرةَ النَّبيَّ ﷺ [بذلكَ]، فقالَ لَهُ: «إنَّهُ قَدْ صدَقَكَ، وهُوَ كَذُوبٌ. هَلْ تَعْلَمُ مَنْ تُخاطِبُ منذُ ثلاثٍ يا أَبَا هُرَيْرةَ؟». قالَ: لا قالَ ﷺ: «ذَاكَ الشَّيطانُ» [البخارِي].

---

المُسلِمُ عندمَا يُصَلِّي العِشاءَ، ثُمَّ يَخْلُدُ للرَّاحةِ يكُونُ نَومُه هادِئاً ومُرِيحاً، ولِذَلكَ كَانَ النَّبيُّ ﷺ يكرَهُ النَّومَ قبلَ صلاةِ العِشاءِ. [البخاري]

# پاراستنی خوایی

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو هورەیرەی ﷺ کردە سەرپەرشتیارو چاودێری خورمای زەکات لە کاتی شەودا، شەوێک کابرایەکی دەستگیر کرد کە خورمای دزی بوو، کابرا باسی حالی خۆی کرد کە هەژارەو هیچی نییە و منالّی زۆرەو دەیەوێت خواردنیان بۆ ببات، ئەو جارە ئەبو هریرە ﷺ وازیلێهێنا، پاشان ئەو هەواڵەی کە ڕووی دابوو بە پێغەمبەری ووت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:(ئەو درۆی لەگەڵ کردویت و دەگەڕێتەوە) هەروابوو، پیاوەکە بۆ جاری دووەم گەڕایەوە بۆ دزی هەمان شتی شەوی پێشوی وت، لەجاری سێ هەمدا، ئەبو هریرە سور بوو لەسەر بردنی کابرا بوچ لای پێغەمبەرﷺ، کابرا پێشنیاری بۆ ئەبو هریرە ﷺ کرد فێری چەند ووشەیەکی بکات لەکاتی نوستندا بیڵێت، ئەویش ئازادی بکات، ئەبو هریرە ڕازی بوو، کابرا ووتی: کەچویتە سەر جێگای نوستن، (آیة الكرسی) بخوێنە (الله اله الا هو الحیّ القیوم) البقره/٢٥٥

ئیتر بەردەوام خوا دەتپارێزێ و شەیتان نزیکت نابێتەوە تا بەیانی! ئەبو هریرە ئەم باسەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، فەرموی: ئەو لەو قسەدا ڕاستی لەگەڵ کردویت، بەڵام خۆی درۆزنە، ئەزانی سێ شەوە لەگەڵ کێ قسە دەکەیت ئەی ئەبو هریرە؟ وتی: نەخێر،

(پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە شەیتان بوو) (البخاری)

---

موسڵمان کاتێک نوێژی خەوتنان دەکات، پاشان بەدڵئارامی دەخەوێت و ئیسراحەت دەکات، بۆیە پێغەمبەرﷺ نوستنی پێش نوێژی خەوتنانی بەخراپ زانیوە) (البخاری)

# نَمْ يا أبَا الدَّرْدَاءِ

كَانَ الصَّحابِيُّ الجَليلُ أبُو الدَّرْداءِ رضي الله عنه زاهِداً فِي الدُّنْيا، يَصُومُ النَّهارَ، ويَقُومُ اللَّيلَ. وذاتَ يَومٍ، زارَهُ سَلْمانُ الفَارسِيُّ رضي الله عنه، فعَلِم مِنْ زَوجَتِه أنَّهُ يَقُومُ اللَّيلَ، ويصُوم النَّهارَ، وعَلِم أنَّهُ قدْ أهْمَلَ زَوجَتَهُ ولَمْ يَقُمْ بِحَقِّهَا، فلَمَّا جاءَ أبُو الدَّرْداءِ قَدَّمَ إليهِ الطَّعامَ، فرَفَضَ أنْ يأكُلَ وحْدَهُ، وقالَ لَهُ: كُلْ يا أبَا الدَّرْداء. فقالَ: إنِّي صائِمٌ. فقالَ سَلْمَانُ: أقسَمْتُ عليكَ لَتُفْطِرَنَّ.

فأكَلَ معَهُ، ثمَّ باتَ سَلْمانُ عندَ أبِي الدَّرْداءِ. وجاءَ اللَّيلُ، واستَعَدَّ أبُو الدَّرْداءِ لقِيامِ اللَّيلِ، فمَنَعَهُ سَلْمانُ، وقالَ: إنَّ لجَسَدِكَ علَيكَ حَقّاً، ولرَبِّكَ علَيكَ حَقّاً، ولأهلِكَ علَيكَ حَقّاً.. صُمْ وأفْطِر، وصَلِّ ونَمْ، وائتِ أهلَكَ، وأعْطِ كُلَّ ذي حَقٍّ حَقَّهُ. واستَيقَظَ سَلْمانُ وأبُو الدَّرْداءِ لِيُصَلِّيَا الفَجْرَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وأخبَرَ أبُو الدَّرْداءِ الرَّسُولَ ﷺ بِمَا فعَلَ سَلْمَان، فقالَ ﷺ: «صَدَقَ سَلْمَانُ» [الترمِذيُّ].

---

الدُّعاءُ مِنْ آدابِ النَّومِ؛ فعَنْ حُذَيْفةَ قالَ: كانَ النَّبيُّ ﷺ إذَا أوَى إلَى فِراشِهِ قالَ: «اللَّهُمَّ باسْمِكَ أمُوتُ وأحيَا» [البخارِيّ].

# (ابو الدرداء بخەوە)

هاوەڵی بەڕێز(ئەبو دەرداء)ﷺ کەسێکی زاهید دنیا نەویست بوو، شەو نوێژی دەکرد و ە بە ڕۆژیش ڕۆژوی دەگرت.

ڕۆژێک سەلمانی فارسی ﷺ سەردانی کرد. لەقسەی هاوسەرەکەی (گلەی خوێندەوە) کە ووتی: شەو هەڵدەستێ و ڕۆژ بەڕۆژو دەبیت، زانی کە هاوەڵەکەی خێزانی فەرامۆش کردووەو مافەکانی جی بەجی ناکات کاتێ(ئەبو دەرداء) خواردنی بۆ دانا، سەلمان ڕازی نەبوو بەتەنها خواردن بخوات ووتی: تۆش بخۆ، (ئەبو دەرداء) وتی: من بەڕۆژوم، سەلمانﷺ وتی: سوێندت دەدەم دەبێت بیشکێنی. ئەویش: (ڕۆژووەکەی شکاند) و لەگەڵی خواردی

ئەو شەوە (سەلمان) ﷺ لەماڵیان مایەوە، شەو داهات و (ابو دەوداء) خۆی ئامادە کرد بۆ شەو نوێژ، سەلمانﷺ نەیهێشت و ووتی: لاشەت مافی بەسەرتەوە هەیە، خواش مافی بەسەرتەوە هەیە، خێزان و منالت مافیان بەسەرتەوە هەیە، بەڕۆژو بەو هەندێ ڕۆژ بەڕۆژو مەبە، نوێژ بکەو بخەوە، بڕۆ بۆ لای هاوسەرت هەرشتەوماف و هەقی خۆیانی بدەرێ

ئیتر (سەلمان) و(ابو الدرداء) ﷺ بۆ نوێژی بەیانی هەستان تا لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەماعەت بکەن، (ابو الدرداء) باسەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێرایەوە کە سەلمان ﷺ لەگەڵی کردبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (سەلمان) ڕاستی وتووە (الترمزی)

---

دوعا کردن لە ئادابی نوستنە: حوذەیفە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کە دەچووە سەر جێگەی نوستن دەیفەرموو: (پەروەردگارە بەناوی تۆوە دەمرم و دەژیم) (البخاری)

# لَـنْ أنـامَ

جَاءَ بَعضُ الصَّحَابةِ مِـن الأنْصـارِ يَسْأُلُونَ عَـنْ عِبـادَةِ النَّبِي ﷺ، فوَصَفَتْ لَهُـمْ أمُّ المُـؤمِنينَ عائِشَـة ـــ رضِـيَ اللهُ عنها ـ عِبَادَتَـهُ ﷺ، لَكِـنَّهُم ظَنُّـوا أنَّهـا قليلـةٌ، وقـالُوا فِـي أنفُسِهِم: هذَا رَسولُ الله ﷺ، وقَدْ غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِـنْ ذَنْبِـه وما تَأَخَّرَ

فَقَالَ أحَدُهُم: إنِّي سَـوفَ أقُـومُ اللَّيـلَ ولا أنـامُ طُـولَ عُمْرِي.

وقالَ الثَّانِي: سَوفَ أصُومُ كُلَّ الأيَّامِ ولاَ أُفطِرُ.

وقالَ الثَّالثُ: لَنْ أتزَوَّجَ النِّسَاءَ.

وعَلِمَ النَّبِيُّ ﷺ بِما قَـالُوا: فغَضِـبَ، وقـالَ: «ولكنِّـي أَقُومُ وأَرقُدُ، وأَصُومُ وأُفْطِرُ، وأتزَوَّجُ النِّسَـاءَ، فَمَـنْ رَغِـبَ عَنْ سُنَّتِي (تركَهَا) فلَيْسَ مِنِّي) [متفقٌ عليه].

---

نَفْضُ الفِـرَاشِ مِـنَ الآدابِ قَبـلَ النَّـومِ؛ فقَـدْ قـالَ ﷺ: «إذَا أوَى أحَدُكم إلَى فِرَاشِهِ فلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ» [البخارِيّ].

# ناخەوم

هەندێ هاوەڵی ئەنصاری هاتن پرسیاری چۆنێتی عیبادەت و نوێژی پێغەمبەر ﷺ یان کرد، دایکی باوەڕداران خاتوو (عایشە) ؓ باسی نوێژو عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ ی کرد، ئەوان وا گومامیان برد ئەو ئەندازەیە کەمە، لە دەرونی خۆیاندا وتیان: ئاخر ئەو پێغەمبەری خوایە، خواش لەهەرچی هەڵەی پێش و دوای خۆش بووە و بەخشیویەتی.

یەکێکیان وتی: من ئیتر شەو هەمیشە هەڵدەشتم، بەتەمەن ناخەم!!

دووەم وتی: من هەموو ڕۆژی بەڕۆژو دەبم و نایشکێنم!!

سێ یەم وتی: من هەرگیز ژن ناهێنم!!

پێغەمبەری خوا ﷺ زانی کە چییان وتووە، تورە بوو، فەرموی: من هەڵدەستم بۆ شەو نوێژو دەشخەوم، بەڕۆژو دەبم هەندێ جار و هەندێ ڕۆژ بەڕۆژو نابم، خێزانم هەیەو ژن دەهێنم، هەرکەس پشت لە ڕێبازو سوننەتی من بکات لەمن نییە. (متفق علیه)

---

تەکاندنی جێگەی نوستن لە ئادابی خەوتنە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (یەکێک لە ئێوە ئەگەر چووە سەر جێگەی خەوتن با لەپێشدا جێگەکەی هەڵبتەکێنێ) (البخاري)

# كلِمَاتٌ مُبَارَكَةٌ

دَخَل البَراءُ بنُ عازِب رضي الله عنـه علَـى النَّبِـيِّ ﷺ، فقالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «ألاَ أُعَلِّمُكَ كلِمات تَقُولُهَا إذَا أَوَيْتَ إلَى فِرَاشِـكَ، فَـإنْ مُـتَّ مِـنْ لَيْلَتِـكَ مُـتَّ علَـى الفِطْـرَةِ، وإنْ أَصْبَحْتَ أَصْبَحت وقَـدْ أَصـبْتَ خَـيراً؟ تَقُـولُ: اللَّهـمَّ إنِّـي أسْلَمْتُ نَفسِي إليـكَ، ووَجَّهْـتُ وجْهِـي إليـكَ، وفوَّضْـتُ أمرِي إليكَ، رَغْبَةً ورَهْبَةً إليكَ، وألجَأْتُ ظَهْرِي إليـكَ، لا مَلْجـأَ ولا مَنْجَـى منـكَ إلاَّ إليـكَ، آمَنْـتُ بكِتابـكَ الَّـذِي أنزَلتَ، ونَبيِّكَ الَّذِي أرسَلْتَ».

فقالَ البَرَاءُ: وبِرَسُولِكَ الَّذِي أرْسَلْتَ.

فضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بيَدِه علَى صَدْرِ البَرَاءِ مُدَاعِباً، وقالَ: «وبِنَبِيِّكَ الَّذِي أرْسَلْتَ» [مسلم].

---

وَضْعُ اليَدِ تحتَ الخَدِّ اليُمْنَى عندَ بَـدْءِ النَّـومِ مِـنْ آدابِ النَّـومِ؛ فعَـنْ حُذَيفةَ قالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إذَا أخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيلِ وضَعَ يَدَهُ تحـتَ خَدِّه. [البخاري].

# ووشه پیرۆزه‌کان

(البراء کوڕی عازب) ﷺ چوه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئـه‌ویش پـێ ی فـه‌رموو: چه‌ند ووشـه‌یه‌کت فێـر بکـه‌م که‌لـه‌کاتی نوسـتندا بیلێـت؟، ئه‌گـه‌ر مـردی لـه‌و شه‌وه‌دا له‌سه‌ر ئیمـان و فیطـره‌ت ده‌مـری، ئه‌گـه‌ر هه‌سـتایت، هه‌سـتانێکی پـڕ له‌خێرو چاکه ده‌بێت؟ بڵێ: په‌روه‌ردگار من خۆم ته‌سـلیم بـه‌تۆ کـرد، ڕوم کـرده تۆ، کاوباره‌کانم دایه ده‌ستی تۆو گێڕامه‌وه بۆ لات به ئومێدی ڕه‌زامه‌ندیت و لـه ترسی توڕه‌یت و سزات، پشت و په‌نام هه‌ر تۆیت، په‌نام نیه، ڕزگـار کـارم نیـه بێجگه له‌خۆت، باوه‌ڕم به قورئان هێنا که داتبه‌زاندووه، بـاوه‌ڕم به‌وهه‌واڵـده‌ره‌ی که‌ڕه‌وانه‌ت کردووه هێنا.

به‌راء ووتی: به‌و پێغه‌مبه‌ره‌ی که ناردووته، جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ به گاڵته‌وه کێشای به‌سه‌ر سنگی(بـه‌راء) داو فـه‌رموی: بـه‌و هه‌واڵـده‌ره‌ی کـه ڕه‌وانـه‌ت کـردووه. (مسلم)

---

له‌ئادابی نوستنه ده‌ست بخه‌یته ژێر ڕوومه‌تی ڕاست له‌کاتی ده‌ست کردن بـه نوستن، حوزه‌یفه ده‌ڵێت: (پێغه‌مبه‌ر ﷺ که ده‌چووه شوێنی نوستن لـه شـه‌ودا، ده‌ستی ده‌حسته ژێر ڕوومه‌تی)، (البخاری)

# نَوْمَةٌ يَكْرَهُهَا اللهُ

سمع الصَّحابةُ رسول الله ﷺ يَقولُ: «المسجدُ بيتُ كُلِّ تقيٍّ»، فكَانُوا يَقْضُونَ فيه كثيراً مِنْ أوْقَاتِهِمْ، وكانَ بَعضُهُمْ يَنامُ فِيه، فأجازَ لَهمْ ﷺ النَّوم فِي المَسجدِ، ولكِنْ معَ الحِرْصِ علَى نَظَافَتِه وصِيانة حُرْمَتِه.

وكَانَ الصَّحابةُ رضي الله عنهم يَعْتَكِفُونَ فِي المسْجدِ فِي شهرِ رَمَضان.

وذاتَ يَومٍ، دخَل النَّبيُّ ﷺ المَسجِدَ، فوَجَدَ رَجلاً نائماً علَى بَطْنِه فِي ناحيةٍ مِنْ نَوَاحِي المسْجِدِ، فاقْتَرَبَ مِنْه النَّبيُّ ﷺ، وحركَهُ برِجْلِه لِيَعْتَدِلَ مِنْ هذِهِ النَّومَةِ، وقالَ: «مَا لَكَ ولِهَذَا النَّومِ؟ هذِه نَوْمَةٌ يَكْرَهُهَا اللهُ - أو يَبْغَضُهَا اللهُ -» [ابن ماجه].

---

المُسلِمُ يَبدأُ نَومَهُ علَى جَنْبِهِ الأيمَنِ؛ قالَ البَرَاءُ بْنُ عازِبٍ: كانَ رَسولُ الله ﷺ إذَا أوَى إلَى فِرَاشه نامَ علَى شقِّه الأيمَنِ. [البخاري].

# جۆرە نوستنێك خراپە لای خوای گەورە

هاوەڵان گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ بوو كە دەیفەرموو: ((مزگەوت ماڵی هەموو بەندەیەكی خوا ناسە)) بۆیە زۆربەی كاتیان لەوێ بەسەر دەبرد، هەندێكیان دەخەوتن لەمزگەوت و پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی دەدان، بەلاَم لەگەڵ ئەوەی كەپارێزگاری لەرێزو پاك و خاوێنی بكرێت.

هاوەڵان لەرەمەزاندا لە مزگەوت دەمانەوەو (إعتكاف) یان دەكرد رۆژێك، پێغەمبەر ﷺ هاتە مزگەوت بینی كابرایەك لەسەر سكی راكشاوە لە سوچێكی مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی نزیك بووەوە و بەقاچی جولاَندی تا ئەو شێوازە خەوتنە بگۆرێت، فەرمووی: (بۆچی ئاوا بەو شێوازە نوستوی؟ ئەوە جۆرە نوستنێكە خوا پێ ی ناخۆشە، یان خوا لێ ی تورەیە) (ابن ماجە)

---

موسڵمان لەسەر لای راست دەست بەنوستن دەكات، بەرائی كوری عازب دەڵێت: (كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە سەر جێگەی نوستن لەسەر لای راستی دەخەوت) (البخاری)

# السَّاهِرَةُ

دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ علَى السَّيِّدة عائشةَ - رضِيَ الله عنها - فوجَدَ عنْدَهَا امرأةً، فسألَ عائشةَ عنْهَا، فقالَتْ: هذه الحَوْلاءُ بنتُ تُوَيْت. زَعَمُوا أنَّهَا لا تَنَامُ (أي: تَقُومُ اللَّيلَ كُلَّهُ وتَقْضيه في الصَّلاةِ). فكَرِه النَّبِيُّ ﷺ تَشَدُّدَهَا علَى نَفْسِهَا؛ لأنَّ الإسلامَ دِينُ التَّوسُّطِ والاعْتِدَالِ، فلَو سَهِرَ كُلُّ النَّاسِ طُولَ اللَّيلِ، فَمَنْ يَسْعَى فِي الأرْضِ ويُعَمِّرُهَا، ويكتَشِفُ خَيْرَاتِها.

وقالَ ﷺ مُتَعجِّباً «لا تَنامُ اللَّيلَ؟! خُذُوا مِنَ العَمَلِ ما تُطِيقُونَ. فَوَالله لاَ يَسْأَمُ اللهُ حتَّى تَسْأَمُوا».

أي: أنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يُحِبُّ العمَلَ الدَّائمَ ولو كانَ قليلاً. [مسلم].

---

يَجِبُ التَّوسُّطُ في النَّومِ، وعَدَمُ الإسرافِ فيهِ، فقَدْ قالَ النَّبِيُّ ﷺ لِرَجلٍ: «... فإنَّ كَثْرَةَ النَّومِ تَتْرُكُ الإنسانَ فَقِيراً (قليلَ الحَسَناتِ)» [متفقٌ عليهِ].

# شەو بێدار

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای خاتو (عائشە) ﵂ ئافرەتێکی بینی پرسیاری لە عائشە کرد دەربارەی؟ فەرمووی: (ئەو (حەولاء کچی تەویت)ە هەموو شەو بێدار بووە و خەریکی نوێژ بووە)

پێغەمبەر ﷺ پێ ی ناخۆش بوو کەئاوا لەسەر خۆی توندە، چونکە ئیسلام پەیامی میانڕەوی و هاوسەنگی یە. ئەگەر خەڵك هەموو شەو بێدار بن ئەی کێ ببە ڕۆژ کار بکات و هەوڵبدات و زەوی ئاوەدان بکاتەوەو خێرو بێری ئاشکرا بکات، پێغەمبەر ﷺ بەسەر سامی فەرمووی: شەو ناخەوێت!؟ ئەوەندە کار بکەن کە لەتواناتاندا هەیە، سوێند بەخوا پەروەردگار هەرگیز بێتاقەت و ماندو نابیت، مەگەر ئێوە ماندو بن.

واتە: خوای گەورە کارو کردەوەیەکی خۆش دەوێت کە بەردەوام بێت با کەمیش بێت (مسلم)

---

دەبێت لە نوستندا مام ناوەند بین و زیادە ڕەوی تیا نەکەین پێغەمبەر ﷺ بەپیاوێکی فەرموو: زۆر نوستن مرۆڤ هەژار دەکات واتە(چاکەی کەم دەبێت) (متفق علیه)

# اللهُ مَعِي

قال سهْلُ بنُ عبد الله التُّسْتَرِيِّ: كنتُ وأنَا ابنُ ثلاثِ سنينَ أقُومُ اللَّيل، فأنظرُ إلَى صَلاة خَالِي محمَّد بنِ سوَارٍ. فقالَ لي يوماً: ألاَ تَذْكُرُ الَّذي خَلَقَكَ؟ فقلتُ: كيفَ أذْكُرُهُ؟ قالَ: قُلْ بقَلْبِكَ عندَ تقلُّبِكَ فِي فراشكَ ثلاثَ مرَّاتٍ مِنْ غيرِ أنْ تُحرِّكَ بِهِ لسانَكَ: اللهُ مَعِي، الله ناظرٌ إلَيَّ، اللهُ شَاهِدِي، اللهُ مُطَّلِعٌ علَيَّ.

فقُلتُ ذلكَ، ثُمَّ أعْلَمتُهُ، فقالَ: قُلْ ذلكَ كُلَّ ليلةٍ إحْدَى عشرةَ مرَّةً، فَقُلْتُهُ فوقَع فِي قَلْبِي حلاوتُهُ، فلَمَّا كانَ بعدَ سنةٍ، قالَ لِي خالِي: احفَظْ ما علَّمتُكَ ودُمْ عليهِ إلَى أن تَدْخُلَ القَبْرَ، فإنَّهُ يَنفَعُكَ فِي الدُّنْيَا والآخرةِ، فَلَمْ أزَلْ علَى ذَلكَ سنينَ، فوجَدْتُ لذلكَ حلاوةً فِي نَفسِي، ثُمَّ قالَ لِي خالِي يوماً: يا سَهْلُ؛ مَنْ كانَ اللهُ مَعَهُ، ونَاظِراً إليه، وشَاهِدَهُ، أيَعْصِيهِ؟ إيَّاكَ والمَعْصِيَةَ.. فتَعَلَّمَ سَهْلٌ مِنْ خالِهِ خَشْيَةَ اللهِ ومُرَاقبَتَهُ فِي السِّرِّ والعَلاَنِيَةِ.

---

إطفاءُ الأشياءِ المُشْتَعلة ـ مثلَ المَوقد والمدفأة ـ مِنْ آدابِ النَّومِ؛ قالَ ﷺ: «أطْفِئُوا المَصَابيحَ باللَّيلِ إذَا رَقَدتُم وأغْلِقُوا الأبوابَ...» [البخاري].

# خوای گەورە لەگەڵمدایە

(سەهل کوڕی عبدالله ی توستەری) دەڵێت: من کەسی سالان بوم شەو هەستاوم بۆ عیبادەت، سەیری نوێژی خاڵم(محمد کوری سوار) دەکرد، ڕۆژێک پیٚ ی وتم: ئایا یادی ئەو زاتە ناکەیت کە تۆی دروست کردووە؟ وتم: چۆن یادی بکەم؟ وتی: بەدڵت لەکاتی نوستن و ئەمدیو ئەو دیو کردنت سیٚ جار بڵیٚ: (خوام لەگەڵدایە، خوا دەمبینیٚ، خوا ئاگای لیٚمە، خوا چاودێریم دەکات منیش ئەوەم وت: پاشان ئاگادارم کردوە، وتی: هەموو شەوێک پانزە جار بیڵیٚ، منیش وتم: شیرینی کەوتە دڵمەوە، دوای ساڵێک خاڵم پیٚ ی وتم: ئەوەی فێرم کردیت لەبەری بکەو تا ئەو ڕۆژەی دەخرێیتە ناو گۆڕ بیڵی، لە دنیاو قیامەت سودی دەبێت بۆت، چەند ساڵ لەسەری بەردەوام بوم، هەمیشە هەستم بە چێژی ئەو وشانە دەکرد لە دەرونمدا، پاشان ڕۆژێک خاڵم پیٚ ی وتم: ئەی سەهل، هەرکەس خوا لەگەڵی بێت و بیبینیٚ و ئاگای لیٚ ی بیت و چاودێری بکات، ئایا سەرپێچی دەکات؟ وریابە توشی سەر پێچی و تاوان نەبیت، ئیتر سەهل لەخاڵیەوە فێری لەخوا ترسان و چاودێری خوا بوو لە ئاشکراو پەنهاندا.

---

کوژاندنەوەی شتی داگیرساو (وەک چراو ئاگرو زۆپا...) لە ئادابی نوستنە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (گڵۆپ و چراو فانۆس......بەشەودا ئەگەر نوستن بیان کوژێنەوەو دەرگاکان دابخەن) (البخاري)

# نَومٌ علَى النَّاقَةِ

سار النَّبيُّ ﷺ مع صحابته، وبعدَ مَسافة منَ السَّيرِ، خَطَبَ فيهِم النَّبيُّ ﷺ، وبَشَّرَهُم أنَّهُمْ سوفَ يَصِلونَ إلَى موضِعِ ماء بعدَ مسيرةِ يومٍ ولَيلة، فأسرعَ النَّاسُ فِي السَّيرِ وتفرَّقُوا، وسارَ النَّبيُّ ﷺ حتَّى انتصَفَ اللَّيلُ، وبِجَانبِه أبُو قَتَادةَ، ونَعِسَ النَّبيُّ ﷺ فمَالَ علَى راحلَته فأسنَدَهُ أبو قَتَادةَ، حتَّى اعتَدَلَ علَى راحلَته.

ثم سارَ النَّبيُّ ﷺ حتَّى انقَضَى مُعظَمُ اللَّيلِ، ومالَ علَى راحلَته فأسنَدَهُ أبو قَتَادة حتَّى اعتَدَلَ على راحلَته.

ثم سارَ حتَّى كَانَ آخرُ اللَّيلِ مالَ مَيْلَةً شَديدةً فكادَ يَسقُطُ مِنْ علَى راحلَته، فأسنَدَهُ أبو قتَادةَ وسَارَ بجانبِه، فرَفَعَ النَّبيُّ ﷺ رأسَهُ، وقالَ: «مَنْ هذَا؟». فقالَ: أبو قَتَادةَ.

فقالَ: «متَى كانَ مَسيرُكَ مِنِّي»؟. قلتُ: ما زالَ هذَا مَسيرِي منذُ اللَّيلة.

فقالَ ﷺ: «حَفِظَكَ اللهُ بمَا حَفِظْتَ بِهِ نبيَّهُ» (أيْ: بسبَبِ حفْظكَ لنَبيِّه) [أحمد].

---

قِراءةُ المُعَوِّذَتَينِ منْ آداب النَّومِ، فعَنْ عائشةَ رضي الله عنها قالَتْ: كانَ النَّبيُّ ﷺ إذَا أخذَ مَضْجَعَهُ نَفَثَ فِي يَديْهِ، وقرأَ بالمُعَوِّذَاتِ ومَسَحَ بِهِمَا جَسَدَهُ. [البخاري].

# نوستن لەسەر وشتر

پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان دەڕۆیشتن، دوایی ماوەیەک ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ دان و مژدەی پێدان کە شەو ڕۆژێکی تر دەگەنە شوێنێک ئاوی لێ یە، خەڵک پەلەیان کردو بلاوبونەوە، پێغەمبەر ﷺ تا نیوەی شەو ڕێگەی بڕی لەلایەوە(ابو قتادە) بوو، پێغەمبەرﷺ خەوی لێ کەوت و بەلادا کەوت (ئەبو قەتادە) گرتی تا ڕاست بووە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تا زۆربەی شەو تەواو بوو، ئەمجارەش بەلادا کەوت بەسەر پشتی وشترەکەیدا، (ئەبو قەتادە) ﷺ گرتی تا ڕاست بۆوە. پاشان ڕۆیشت تا کۆتای شەو، ئەمجارە زۆر بەتوندی خەریک بوو لەسەر وشترەکە بکەوێتە خوار، (ئەبو قەتادە) ﷺ گرتی و لەگەڵیدا ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوە فەرموی: ئەوە کی یە؟ وتی: ئەبو قەتادە. فەرموی: لەکەیەکەوە لەگەڵ مندا ڕێگە دەبڕی؟

وتم: ئەمشەو لەخزمەتت دا بووم بەم شێوەیە!!

پێغەمبەر ﷺفەرموی: (خوای گەورە بتپارێزێت هەروەک پێغەمبەرەکەیت پاراست) واتە: (بەهۆی ئەوەی پێغەمبەرت پاراست) (أحمد)

---

خوێندنی سورەتی (الاخلاص- الفلق - الناس) لە ئادابی نوستنە، عائشە ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەرﷺ کە دەچووە سەر جێگە فوی بە دەستیدا دەکردو سێ سورەتی (الاخلاص – الفلق- الناس)ی دەخوێند و دەستی بەسەر لاشەیدا دەهێنا) (البخاری)

# النَّومُ أمامَ النَّاسِ

تزوَّج أحَدُ الأُمراء بِنتَ أحَدِ المُلوك، وكانَتْ حَسَنَةَ الْخُلُقِ، شديدة الجمال.

وذات يَومٍ، جلَس الأميرُ يُسامِرُ زَوجتَهُ، حتَّى غلَبَهُ النُّعاسُ فنَامَ، فتَركَتْهُ زَوجتُهُ نائماً، وخَرَجتْ بِحَذرٍ حتَّى لا تُزعِجَهُ.

واستَيقَظَ الأَميرُ، فلَمْ يَجِدْ زَوجتَهُ بجانِبِه، فغَضِبَ غَضباً شَديداً، ثُمَّ ناداَها فحَضَرَتْ، فسَألَهَا: لِمَاذَا تَركتِنِي نائماً وانصَرَفْتِ؟

فقالَتْ لَهُ: إنَّهُ ممَّا علَّمَنِي أَبِي ألاَّ أجْلِسَ مَعَ النَّائِمينَ، ولا أَنامُ والنَّاسُ جالِسُونَ.

---

المُسلِمُ لا يَنامُ على سطحٍ ليسَ لهُ سُورٌ؛ فعَنْ جابرٍ: نَهَى رسولُ اللهِ ﷺ أنْ يَنامَ الرَّجلُ علَى سَطحٍ ليسَ بِمَحْجُورٍ عليهِ (ليسَ لَهُ سُورٌ). [البخارِي].

# نوستن لەبەر چاوی خەڵك

یەکێك لە ئەمیرەکان کچی پاشایەکی خواست، کە زۆر جوان و ڕەوشت بەرز بوو، ڕۆژێك ئەمیر گاڵتەی لەگەڵ هاوسەرەکەی دەکرد. تا خەو زۆری بۆ هێناو نوست، هاوسەرەکەی بەخەوتوی جێ ی هێشت و بە وریایی لەسەرخۆ ڕۆیشتە دەرەوە، ئەمیر بەخەبەر هات، هاوسەرەکەی لە لایەوە نەمابوو، زۆر بەتوندی توڕە بوو، بانگی کردو ئەویش هات، پرسیاری لی کرد: بۆچی منت بەخەوتوی بەجێ هێشت و ڕۆیشتی؟

پێ ی وت: ئەوەی باوکم فێری کردوم ئەوەیە کە لەگەڵ نوستودا دانەنیشم، وە لەشوێنێکدا نەخەوم کە خەڵك دانیشتون.

---

موسڵمان لەسەر بانێك کەشورای نەبێت ناخەویت: لە جابرەوە رضي الله عنه پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە کە مرۆڤ لەسەر بانێك بخەوێت کە پەرژین و شورای نەبێت. (البخاری)

# الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ

كَانَ النَّبيُّ ﷺ يُعَلِّمُ أصحابَهُ آدابَ النَّومِ، فأخبرَهُم أنَّ مَنْ رَأى رُؤْيَا صالحةً فِي منامه، فلَهُ أنْ يُحدِّثَ بِهَا غيرَهُ.

وذاتَ مرَّةٍ، نَامَ النَّبيُّ ﷺ فِي بَيتِ السَّيِّدَةِ أُمِّ حَرَامٍ بنتِ مِلْحَانَ. وبعدَ فَترةٍ، استيقظَ النَّبيُّ ﷺ وهُوَ يَبتَسِمُ، فسألَتْهُ أمُّ حَرَامٍ: ما يُضْحِكُكَ يا رسولَ اللهِ؟

قالَ ﷺ: «ناسٌ منْ أُمَّتِي عُرِضُوا عليَّ غُزاةً فِي سبيلِ اللهِ يَركَبونَ البَحْرَ مثلَ المُلوكِ علَى الأَسِرَّةِ».

تَمنَّتِ السَّيدةُ أمُّ حرامٍ أنْ تَكُونَ مِنْ هؤلاءِ المُجاهِدينَ فِي سبيلِ اللهِ. فقَالَتْ: يا رسولَ اللهِ، اُدْعُ اللهَ أنْ يَجعَلَنِي مِنْهُم. فأخبرَها الرَّسولُ ﷺ أنَّها منْهُم.

وفِي عهْدِ مُعاويةَ بنِ أبِي سُفيانَ ـ رضِيَ اللهُ عنهمَا ـ خرَجَتْ أمُّ حَرَامٍ معَ المُسلِمينَ الخارِجينَ لِلغَزْوِ، وماتَتْ وهِيَ تَغزُو فِي سبيلِ اللهِ. [البخارِي].

---

قالَ رسولُ اللهِ ﷺ: «إذَا رأى أحدُكم رُؤْيَا يُحِبُّهَا، فإنَّمَا هيَ مِنَ اللهِ؛ فلْيَحْمَدِ اللهَ علَيهَا، ولْيُحَدِّثْ بِهَا» [البخارِي].

# خەوێکی باش

پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی فێری ئادابی نوستن دەکرد، هەواڵی پێدان کە هەرکەس خەوێکی باشی بینی دەتوانێت باسی بکات جارێک پێغەمبەر ﷺ لەماڵی(أم حرام بنت ملحان) نوست پاش ماوەیەک، پێغەمبەر ﷺ هەستاو دەم بەپێکەنین بوو، (أم حرام) پرسیاری کرد، ئەوە بەچی پێدەکەنیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کۆمەڵێک خەڵکم نشیاندرا لە ئومەتەکەم کە لە پێناو خوادا غەزایان دەکرد، دەچونە دەریاوە وەک پاشایەک کە سەر عەرشی پاشایەتی.

(أم حرام) ئاواتی خواست ئەو لەو تێکۆشەرانە بێت لەپێناوی خوادا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بکە من لەوان بم، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا کە ئەو لەوانە.

لەسەردەمی معاویە ی کوڕی ئەبوسفیان رضي الله عنه (أم حرام) لەگەڵ موسڵمانە تێکۆشەرەکاندا دەرچوو، لە ڕێگەی خوادا تێدەکۆشا تا وەفاتی کرد. (البخاری)

---

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ئەگەر یەکێکتان خەوێکی خۆشی بینی، ئەوە مژدەیە لەخواوە سوپاسی خوای لەسەر بکات و باسی بکاو بیگێڕێتەوە) (البخاری)

# قِصَصُ آدابِ النَّومِ

النَّومُ نعمةٌ عظيمةٌ، وآيَةٌ مِنْ آياتِ الله الَّتي تَدُلُّ علَى قُدْرَتِه سُبحانَهُ. قال تعالَى ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ [الروم:٢٣].

والنَّومُ راحَةٌ للبَدَنِ والعَقلِ، يجِدُ الإنسانُ فيه الرَّاحةَ ممَّا يُصيبُهُ مِنْ تَعَبٍ وإرهاقٍ، فهُو يَنامُ الوقتَ الَّذي يكفِي لِراحَةِ جِسْمِهِ، وتَجديدِ نَشاطه.

وقَدْ بيَّنَ لَنَا النَّبيُّ ﷺ كثيراً مِنَ الآدابِ الَّتي تَجعَلُ نَوْمَنَا هادئاً ومُرِيحاً، كمَا تَجْعَلُهُ طاعةً وعِبادةً لله عزَّ وجلَّ. ومِنْ هـٰذِهِ الآدابِ: الوُضُوءُ قبلَ النَّومِ، واستعمالُ السِّوَاكِ، والنَّومُ علَى الجانِبِ الأَيْمَنِ، والدُّعاءُ بالأَدْعيَةِ الوارِدَةِ قبلَ النَّومِ، وإذا تَعَرَّى المُسلِمُ فِي أثناءِ نَومِهِ باللَّيلِ أو تَقَلَّبَ، ذَكَرَ اللهَ وقامَ وصَلَّى ـ إنْ أمكَنَهُ ذلِكَ ـ ثُمَّ عاوَدَ نَومَهُ؛ لِيَتمكَّنَ مِنْ صلاةِ الفَجرِ. فإذَا مَا استَيقَظَ قامَ نَشيطاً إلَى العمَلِ والاجتهاد والسَّعْيِ فِي طَلَبِ الرِّزْقِ وتَعْميرِ الأَرضِ.

* * * * *

# چیرۆکەکانی ئادابی نوستن

نوستن بەخششێکی گەورەیە، بەڵگەو نیشانەیەکی خوایە کە نیشانەی دەسەڵاتی خوای باڵا دەستە، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئایەتەکانی خوا نوستنی ئێوەیە بەشەو ڕۆژیش کە داوای ڕۆزی و نیعمەتی خوا دەکەن و بە شتان دەدات، هەموو ئەمانە بەڵگەو نیشانەن بۆ گەل و هۆزێك کە حەق و ڕاستی ببیستن) الروم/ ٢٣

نوستن ئیسراحەتی لاشەو عەقلە، بەهۆی نوستنەوە مرۆڤ لەو هەموو نارەحەتی و ماندو بوونە ئیسراحەت دەکات، بۆیە ئەوەندەی بۆ حەوانەوەی لاشەی و گەڕانەوەی چالاکی پێویستی بێت دەخەوێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرێك لە ئادابەکانی نوستنی بۆ ڕون کردوینەوە تا خەوێکی ئارام و پڕ لە ئیسراحەتمان هەبێت، هەروەك کردویەتی بە عیبادەت و خواپەرستی.

لەو ئادابانە: دەستنوێژ گرتن پێش نوستن، بەکارهێنانی سیواك ودان پاککەرەوە، خەوتن لەسەر لای ڕاست، دوعای پێش نوستن بخوێنی، ئەگەر لەکاتی نوستن سەرپۆشەکەت لاچوو یان هەڵگەڕایەوە یادی خوا بکەیت و هەستیت و نوێژ بکات (ئەگەر توانی) وە بۆ نوێژی بەیانی هەستیّ، کە خەبەری بۆوەو هەستا بەچوست و چالاکی هەڵدەستیّ بۆ کارو تێکۆشان و هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ و ئاوەدان کردنەوەی زەوی.

# ئادابی
# جەژن وشادی

نوسنی : یاسر علی نور

وەرگێڕانی : عبدالصمد حسین غفور

# اللَّهْوُ الْمُبَاحُ

فِي أحَد الأعياد، كانتْ عِندَ السَّيِّدة عائشةَ ـ رضيَ اللهُ عنها ـ فتاتَان تُغنِّيان بأشعارٍ قِيلَتْ فِي حَربِ بُعَاثَ ـ وهِيَ مِنْ حُرُوبِ العَرَبِ في الجَاهِليَّة ـ، فدَخَلَ رسولُ اللهِ ﷺ، وجَلَسَ علَى فِراشِهِ، ولَمْ يَنظُرْ إلى الفتَاتَينِ.

وحِينَئذٍ، دخَلَ أبو بَكرٍ الصِّدِّيقُ رضي الله عنه ورَأى ابنَتَهُ عائشةَ تَستَمِعُ إلى غنَاء الفتَاتَينِ، فحَدَّثها بكلامٍ فِيه شِدَّةٌ، وأنْكَرَ ما تَفعَلُهُ بِقَولِه مِزْمارُ الشَّيطانِ عندَ رَسولِ اللهِ؟

فقامَ إلَيهِ رَسولُ الله ﷺ، وقالَ لَهُ: «دَعْهُما».

ولَمَّا هدَأَ أبو بَكرٍ رضي الله عنه أشَارَت السَّيِّدةُ عائشةُ إلَى الفتَاتَينِ، فخَرَجتَا وفِي هذَا العيد، كَانَ أهلُ الحَبَشةِ يَلعَبُونَ بِالتُّرُوسِ والحِرَابِ، فلَمَّا رَأى النَّبيُّ ﷺ رَغْبَةَ زَوجته عائشةَ فِي مُشاهَدَةِ ألعابِهِم، أوقَفَها ورَاءَهُ لِتُشاهِدَهُم حتَّى مَلَّتْ، فدَخَلَتْ بيتَهَا. [مسلم].

---

قالَ عُمَرُ رضي الله عنه: إنَّ رسولَ الله ﷺ نَهَى عَنْ صِيامِ هذَينِ اليَومَينِ؛ أمَّا يَومُ الفِطرِ ففطرُكُمْ مِنْ صَومِكُمْ، وأمَّا يَومُ الأضْحَى فكُلُوا مِنْ نُسُكِكُمْ. [أحمد].

# گاڵتەی ڕێگە پێدراو

لەیەکێ لەجەژنەکاندا، دوو کچ لای خاتوو عائشە‌رضي الله عنها گۆرانیان دەووت و بە هۆنراوەی جەنگی ی(بکات)، ئەمەش یەکێك بوو لەو جەنگانەی عەرەب لەنەفامیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژورەوەو لە جێگاکەی دانیشت و سەیری دوو کچەکەی نەکرد.

دواتر ئەبو بەکری صدیق‌رضي الله عنه هاتە ژورەوەو بینی کچەکەی (عائشە‌رضي الله عنها) گوێ لە گۆرانی ئەو دوو کچە گرتووە. بەتوڕەیی قسەی لەگەڵدا کرد، نکوڵی لەوە کرد ئەیان ووت، فەرموی جوزەلەی شەیتان لای پێغەمبەری خوا؟

پێغەمبەر ﷺ هەستاو فەرموی(وازیان لێ بێنە) ئینجا ئەبو بەکر رضي الله عنه هێواش بووەو. عائشە ئاماژەی کرد بۆ دوو کچەکە، هەردوکیان چونە دەرەوە، لەم جەژنەدا، خەڵکی حەبەشە یارییان بەلقات و خەنجەر ئەکرد، کاتێ پێغەمبەر ﷺ زانی عائشە حەز دەکات یاریەکەیان ببینێ، لەدوای خۆیەوە وەستانی بۆ ئەوە بیان بینێ. تاتەواو ماندو بوو سەیری کردن، ئینجا چونە ماڵەوە (مسلم)

---

عمر رضي الله عنه ووتی کە پێغەمبەر ﷺ نە هی کردووە لە بەڕۆژو بوون لەم دوو جەژنەدا، رۆژی جەژنی رەمەزان، جەژنی رۆژو شکاندنە جەژنی قوربانیش لە قوربانیەکانتان بخۆن (أحمد)

# الثَّوبُ الجَديدُ

فِي يومٍ مِنَ الأَيَّامِ، ذهَبَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه إلى السُّوقِ، وبينمَا كان يُشاهِدُ البَضائعَ، أعجَبَتْهُ جُبَّةٌ مِنَ الإِسْتَبْرَقِ (الحريرِ الرَّقيقِ)، فاشْتَراهَا.

وأخَذَ عُمَرُ الجُبَّةَ، وذهَبَ بِهَا إلى النَّبيِّ ﷺ، لِيُقَدِّمَهَا هَدِيَّةً لَهُ، وقالَ: تجَمَّلْ بِهَا للعيدِ والوُفُودِ.

ولكِنَّ النَّبيَّ ﷺ رفَضَ أنْ يأخُذَها، وقالَ لَهُ: «إِنَّمَا هذه لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ».

ومَرَّتِ الأَيَّامُ بعدَ ذلكَ، وأرسَلَ النَّبيُّ ﷺ إلَى عُمَرَ رضي الله عنه ثوباً مِنَ الدِّيْباجِ (الحريرِ السَّميكِ)، فتَعَجَّبَ عُمَرُ مِنْ ذلكَ، وأخَذَ الثَّوبَ وذهَبَ إلى النَّبيِّ ﷺ، وقالَ لَهُ: يا رسولَ الله! إنَّكَ قُلتَ: إنَّمَا هذه لِباسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لهُ، وأرسَلْتَ إليَّ بِهَذِه الجُبَّةِ.

فأخبَرَهُ النَّبيُّ ﷺ أنّه لَمْ يُرْسِلْها إليهِ لِيَلْبَسَها، وإنَّما لِيَبيعَها، ويَنتَفعَ بثَمَنِهَا، أو يُهْدِيْهَا لِزَوجَتِه. [البخاري].

---

مِنَ السُّنَّةِ أنْ يَلْبَسَ المُسلِمُ يومَ العيدِ أجمَلَ ما لَدَيهِ مِنَ الثِّيابِ؛ فقَدْ كَانَ ﷺ يَلبَسُ يومَ العيدِ بُرْدَةً حمراءَ. [الطبراني].

# پۆشاکی تازە

رۆژێ لە رۆژان، عمری کوری خطاب ﷺ چووە بازار سەیری کەل و پەلی ئەکرد، جبەیەک سەرنجی راکێشا کە لە (ئاوریشمی تەنک) دروست کرابوو کری.

عمر ﷺ جبەکەی هەڵگرت و رۆیشت تا بیبات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و پێشکەشی بکات وەکو دیاریەک، ووتی: لە کاتی جەژن و بۆ پێشوازی میوان و شاندەکان خۆتی پێ برازێنەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەری نەگرت، فەرموی پێی: ((ئەم پۆشاکە بۆ کەسێکە کە لە قیامەتدا بێبەشە))!!

چەند رۆژێک بەسەر ئەمەدا چوو، پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی نارد بۆ عمر ﷺ کە لە(ئاوریشمی ئەستور) بوو عمر سەری سورما لەمە، پۆشاکەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی ئەی نێراوی خوا: تۆ وتت ئەم پۆشاکە پۆشاکی کەسێکە بەشی نیە لە قیامەت؟! ، وە ئەم جبەیەت بۆ ناردوم.

هەواڵی دایە پێغەمبەری ﷺ ئەو بۆ ئەوەی نەناردوە لەبەری بکات، بەڵکو بۆ ئەوە بیفرۆشێ، سود لە نرخەکەی ببینێ، یان بە دیاری بیدات بە هاوسەری (البخاری)

---

لە سوننەتەکانە کە موسڵمان لە رۆژی جەژنا لەبەری بکا جوانترین جل لەوەی هەیەتی، وابوو پێغەمبەر ﷺ لەبەری ئەکر لەرۆژی جەژنا رۆبی سور (الطبرانی)

سوننەتە: لە جەژندا موسڵمان باشترین و جوانترین جل و بەرگی بپۆشێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) رۆژی جەژن عەبایەکی سوری لەبەردەکرد. (الطبراني)

# دَعْوةُ المُؤمـنِ

كانَتْ حَفْصَةُ بِنتُ سيرينَ تَمْنَعُ جَوارِيَهـا أنْ يَخْـرُجْنَ يـومَ العيد. وفي يومٍ من الأيَّامِ، حضَرَتِ امرأةٌ وعاشَتْ بينَ قبيلَتِهَـا. فذهبتْ حَفْصَةُ لِزيارَتِها، وأخبَرَتْهَا في حَديثِها أنَّ قومَهَا يَمنَعُونَ الجوارِيَ أنْ يَخـرُجْن يـومَ العِيـد. فلَمَّـا سَـمِعَتِ المَـرأةُ ذلِـكَ أخبَرَتْ حَفْصةَ أنَّ أُختَها قَدْ سألَتِ النَّبيَّ ﷺ قائلـةً: يـا رسـولَ اللهِ! علَى إحدَانَا بأسٌ إذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبابٌ ألاَّ تَخْرُجَ؟

فقالَ النَّبيُّ ﷺ: «لِتُلْبِسْهَا صاحِبَتُها مِنْ جِلْبابِها، فَلْيَشهَدْنَ الخَير ودَعْوةَ المُؤمِنينَ».

فلَمَّا سمعتْ حَفْصةُ ذلكَ، ذهبَتْ إلَى أُمِّ عَطيَّةَ، وسـألَتْهَا عنْ صِحَّةِ هـذَا الكـلامِ فأخبرَتْهـا أُمُّ عَطِيَّـةَ أنَّ الـنَّبيَّ ﷺ قـالَ: «لِيَخْرُجِ العَوَاتِقُ، وذَوَاتُ الخُدُورِ، والحُيَّضُ. ويَعتَزِلُ الحُيَّضُ الْمُصَلَّى، ولْيَشْهَدْنَ الخَيرَ ودَعْوةَ المُؤمِنينَ» [البخاري].

---

مِنْ صِيَغِ التَّكبيرِ في العِيدَينِ: اللهُ أكبَرُ اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ. لا إلـهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَرُ اللهُ أكبَرُ وللهِ الحَمْدُ.

# بانگهێشتی ئیماندار

حفصەی کچی سیرین قەدەغە ئەکرد کەنیزەکانی لە ڕۆژی جەژنا بچنە دەرەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئافرەتێک ئامادە بوو ماوەیەک لەناو هۆزەکەیدا ئەژیا.

حفصە چوو بۆ سەردانی، هەواڵی پێدا لە قسەکانیدا کە نەتەوەکە نایەڵن کەنیزەکان لە ڕۆژی جەژن بچنە دەرەوە. کاتێک ژنەکە ئەمەی بیست هەواڵی دا بە حفصە کە خوشکەکەی پرسیاری لەنێراوی خواﷺ کردوە. فەرمویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێک لە ئێمە سەرپۆشی نەبوو، هیچی تیایە بچێتە دەرەوە؟!

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((با خوشکەکەی سەرپۆشێکی بداتێ تا هەموویان ئامادەی ئەو خێرە ببن))

کاتێ حفصە ئەمەی بیست ڕۆیشت بۆ لای (أُم عطيه، پرسیاری ڕاست و دروستی ئەم قسیەی کرد؟ (أُم عطيه ووتی: نێراوی خوا فەرمویەتی: ((بە ئافرەتانی ئازادکراو و تازە پێگەیشتوو، هەروەها پێگەیشتووەکان بڵێنەدەر بەڵام ئەوانەی لە سوڕی مانگانەدان، لە شوێنی نوێژ و نوێژ دوربێ، تا ئەوانیش توشی ئەو خێر و بەرەکەتە ببن)) (البخاری)

---

شێوەی (الله أكبر) لە جەژندا: (الله أكبر الله أكبر الله أكبر لااله الا الله و الله أكبر الله أكبر ولله الحمد)

# الطَّعامُ قَبْلَ الصَّلاةِ

فِي لَيلة عيد الفطرِ، ذهَبَ رجلٌ اسمُه أبُو خَلْدةَ إلَى بيتِ أحَدِ العُلَماء؛ واسمُهُ: أبُو العَاليةِ. فلَمَّا طَرَقَ أبُو خَلْدةَ البابَ، فتَح لَهُ أبُو العَاليةِ، ورحَّب بِه، ثُمَّ جلَسا. وتَبادَلاَ أطْرافَ الحَديث. ثُمَّ طلَبَ أبُو العَاليةِ مِنْ أبي خَلْدةَ أنْ يَمُرَّ علَيه في الصَّباحِ وهُو ذاهِبٌ إلَى صَلاة العيد.

وفِي الصَّباحِ، مَرَّ أبُو خَلْدةَ على أبِي العَاليةِ، وهُوَ مُتَوجِّهٌ إلَى صَلاةِ العيدِ، فلَمَّا خرَجَ أبُو العَاليـةِ سـأَلَ أبـا خَلْـدةَ: هَـلْ أكَلتَ شَيئاً؟ فقالَ: نَعمْ.

فسَأَلَهُ أبُو العَاليةِ: هلِ اغتَسَلْتَ؟ قالَ: نَعمْ.

فسَأَلَهُ أبُو العَاليةِ: هَلْ أدَّيْتَ زَكاتَكَ؟ قالَ: نَعمْ.

فأخبَرَهُ أبُو العَاليةِ أنَّه قَدْ طَلَبَ مِنْهُ أنْ يَمُرَّ عليهِ، لِكَي يَطمَئِنَّ أنَّهُ قد فعَلَ هذهِ الأشياءَ. [ابن جرير الطبري].

---

مِنَ السُّنَّة الاغتِسَالُ والتَّطَيُّبُ قبلَ الذَّهابِ إلَى صلاةِ العيدِ، وكانَ عبدُ الله بْنُ عُمَرَ ـ رضيَ اللهُ عنهمَا ـ يغتَسِلُ يومَ الفِطْرِ، قَبْلَ أنْ يَغْدُوَ إلَى المُصَلَّى. [الموطأ].

# خواردن پێش نوێژ

لە شەوی جەژنی ڕەمەزاندا، پیاوێک بەناوی ئەبو خلدە چوو بۆ ماڵی یەکێک لە زاناکان کە ناوی (ئەبو عالیە) بوو، کاتێک لە دەرگای دا، ئەبو عالیە دەرگاکەی کردەوەو بەخێر هاتنی کرد،

دوای دانیشتن، گفتو گۆ کردن ئەبو عالیە داوای لی کرد کاتێ ئەچێ بۆ نوێژی بەیانی جەژن سەری لێبدات، بەیانی (ئەبو خلدە) سەری لە ئەبو عالیە دا، نیازی چون بۆ نوێژی هەبوو لە ماڵەوە هاتە دەرەوە پرسیاری لە ئەبو خلدە کرد:

ئایا هیچ شتێکت خواردووە؟ ووتی بەڵێ پرسیاری لێکرد ئەبو عالیە خۆت شۆردووە؟ ووتی بەڵێ

وتی: ئایا زەکاتت داوە؟ ووتی ئەبو عایە هەواڵی پێدا کە بۆیە داوای لێکرد وە کەسەری لێ بدات، بۆ ئەوەی دڵنیا بێ کە ئەم شتانەی کردوە: (ابن جریرالطبری)

---

سوننتە خۆ شۆردن و بۆن خۆش کردن پێش چون بۆ نوێژی جەژن، چونکە عبدالله ی کوری عمرﷺ خۆی ئەشۆرد لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش خواردن و چون بۆ نوێژ. (الموطأ)

# تَبَرُّعُ النِّسَاءِ

فِي أحَد أيَّامِ العيد، صَلَّى النَّبيُّ ﷺ بالنَّاسِ صَلاةَ العيـدِ، فَبَدَأَ بالصَّلاة قبل الْخُطْبَةِ، بِغَيرِ أذَانٍ ولا إقَامة.

فلَمَّا انتَهَى النَّبيُّ ﷺ مِنْ صَلاةِ العيدِ، وقَفَ مُتَوكِّئاً علَـى بلالٍ رضي الله عنه، فـأمَرَ بِتَقْـوى اللهِ، وحَـثَّ علَـى طاعَتِـهِ، ووَعَظَ النَّاس، وذَكَّرَهُم.

فلَمَّا انتَهَى مِنْ خُطبَتِهِ، ذهَبَ إلَى المَكانِ الَّذي تَتَجمَّعُ فِيه النِّساءُ، فوعَظَهُنَّ وذَكَّرَهُنَّ فقالَ: «تَصَدَّقْنَ، فإنَّ أكثَرَكُنَّ حَطَبُ النَّارِ».

فقامَتِ امرأةٌ، وسألَتِ النَّبيَّ ﷺ عنْ سبَبِ ذلكَ. فأخبَرَهَا النَّبيُّ ﷺ أنَّهُنَّ يُكثِرْنَ الشَّكْوَى ويَجْحَدْنَ إحسَانَ الزَّوْجِ.

وَبعدَ ذلِكَ، قَامَتِ النِّساءُ، يَتَصَدَّقْنَ مِنْ حُلِيِّهِنَّ، وَيَضَعْنَ فِي ثَوبِ بلالٍ رضي الله عنه مِنْ أقْرِطَتِهِنَّ (ما عُلِّقَ فِـي شَـحمَةِ الأُذُنِ)، وخواتِمِهِنَّ. [مسلم].

---

قالَ النَّبيُّ ﷺ عنْ فَضْلِ العِبَادةِ والطَّاعةِ فِي الأَيَّامِ العَشْـرةِ الأُولَـى مِـنْ ذِي الحِجَّة: «ما العَمَلُ فِي أيَّامٍ أفضَلُ مِنْهَا في هذَا العَشْرِ» [البخاري].

٨

# بەخشینی ئافرەتان

لەیەکێ لەڕۆژەکانی جەژندا، پێغەمبەر ﷺ نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، نوێژ کردن پێش ووتاردان، بێ بانگ و قامەت کاتی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژ بۆوە لای بیلال وەستاوو رضي الله عنه فەرمانی کرد بە خوا پەرستنی و سوور بوون لەسەر پەیڕەوی کردن و ئامۆژگاری خەڵکی کردو، بە ئاگای هێنانەوە، دوای لێ بونەوە لە ووتارەکەی، ڕۆیشت بۆ شوێنێک کە ژنی زۆری لێ بوو، ئامۆژگاری کردن و بە ئاگای هێنانەوە، فەرمووی: ((چاکە زۆر بکەن چونکە زۆربەتان سوتەمەنی ئاگرن)) ئینجا ئافرەتێک هەستاو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد هۆی ئەوە چی یە ((فەرموی: ئێوە زۆر سکاڵاو نکوڵی ئەکەن لەچاکە کردن لەگەڵ هاوسەرەکانتان))

لەدوای ئەوە ژنەکان هەستان، بەچاکە کردن بەو خشڵانەی پێیانەوە بوو، گوارە و مستیلەکانیان لە بەردەم بیلالداهەمویان حستە سەر بەرگێی بیلال رضي الله عنه لە بازن و گوارەی گوێ و مستیلە. (مسلم)

---

پێغەمبەر ﷺ لەبارەی گەورە خوا پەرستی: پەیرەوی لەم دە ڕۆژی مانگی ذی الحجةدا دەفەرموێت: ((هیچ کردەوەیەک چاکتر نی یە بە ئەندازەی گەورەی کردەوەی چاک ئەم دە ڕۆژە)) (البخاري)

# خِطْبةُ العيدِ

فِي يَومٍ مِن الأَيَّامِ، خرج أبُو سعيدٍ الخُدْرِيُّ رضي الله عنه معَ أميرِ المدينة مَرْوانَ بنِ الحَكَمِ لِصَلاة العيد، فلَمَّا أتَيَا المُصَلَّى، أرادَ مَرْوانُ أنْ يَصْعَدَ المِنبرَ لِيَخطُبَ خُطْبَةَ العيدِ قبلَ أنْ يُصَلِّيَ. فجذَبَهُ أبُو سَعيدٍ الخُدْرِيُّ مِنْ ثَوبِهِ. ولكِنَّ مَرْوانَ جذَبَ ثوبَهُ مِنْ يَدِ سَعيدٍ وصَعَدَ المِنبرَ، فخَطَبَ قبلَ الصَّلاة. فقالَ لَهُ سَعيدٌ: غيَّرْتُم واللهِ. وأخبَرَهُ أنَّ النَّبيَّ ﷺ كانَ يَخرُجُ يومَ الفطْرِ والأَضْحَى إلَى المُصَلَّى، فأوَّلُ شَيءٍ يَبدأُ بِهِ الصَّلاةُ، ثُمَّ يَقُومُ يُقابِلُ النَّاسَ، وهُمْ جُلُوسٌ فِي أماكِنِهم، فَيَعِظُهُم ويُوصِيْهِم ويأمُرُهُمْ.

فقالَ مَرْوانُ: أبا سَعيدٍ! قدْ ذهَبَ ما تَعْلَمُ.

فقالَ سَعيدٌ: ما أعلَمُ ـ واللهِ ـ خَيرٌ مِمَّا لا أعلَمُ.

فقالَ مَرْوانُ: إنَّ النَّاسَ لَمْ يكُونُوا يَجلِسُونَ لنَا بعدَ الصَّلاةِ، فجعَلْتُهَا قَبْلَ الصَّلاةِ. [البخاري].

---

كانَ النَّبيُّ ﷺ لا يَخرُجُ يومَ الفِطْرِ حتَّى يَطْعَمَ، ولاَ يَطْعَمُ يومَ الأَضحَى حتَّى يُصَلِّيَ. [الترمذي].

# ووتاری جەژن

ڕۆژی لە ڕۆژان ئەبو سعید خودری ﷺ لەگەڵ پشەوای مەدینە (مروانی کوڕی حەکەم) بۆ نوێژی جەژن ڕۆشتن، کاتی نوێژ خوێنان هاتن، مروان ویستی سەرکەوێتە سەر مینبر بۆ وتار دان ووتاری جەژن پیش ئەوەی نوێژ بکات (ئەبو سعید خودری) بەگەکەی ڕاکێشا بەڵام مروان بەرگەکەی لەدەستی سعید سەندەوە سەرکەوتە سەر مینبرەکە، ووتاری دا پێش نوێژ، سعید ووتی: واللّە گۆڕیتان: هەواڵی پێدا کە پێغەمبەرﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان بۆ نوێژ، یەکەم شت دەستی پێ کرد نوێژ بوو، ئینجا بەرەو خەڵك هەڵئەسا، ئەوان لە شوێنەکانی خۆیان دانیشتبوون، ئامۆژگاری و وەسیەتی بۆ کردن و فەرمانی پێدەکردن.

مروان ووتی: ئەبو سعید: ئەوی تۆ دەیزانی، ڕۆشت!!.

سعید ووتی: سوێند بە خوا ئەوەی من دەیزانم چاکترە لەوەی کە نایزانم، مەروان وتی: (خەڵك ئێستا دوای نوێژ دانانیشن بۆیە وتارەکەم پێش نوێژەکە خست) (البخاری)

---

پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی جەژنی رەمەزان عادەتی وابوو نە ئەچووە دەرەوە بۆ نوێژ هەتا خواردنی نەخواردایا، لە جەژنی قوربان تا نوێژی نەکردایە هیچی نەئەخوارد (الترمزی)

# عِيْدانِ في يَومٍ

كانَ عبدُ الله بنُ الزُّبَيرِ ـ رضيَ اللهُ عنهما ـ أميراً علَى مكَّةَ المكَرَّمة، وكانَ يومُ العيدِ مُوافقاً لِيَومِ الجُمُعة، فلَمْ يَخرُجْ مُبَكِّراً لِصَلاةِ العيد، وإنَّما انتَظَرَ حتَّى طَلَعَ النَّهارُ، فخَرَجَ وصَعَدَ المنبَرَ، فخَطَبَ وأطالَ، ثُمَّ صَلَّى ركعتَينِ اثنتَيْنِ، ولَمْ يُصَلِّ الجُمُعَةَ، فعابَ عليهِ بعضُ النَّاسِ.

وعَلِمَ عبدُ اللهِ بنُ عبَّاسٍ ـ رضيَ الله عنهُمَا ـ بِمَا حدَث، فقالَ: أصابَ الزُّبَيرُ السُّنَّةَ.

وعَلِمَ ابنُ الزُّبَيرِ بما قالَهُ ابنُ عبَّاسٍ، فقالَ: رأيتُ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه إذَا اجْتَمَعَ عِيدانِ صنَعَ مِثلَ هذَا. [ابن خزيمة].

---

إذا كانَ العِيدُ يومَ جُمُعةٍ، فلِلمُسلمينَ أنْ يُصَلُّوا إحداهُمَا، قالَ ﷺ: «قد اجتَمَعَ في يَومِكُم عِيْدانِ، فمَنْ شاءَ أجْزَأَهُ مِنَ الجُمُعةِ، وإنَّا مُجْمِعُونَ» [أبو داود].

# دووجەژن لە ڕۆژێکدا

لەسەردەمی عبداللّٰە ی کوڕی زوبیرﷺ کە پێشەوای ئیمانداران بوو لە مەکـەی پیرۆز، ڕۆژی جـەژن لەگـەڵ ڕۆژی هـەینی دابـوو، کـاتی زوو نەهاتـە دەرەوە بـۆ نوێژی جەژن، بەڵام چاوەڕێ ی کرد تـا ڕۆژ هـەڵات، هاتـە دەرەوەو چـووە سـەر مینبر، وتاری داو درێژەی کێشا، دوو ڕکات نوێژی کرد، وە نوێژی هەینی نەکرد، هەندێ موسڵمان ڕەخنەیان گرت، عبداللّٰە ی کـوڕی عبـاس ﷺ زانـی چـی بـووە فەرموی: (زبێر) پێکاویەتی و سوننەتی ئەنجامداوە!. ابـن زوبیریـش زانـی بـەوە کەوا ابن عباس فەرمویەتی، ووتی: عمری کوڕی خطابم بینیوەﷺ کە ئەگەر دوو جەژن لە ڕۆژێکدا بوایە هەروای دەکرد. (ابن خزیمە)

---

هەرکات جەژن کەوتـە ڕۆژی هـەینی: ئـەوا بـۆ موسـڵمان هەیـە کـەوا نوێـژی یەکێکیان بکات، پێغەمبەر فەرموی((ﷺ ئەگەر کۆ بووە وە دوو جەژن لە ڕۆژێکدا هەرکەس نوێژی جەژنەکە لە بری جومعەکەش، بـەڵام ئێمـە کۆدەبینـەوە)) (أبـو داود)

# وَقتُ الأُضْحيَةِ

فِي يومِ عيد الأَضحى، صلَّى النَّبيُّ ﷺ صلاةَ العيدِ، ثُمَّ خَطَب بعد الصَّلاة فبين أنَّ ذَبْحَ الأُضحيَةِ يكُونُ بعدَ الصَّلاة، فَمَنْ فعَل ذلكَ فقدْ أصَابَ السُّنَّةَ، وأمَّا مَنْ ذَبَحَ قبلَ الصَّلاةِ فلاَ أُضْحيَةَ لَهُ. فقالَ ﷺ: «منْ صلَّى صلاتنَا، ونَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أصابَ النُّسُكَ، ومنْ نَسَكَ قبل الصَّلاةِ فإنَّهُ قُبلَ الصَّلاةَ؛ ولاَ نُسكَ لَهُ».

فقامَ أبو بُرْدَةَ بنُ دِينارٍ رضي الله عنه، وأخبَرَ النَّبيَّ ﷺ أنَّه قَدْ ذبَحَ شاتَهُ قبلَ الصَّلاة؛ لأنَّهُ عَلِمَ أنَّ اليومَ يَومُ أكْلٍ وشُرْبٍ، ثُمَّ قالَ: وأحبَبْتُ أنْ تكُونَ شاتِي أوَّلَ شاةٍ تُذْبَحُ فِي بَيتِي، فذَبَحْتُ شَاتِي، وتَغَدَّيتُ قبلَ أنْ آتِيَ لِلصَّلاةِ. فأخبَرَهُ النَّبيُّ ﷺ أنَّها ليسَتْ أُضْحِيةً، وقالَ: «شاتُكَ شاةُ لَحمٍ».

فقالَ أبو بُرْدةَ: يا رسولَ الله! فإنَّ عِندَنَا عَنَاقاً (أُنْثَى وَلَدِ الْمَعْزِ)، أَحَبُّ إلَيَّ مِنْ شاتَينِ. أفتُجْزِئُ عَنِّي؟

قالَ: «نَعمْ. ولَنْ تُجْزِئَ عَنْ أحَدٍ بَعدَكَ» [البخاري].

---

قالَ ﷺ فِي خُطْبةِ عيدِ الأَضْحَى: «إنَّ أوَّلَ ما نَبْدأُ بِهِ مِنْ يومِنَا هَذَا أنْ نُصَلِّي، ثُمَّ نَرجِعُ فنَنْحَرُ، فَمَنْ فعَلَ فقَدْ أصابَ سُنَّتَنَا» [البخاري].

# کاتی قوربانی

لەرۆژی جەژنی قوربان، پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی کرد، پاشان ووتاری دا لەدوای نوێژ رونی کردەوە کە قوربانی دوای نوێژە هەرکەس ئەمەی کرد سوننەتەکەی پێکاوە، وە هەر کەسیش پێش نوێژ سەری بڕی ئەوا قوربانی نی یە، فەرموی ﷺ ((هەرکەس نوێژی ئیمەی کردو، قوربانی کرد، ئەوا قوربانی بەجێ هێناوە، هەرکەس پێش نوێژ ئەوا پێش سەڕی بڕی نوێژ کەوتووەو قوربانی نی یە))

ئەبو بوردە رضي الله عنه هەواڵی دا بەنێردراوی خوا ﷺ مەڕێکی پێش نوێژ سەربڕیوە، لەبەر ئەوەی وای زانیوە ئەو ڕۆژە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە.

پاشان ووتی: حەزم کردوە یەکەم سەربڕین بێ لە ماڵەکەمدا بۆیە مەڕەکەم سەر بڕیو لێم خواردو پاشان هاتم بۆ نوێژ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە قوربانی نی یە، فەرموی (هەر گۆشتێکە و تەواو)

ئەبو بردە فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: کارێکی مێ یەمان هەیە، لەدوو مەڕ زیاتر خۆشم دەوێ، ئایا پاداشتم هەیە؟ فەرموی: (بەڵێ، دروستە، بەڵام لە دوای تۆ بۆ هیچ کەس دروست نییە) (البخاری)

---

پێغەمبەر ﷺ لە ووتاری ڕۆژی جەژنی قوربان فەرموی ((یەکەم شت دەست پێ بکەین لەم ڕۆژەماندا نوێژە، پاشان دەگەڕێنەوە قوربانی دەکەین، و هەرکەس ئەمەی کرد ئەوا سوننەتەکەی پێکاوە)) البخاری

# نَوَاةٌ مِنْ ذَهَبٍ

عنْدَما هاجر عبدُ الرَّحمنِ بـنُ عَـوفٍ رضـي الله عنـه إلَـى المدينَة، عَرَض عليهِ إخوانُهُ مُساعَدات كثيرةً، لكنَّـهُ رفَـضَ أنْ يأخُذَ شيئاً منْهَا، وآثَرَ أنْ يَذهَب إلَى السُّوقِ، ويَعْمَـلَ لِيكسَـبَ مَا يُنفق منْهُ علَى نَفسه.

وذاتَ يَومٍ، قابَلَهُ النَّبيُّ ﷺ، ورأى علَيه أثَرَ صُـفْرَةٍ (وهُـوَ ما تعَلَّقَ بِهِ مِنْ أثَرِ الزَّعْفَرانِ وغَيرِهِ مِنْ طِيْبٍ).

ولَمْ يكُنِ النَّبيُّ ﷺ يَعلَمُ أنَّ عبدَ الـرَّحمنِ رضـي الله عنـه تزَوَّجَ، فسأَلَهُ: «ما هَذَا؟».

قالَ: يا رسولَ الله! إنِّي تزَوَّجتُ امرأةً على وَزنِ نَـوَاةٍ مِـنْ ذَهَبٍ (والنَّوَاةُ تقدَّرُ بأربَعة دراهِم. أي أنَّهُ دفَعَ مِثلَ هذَا المِقْدارِ مَهْراً لِزَوجَتِه).

فَدَعَا لَهُ النَّبيُّ ﷺ قائلاً: «بارَكَ اللهُ لكَ. أَوْلِمْ ولَـوْ بِشَـاةٍ» [مسلم]. والوَليمةُ: طَعامُ العُرْسِ.

---

كانَ النَّبيُّ ﷺ يَدْعُو لِمَنْ تزَوَّجَ بِقَولِه: «بارَكَ اللهُ لكَ، وبـارَكَ علَيـكَ، وجمَعَ بينكمَا في خَيرٍ» [أبو داودِ والترمذِي].

^

# نرخی ئاڵتون

کاتێ عبدالرحمن کوڕی عوفؓ کۆچی کرد بۆ مەدینە، براکـانی پارمەتیـەکی زۆریان خستە بەر دەمی، بەڵام پارمەتیەکانی ڕەت کردەوەو هیچی هەڵ نـەگرت، وە چو بۆ بازاڕ، بۆ کاسبی و بژێوی خۆی.

ڕۆژێ پێغەمبەر ﷺ بینی شێوەی زەرد هـەڵ گـەڕابوو (ئەمـەش پـاش مـاوەی زعفران و شتی تری بۆن خۆش بوو) پێغەمبەر ﷺ نـەیزانی کـە وا (عبـدالرحمن) ؓ ژنی هێناوە، پرسیاری لێ کرد ((ئەمە چی یە))؟

ووتی: ئەی نێراوی خوا:)من ژنم هێناوە لەسەر ئەنـدازەی چـوار درهـەم، یـانی ئەو برە پارەیەم داوە بەژنەکەم وەکو مارەیی)! پێغەمبەر ﷺ دوعای بـۆ کـردو فەرموی: (خوا لێت پیرۆز کات ئەگەر بە مەرێکیش بووە، خواردنی شایی ئـەنجام بدە) (مسلم) ولیمە: خواردنی زاوایە.

---

پێغەمبەرﷺ دوعای ئەکرد بۆ ئەوەی ژنی ئەهێنا ((خـوا لێـت موبـارک بکـات، ئـەویش لـەتۆ موبـارەک بـێ، خێـر لـەنێوانتانا کۆبێتـەوە لەسـەر خێـر و چـاکتر کۆبونەوە)) (ابو داود و الترمزی)

# هَدِيَّةُ الزِّفَافِ

تزَوَّج النَّبيُّ ﷺ زَينب بِنت جحْشٍ ـ رضـيَ اللهُ عنـها ـ ، فَأخبَرَتْ أُمُّ سُلَيمٍ أَنس بن مالكٍ ـ رضيَ اللهُ عنهما ـ أنَّهـا تُرِيـدُ أنْ تُرسل لرَسولِ الله ﷺ هَديَّةً.

فقالَ أنسٌ: افْعَلِي. فأحضَرَتْ أُمُّ سَلَمَةَ تَمْراً وسَمْناً ولَبَنـاً، وصَنَعَتْ طَعَاماً، ثُمَّ طَلَبَتْ مِنْ أَنَسٍ رضي الله عنه أنْ يَذهَبَ بِهِ إِلَى النَّبيِّ ﷺ.

فأخذَهُ أنسٌ وانطَلَقَ بِهِ إِلَى رسولِ اللهِ ﷺ. فقالَ لَـهُ الـنَّبيُّ ﷺ: «ضَعْهَا». ثُمَّ أمَرَهُ أنْ يَذهَبَ لِيَدْعُوَ صَحابتَهُ إِلَى الطَّعَامِ.

فَذَهَبَ أَنَسٌ رضي الله عنه ودَعَا النَّاسَ، ولَمَّا رَجَعَ وجَـدَ البيتَ قَد امتَلأَ بالمَدْعُوِّينَ. وجـاء رسـولُ اللهِ ﷺ فوَضَـعَ يَـدَهُ علَى الطَّعامِ ، وتَكَلَّمَ بِمَا شَاءَ، ثُمَّ تَقَدَّمَ الصَّحَابَةُ عَشْرةً عَشْـرةً لِيَـأكُلُوا منْـهُ، والرَّسُـولُ ﷺ يقـولُ لَهُـم: «اذكُـرُوا اسْـمَ اللهِ، ولْيَأكُلْ كُلُّ رَجُلٍ ممَّا يَلِيهِ»، حتَّى شَبِعُوا جميعاً. [البخارِي].

---

قالَ ﷺ: «شَـرُّ الطَّعـامِ طَعـامُ الوَلِيمـةِ، يُـدْعَى لَهَـا الأغنِيـاءُ، ويُتْـرَكُ الفُقَراءُ، ومَنْ تَرَكَ الدَّعوةَ فقَدْ عَصى اللهَ ورَسُولَهُ ﷺ» [البخاري].

# دیاری ژن هێنان

پێغەمبەرﷺ (زەینەبەی کچی جحشی) خواست دایکی ئەنەس کوڕی مالك ﵁ بە ئەنەسی وت کەئەیەوێ دیاریەك بنێرێ بۆ پێغەمبەری خواﷺ

ئەنەس ووتی: چاکە، (ام سلمه) خورما و ماست و خواردنێکی دروست کردو داوای لە ئەنەس کرد ﵁ کە بیبات بو پێغەمبەرﷺ ئەنەس هەڵی گرت و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرموی: (داینێ) پاشان فەرمانی کرد ڕۆیشت بۆ ئەوەی بانگی هاوەڵە بەرێزەکانی بکات بۆ خواردن ئەنس ﵁ بانگی خەڵکی کردو کاتێ گەڕایەوە سەیریماڵەوەی کرد، پڕ بووە لە میوان، و پێغەمبەر ﷺ هات و دەستی خستە سەر خواردنەکە، ئەوەی ویستی ووتی پاشان هاتنە پێشەوە هاوەڵەکان دەدە بۆ ئەوەی لێ ی بخۆن، پێغەمبەر ﷺ فەرموی پێیان ((ناوی خوا بهێنن، با هەر پیاوێ جەندی بۆ ئەخورێ بیخوات، هەرکەس لای خۆیەوە بخوات)) هەتا هەمویان تێر بوون.(البخاری)

---

پێغەمبەرﷺ فەرموی: خراپترین خواردن خواردنی شاییە، چونکە دەوڵەمەندەکان بانگ دەکرێن و هەژارەکان وەلا دەنرێن، هەرکەس نەچێت بۆ دەعوەت ئەوا خواو پێغەمبەرەکەی تورە کردووەﷺ (البخاری)

# اللّقاءُ الأوَّلِ

كانَ أبُو سعيدٍ رضي الله عنه عَبْداً مَمْلوكاً لأبِـي أُسَـيْدٍ رضي الله عنه.

وفِي يومٍ منَ الأيَّامِ، تزَوَّجَ أبُو سَعيدٍ، فحَضَرَ عبـدُ الله ابنُ مسعودٍ وأبُو ذَرٍّ وحُذَيفةُ، وغَيرُهُم مِنْ أصحابِ النَّبيِّ ﷺ لِيُهَنِّئُوه ويُشارِكُوه فَرْحَتَهُ.

وفِي أثناءِ ذلكَ، حضَرَ وقتُ الصَّلاةِ؛ فقَدَّمَ الصَّحابةُ - رضيَ اللهُ عنهُمْ - أبَا سَعيدٍ رضي الله عنه وهوَ مَمْلوكٌ، فَصَلَّى بِهِم.

فلمَّا انتهَتِ الصَّلاةُ، أوْصُوهُ ببعضِ الوَصايَا فقالُوا لَـهُ: إذا دَخَلْتَ علَى أهلِكَ فقُلْ اللَّهمَّ بارِكْ لِي فِي أهْلِي، وبارِكْ لأهْلِي فِيَّ، وارزُقْهُمْ مِنِّي، وارزُقْنِي مِنْهُمْ. ثُمَّ شأنَكَ وشَأْنَ أهْلِكَ.

---

قالَ ﷺ «إذا تزَوَّجَ أحَدُكُمُ امرأةً... فلْيَقُلْ اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ خيْرَهَا، وخيْرَ ما جُبِلَتْ عليهِ، وأعوذُ بكَ مِنْ شرِّهَا وشرِّ ما جَبَلْتَها عليهِ» [أبو داود].

# یەکەم بەیەك گەیشتن

ئەبو سەعید ﷺبەندەی ئەبو ئەسیدبوو ﷺ ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەبو سعید ژنـی هێنـا، عبـداللّه ی کـوڕی مسـعود و أبـو زەر وحزیفـە. چـەند هـاوەڵێکی بـەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ئامادە بوون بۆ بەشداری خۆشی و شـادی، ئـا لـەم کاتـەدا، کـاتی نوێژ بوو، هاوەڵە بەرێزەکان أبو سـعیدی خسـتە پیشـەوە لـە کاتێکـدا بەنـدەبوو نوێژی بۆ کردن، کاتێ نوێژەکە تەواو بوو چەند ئامۆژگاریەکیان کرد، وتیان: کـە چویتە لای هاوسەرەکەت بڵێ: (خوایـە ئـەم کەسـەم لێ موبـارەك بێخوایـە لـەم هاوسـەرە منـداڵم پـێ ببەخشـی، وە لـە منـیش بـۆ ئـەو) پاشـان بچـۆرە لای هاوسەرەکەت.

---

پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەر کات یەکێکتان ژنی هێنـا بـا بڵێـت: ((پـەروەردگار داوای خێر و چاکەت لێ دەکەم لەم هاوسەرە، وە پەنا دەگرم لـە خراپـەی وە لـە خووە خراپەکانی)) (ابو داود)

# غِنَاءُ الأنصارِ

فِي أحَد الأيَّامِ، عـادَتِ السَّـيِّدةُ عائِشـةُ ـ رضـيَ الله عنهَا ـ منْ حَفلِ زفافِ امرأةٍ إلَى رَجلٍ مِـنَ الأنصـارِ، فقـالَ لَهَا النَّبي ﷺ: (ما قُلْتُم يا عائشَةُ؟). فقالَتْ: سَـلَّمْنَا ودَعَونَا اللهَ بالبَرَكةِ، ثُمَّ انصرَفْنَا. [أبو الشيخ].

فأخبرَهَا الـنَّبيُّ ﷺ أنَّ الأنصـارَ قَـومٌ يُعْجِبـهُمُ اللَّهْـوَ، وقالَ لَهَا «فهَلْ بعثْتُمْ معَهَا جارِيةً تَضرِبُ بالدُّفِّ وتُغَنِّي»؟.

قالَتْ عائشةُ: تَقولُ ماذَا؟

قالَ ﷺ: «تقولُ:

أتينَـاكُمْ أتينَـاكُمْ ... فحيَّـانَا وحَيَّاكُـمْ
ولَوْلاَ الذَّهَـبُ الأحمَرُ ... ما حَلَّتْ بَوَادِيكُـم
ولولاَ الحِنْطَـةُ السَّمراءُ ... ما سَـمِنَتْ عـذَارِيكُمْ»

[فتحُ الباري].

---

رأى النَّبيُّ ﷺ نساءً وصِبْياناً عائدينَ مِـنْ حفـلِ عُرْسٍ، فـأثنَى علـيهِم قائلاً: «اللَّهمَّ أنتُم مِنْ أحَبِّ النَّاسِ إلَيَّ» [البخاري].

# گۆرانی ئەنصار

ڕۆژێک خاتو عائشه ﵂ گەڕایەوە لە ئاهەنگی گواستنەوەی ژنێـک بـۆ پیـاوێکی ئەنصـاری، پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: ((چـیتان ووت عائشـە؟)) ئـەویش ووتـی: سەلاّومان کرد وە دوعامان بۆ کرد بۆ بەرەکەت پاشان رویشتین (أبو الشیخ)

هەواڵی پێدا پێغەمبەرﷺ کەوا ئەنصـار گاڵتـەیان لا جوانـە وە فـەرموی پـیّ ی ((جاریەتان لەگەڵ نارد بۆ دەف لی دان و گۆرانی)) ووتی عائشه: چـی ئـەڵێ ی؟ یان جا چی بوتایە؟

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەیفەرموو:

أتيناكُم أتيناكُم فَحَيَّانا و حَيّاكُم
ولَولا الذَّهَبُ الأحمَرُ محلَّت بواديكُم
ولَولا الحنطَةُ السَّمراءُ ما سمنَتْ عذاريكُمْ

(فتح الباري)

---

پێغەمبـەر ﷺ بینـی کۆمـەڵێ ژن و منـاڵ دەگەڕانـەوە لـە ئاهـەنگ و شـایی، ستایشی کردن و فەرموی: ((خوایە ئەمانە چەند خەڵکێکی خۆشەویسـتن لـە لام)) (البخاري)

# قِصصُ آدابِ الأعيَادِ والأفرَاحِ

العِيدُ هَدِيَّةٌ مِن اللهِ عزَّ وجلَّ لعبَاده الطَّـائعينَ، وفَرْحـةٌ لَهُـمْ، تَتَكرَّرُ فِي العامِ مرَّتَينِ، بعدَمَا قَدَّمُوا منَ العِبادةِ الخالِصَةِ لِوَجْـهِ اللهِ عزَّ وجلَّ فِي صيامِ رمضان وحَجِّ البيتِ الحرامِ.

والمُسلمُ الطَّائعُ يَفرحُ فِي هذَينِ اليَومَين؛ لأَنَّهُ يَشـعُرُ بـأنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يُكافئهُ عَلَى ما تَقرَّب بِهِ مِنْ طاعَةٍ.

وفِي العيدِ، يَتَواصَلُ النَّاسُ، ويَتَوادُّونَ، ويَتَصافَحُونَ، وتَتَجدَّدُ العَلاقةُ الطَّيِّبَةُ بَينهمُ، وتَتَوطَّدُ أواصِرُها.

وفِي حَفْلات العُرْسِ والزِّفافِ ـ أيضـاً ـ فَرْحـةٌ؛ لأنَّهَـا تَعنِـي بِدايةَ بَيتٍ جَديدٍ، ونَشْأةَ أُسْرةٍ كَريمةٍ وكُلُّ مُسلِمٍ يَحْرِصُ علَـى أنْ تُبْنَى أُسْرَتُهُ علَى الإيمانِ مِنْ أوَّلِ يَومٍ.

والمُسلمونَ يُشارِكُونَ إخوانَهم فِي فَرحَتِهم، ويُقَدِّمُونَ لَهُمْ مَا تَيَسَّرَ مِـنَ الهِـدايَا والأمـوَالِ؛ لِيُسَـاهِمُوا فِـي تكْـوينِ هَـذَا البَيـتِ الجَديدِ

وهذَا الكتَابُ، قدَّمَ بعضَ القِصَصِ الَّتي نَتَعـرَّفُ مِـنْ خلالِهَـا علَى آدابِ الإسلامِ فِي الأعيادِ والأَفراحِ.

* * * * *

# چیرۆکەکانی ئادابی جەژنەکان

جەژن دیاریەکی خوای گەورە بۆ خوا پەرستان و مل کەچان و خۆشیە بۆیان، لەساڵێکدا دووجار دووبارە ئەبێتەوە دوای ئەوەی، کە خوا پەرستی و دڵسۆزی تەنها بۆ خوای گەورە پیشەکەش کردووە لە ڕۆژی ڕەمەزان و حەجی ماڵی خوا، موسڵمانی گوێڕایەڵ و دڵ خۆشە بەم دوو ڕۆژە، لەبەر ئەوە هەست ئەکات خوای گەورە پاداشتی ئەم خوا پەرستیە، خەڵک هاتوو چۆی یەکتر ئەکەن و تەوقەو خۆشەویستی تازە ئەکەنەوە لەپەیوەندی بەینی خۆیان، و لە ئاهەنگی ژن هێنانِ هەروەها خۆشیەو مانای دانایی ماڵێکی تازەیەو خێزانێکی بەرز دروست ئەبێ هەمو موسڵمانێ ئەبێ بناغەی خێزانی دابمەزرێنی لەسەر باوەڕ.

موسڵمانان بەشداری براکانیان ئەکەن لەهەمو خۆشیەکاندا، دیاری وماڵ و سامان پێشکەشیان دەکەن بۆ بەشداری کردن لە پێکەوە نانی ماڵێی تازەدا.

ئەم کتێبە چەند چیرۆکی پێشکەش کردوە تا بزانین لە ڕێگەیەوە لەسەر ئادابی موسڵمانانە لە جەژن و خۆشیەکاندا.

## پیرستی بابەتەکان

## لەم کتێبەدا:

لەگەڵ وەرگێرانە کوردیەکەشدا دەقە عەرەبییەکەش دانراوە بە مەبەستی سودمەند بوون و فێربوونی زمانی عەرەبی

1- ئاداب لەگەڵ خوا
2- ئاداب لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ
3- ئادابی خواردن و خواردنەوە
4- ئادابی گاڵتە و یاری
5- ئادابی ناو مزگەوت
6- ئادابی کارکردن
7- ئادابی ئامۆژگاری کردن
8- ئادابی سلاو کردن
9- ئادابی سەردان و میوانداری
10- ئادابی زانست و زانیاری
11- ئادابی یادی خوا
12- ئادابی دوعا کردن
13- ئادابی پاك و خاوێنی
14- ئادابی گفتوگۆ (قسە کردن)
15- ئادابی پۆشاك
16- ئادابی گەشت و ڕێگاوبان
17- ئادابی نوستن
18- ئادابی جەژن و شادی

پڕۆژەی (هیوا) بۆ چاپ و بلاوکردنەوە
ژمارە: 15